وەرگری خەڵاتی نۆبڵ. ئەدەبیات 1938

## پێرل س. بەک

ڕۆمان

# نامەیەك لە پەکینەوە



وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عەزیز گەردی





ناوی کتێب: نــامــەیــەك لــە پەکینــەوە

بابەت: رۆمــــان

نووسینی: پێــرل س. بــەك

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عــەزیز گــەردی

Letter from Peking

شوێـنی چــاپ : چاپخــانەی رۆژهــەڵات/هەولێر

نــۆرەی چــاپ چاپی یــەکەم ، هــەولێــر ، ٢٠١٣

نرخ: ( ٦٠٠٠ ) دینار

تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧٢) ی ساڵی ٢٠١٣ ی پــێ دراوە.

لە بڵاوکــراوەکانــی کتێبخانــەی ئــاوێــر

ژمــــارە (( ١٢٦ ))

رۆمـــــان

# نامەیەك لە پەکینەوە

پێرل س. بەک

وەرگێڕانی

عەزیز گەردی

# ژیاننامەی

# پێرل ستێستریکەر بەک

- پێرل ستێستریکەر بەک.
- لە ٢٦ی حوزەیرانی ١٨٩٢، لە هیلز بۆرۆ، لە ڕۆژئاوای ڤێرجینیا لە دایک بووە.
- هێشتا تەمەنی نەببوو بە ساڵێك، دایبابی مژدەدەری لەگەڵ خۆیان بردیانە چین.
- لە تەمەنی پازدە ساڵیدا، بۆ یەکەمین جار چووە قوتابخانەیەکی داخیلی لە شەنگهای.
- لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا، گەڕایەوە ئەمریکاو چووە کۆلێجی (ڕاندۆلف ماکۆن).
- گەڕایەوە چین و چەند ساڵیك لە باکووری وڵاتی چین ژیا.

- پاشان چووە (نان کینگ)و یەکەم جار لە زانکۆی (نان کینگ)و ئینجا لە زانکۆی (چونگ یانگ) ئەدەبی ئینگلیزی گوتەوە.
- یەکەم وتاری لە کانوونی دووەمی ١٩٢٣دا، لە (مانگنامەی ئەتلەنتیك) بلاوکردەوە.
- ساڵی ١٩٢٥، چووە ئەمریکاو بڕوانامەی ماستەری لە بابەتی (چین و ڕۆژئاوا) وەرگرت، لە هەمان کاتدا، خەلاتی (لۆرا مەسینجەر)ی لە مێژوو وەرگرت و هەر ئەو ساڵە لەسەر ئەو کەشتییەی پێی دەچووە ئەمریکا، چیرۆکێکی نووسی و پاشان کردی بە یەکەم ڕۆمانی خۆی بە ناوی (بای ڕۆژهەلات، بای ڕۆژئاوا)و ساڵی ١٩٣٠ بلاوی کردەوە.
- لە ساڵی ١٩٣١، ڕۆمانی (زەوی چاك)ی بلاوکردەوە. ئەم ڕۆمانە بۆ ماوەی بیست مانگ لە لیستی زۆرفرۆشیی کتێبی ئەمریکادا بوو. نووسەر خەلاتی (پۆلیتزەر)ی پێ وەرگرت کە بۆ باشترین ڕۆمانی نووسەری ئەمریکی تەرخان کرابوو.
- پایزی ١٩٣٢، ڕۆمانی (کوڕەکان)ی بلاوکردەوە کە تەواوکەری ڕۆمانی (زەوی چاك) بوو.
- ساڵی ١٩٣٣، ڕۆمانێکی هەرە بەناوبانگی چینی (شوی هو چوان)ی بە ناوی (هەموو مرۆڤ بران) بلاو کردەوە. هەر لەو ساڵەدا، زانکۆی (ییڵ) بڕوانامەی شانازیی (ماستەری ئەدەبی) پێبەخشی.
- ساڵی ١٩٣٤، ڕۆمانی (دایك)ی بلاوکردەوەو هەر ئەو ساڵە گەڕایەوە ئەمریکا بۆ ئەوەی لەوێ بژی.

• ساڵی ١٩٣٥، (خانوویەکی دابەشکراو)ی بڵاوکردەوە. ئەمە لەگەڵ (زەوی چاك)و (کوڕەکان) یەك سییانە (تریلۆجی) بوو. لە تشرینی دووەمی هەر ئەو ساڵەدا، خەڵاتی (هاویلز میدالٚ ڕۆبەرت گرانت)ی وەرگرت.

• ساڵی ١٩٣٦، (تاراوگە)و (فریشتەی جەنگاوەر)ی بڵاوکردەوە کە ژیاننامەی دایكو باوکی بوون. هەر لەو ساڵەدا، بە ئەندامی (پەیمانگەی نیشتیمانی ئەدەبو هونەر) هەڵبژاردرا.

• ساڵی ١٩٣٨، ئەکادیمیای سویدی خەڵاتی (نۆبل)ی لە (ئەدەب) پیٚبەخشی. لەو ساڵەدا، بۆ یەکەمین جار ئاوڕی لە ژیانی ئەمریکا دایەوە، لە ڕۆمانیٚکدا بە ناوی (ئەم دڵە سەربەرزە!). لە زانکۆی (ویٚست ڤیٚرچینیا)و زانکۆی (سانت لۆرنس) بڕوانامەی دکتۆرای شانازی لە ئەدەبدا پیٚدرا.

• ساڵی ١٩٣٩، ڕۆمانی (نیشتمانپەروەر)ی بڵاوکردەوە.

• ساڵی ١٩٤٠، دووەمین ڕۆمانی لە بارەی ژیانی ئەمریکا بڵاوکردەوە، بە ناوی (خودانەکانی تر).

• ساڵی ١٩٤٢، لە ژێر زەبری کاریگەریی قووڵی جەنگدا، گەڕایەوە بۆ دیمەنی ڕۆژهەڵاتی دوورو ڕۆمانی (تۆوی عەزیا)ی بڵاوکردەوە.

• ساڵی ١٩٤٣، ڕۆمانی (بەڵیٚن)ی بڵاوکردەوە.

• لە ماوەی ژیانی ئەدەبی خۆیدا، زۆر وتاری نووسیوەو گەڵێ گوتاری لە بۆنەی جیاجیادا داوە. هەمووی لە سێ بەرگدا چاپ کردووە: (لە بارەی ژنو پیٚوانەوە)، (یەکیەتی ئەمریکاو ئاسیا)، (ئەمریکا بۆ من چییە؟)

- سێ بەرگ کورتە چیرۆک‌و چوار کتێبی تایبەتی بۆ منداڵان نووسیوە.
- دامەزرێنەرو سەرۆکی (کۆمەڵەی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا) بوو.

# (١)

ئەمڕۆ بیستو پێنجی مانگی ئەیلوولی هەزارو نۆسەدو پەنجایە. لەناو دۆڵێکی چیاکانی (ڤێرمۆنت) داین. من لێرە لە دایك بوومو هەر لێرەیش دەوری منداڵیم بە سەر برد. هەر لێرەیش بە ناو دەریاکاندا گەشتم کردو چوومە وڵاتی خۆشەویستەکەمو وڵاتەکەم کرد بە نیشتیمانی خۆم، بەڵام کە ئاگری جەنگ هەڵگیرسا، هەر چەندە ئاشقی ئەو وڵاتە بووم، بە (بێگانە)یان دانامو دەریان کردم. گەڕامەوە ناو ئەم دۆڵەی خۆمان کە ئەوەتا ئێستا تێیدا دەژیم.

هەموو ڕۆژێ، بە ژێر پەرچی درەختی سوورو زێڕینو بە شەقامی شارۆچکەکەماندا، دەچوومە پێشوازیی پۆستەچی کە حەفتەی تەنیا سێ ڕۆژ دەهاتە ئەم ناوچە دوورەی چیاکانی (ڤێرمۆنت). لەو سێ ڕۆژەدا، سبەینان، زوو لە خەو هەڵدەستامو بە دڵەڕاوکێ چاوەڕێم دەکرد نامەیەکم لە یەکێ، لە (جیرالد)ەوە بۆ بێ.

ڕۆژهاتو ڕۆژ چوو، مانگ هاتو مانگ چوو، هیچ نامەی (جیرالد)م بۆ نەهات. تا ئەمڕۆ بەیانی، دیتم پۆستەچی بەرەو ڕووم هات، نامەیەکی بە دەستەوە بوو، ڕایدەهەژاند. نامەکەی دامێ و گوتی:

– چاوەڕێی ئەمەت دەکرد، وا نییە!

تا ئەو نەڕۆیشت، نامەکەم نەکردەوە. بە تەنیا لە باریکە ڕێیکەدا مامەوە، لەم لاو لەولا چڵو گەڵای دارو درەختم هاتبووەوە سەر سەر. هەموو بە گڕەی پایز سوور هەڵگەڕابوون.

کە خۆم بە تەنیا بینی، نامەکەم کردەوەو دەستم بە خوێندنەوەی کرد. تا زیاتر دەچوومە ناو نامەکە، زیاتر هەستم دەکرد مەراقی دڵم دادەکەوێ و ئەوەی چاوەڕێی دەکەم بۆم دێتە دی. سەرەرای ئەوەش هەستم دەکرد هیچ شتی وای تێدا نییە جێگەی سەرسوڕمان بێ بۆ من. من بە هیچ شتێکی (جیرالد)، هەر چییەکی هەبێ، سەرسام نابم، هەستم بە هیچ شتێکی بریندا نابێ، بە هیچ ڕەفتارێکی ئازار ناخۆم. خۆشم دەویست، ئێستایش خۆشم دەوێ و لەمەودوایش هەر لە خۆشەویستی بەردەوام دەبم.

لە خوێندنەوەی نامەکە بوومەوە. چەند جارێکی تر پێدا چوومەوەو خوێندمەوە. وشەو ڕستەکانم لەبەر خۆمەوە دووبارە دەکردەوە. پایزێکی کش‌وماتو بێدەنگ بوو! لە خشەی گەڵای دار زیاتر هیچ هەستو خوستو هیچ هەناسەی ژیانی تێدانەبوو. گەڵای دار لە لقی درەخت بەردەبووەوەو لە هەوادا دەبریسکایەوە. لەم بێدەنگییەدا، دەنگی (جیرالد)م دەهاتە بەر گوێ، وشە بە وشە نامەکەی دەگوتەوە:

((هاوسەری ئازیزم.......

بەر لەوەی بێمە سەر ئەو شتەی دەمەوێ باسی بکەم، با یەکەم جار ئاشکرا پێت بڵێم من تەنیا تۆم خۆش دەوێ، تۆم خۆش دەوێ‌و بەس! هەر چییەکی بکەم، لە بیرت بێ، من هەمیشە هەر تۆم خۆش دەوێ. ئەگەر هیچ نامەی تری منت بۆ نەهات، ئەوە من هەموو ڕۆژێ نامەیەکت لەسەر پەڕەی دڵی خۆم بۆ دەنووسم......))

(جیرالد) بەم وشانە نامەکەی دەست پێکردبوو. کە یەکەم جار خوێندمەوە، یەکسەر زانیم ئەمە چی بە دوادا دێ. لەگەڵ ئەوەشدا هەر خوێندمەوەو خوێندمەوە تا تەواوم کرد. ئینجا بەرەو ماڵ بوومەوە. دەنگی (جیرالد)م بە قسەکانی ناو نامەکە لە گوێدا دەزرنگایەوە. (رینی) چووبووە قوتابخانەو ماڵەوە چۆڵ بوو. من تەنیا بووم‌و ئەو تەنیاییەم زۆر پێ‌خۆش بوو.

ئێستا ئەوەتا لە ژوورەکەی خۆم، لەسەر مێز دانیشتووم بۆ ئەوەی بنووسم. نامەکەی (جیرالد)م لەناو سندووقی تایبەتی خۆمم داناوە. دەمەوێ لانی کەم، بۆ ماوەیەك لە بیر خۆمی ببەمەوە تا هەناوم فێنك دەبێتەوەو لێدانی دڵم دادەکەوێ کە ئێستا گوێم لێیە رنگ‌و هۆڕ لێ دەدا. کاتێ ئاوها لەسەر مێز دادەنیشم‌و هەست‌و نەستی خۆم بۆ کاغەزی بەردەمم هەڵدەڕێژم، زۆر هەست بە ئۆخژن‌و دڵفەڕاحی دەکەم چونکە کەس نییە هەستی دڵی خۆمی بۆ باس بکەم.

بەیانی ئەو ڕۆژەیش وەکوو بەیانی هەموو ڕۆژێکی تر گزنگی دا. ئەو سەردەمە زوو لە خەو هەڵدەستام‌و یەکسەر لەناو نوێن دەهاتمە دەرەوە. جوتیارەکانی دراوسێمان عادەتیان بوو، سەعات چواری بەیانی لە خەو هەڵدەستان‌و ئێوارەیش یەکسەر دوای ڕۆژئاوا دەخەوتن، ڕێك وەکوو هەموو جوتیارەکانی چین.

کە هەموو خەڵکەکە دەخەوتن، دونیا کش‌ومات‌و بێدەنگ دەبوو. (جیرالد) زۆر حەزی لەو کش‌و ماتییە دەکرد. ئیتر لە سالآنی هەوەڵی زەماوەندماندا، شەو درەنگ دەخەوتین. ئای ئەو کاتەی لە خانووە چینییە بچووکەکەمان بووین، شەوی چەند خۆش‌و شیرین بوو. دوای ئەوەی خەڵکەکە لە ئیش‌و کاری خۆیان دەبوونەوە، هەراو زەنای کووچەو کۆڵانەکان نەدەما. دونیا تاریك دادەهات، ئاوازی مۆسیقایەکی ناسکمان دەهاتە بەرگوێ ئەو بێدەنگییەی شەق دەکرد. گوێمان دەدایە دەنگی ناسکی کەمان، لەو دیو دیواری ماڵەوەمان، لە ماڵی جەنابی (هوا)ی هاوسێمانەوە دەهات. (هوا) بازرگانیی حەریر بوو، دوکانی لە نزیك ماڵی ئێمە بوو.

من‌و (جیرالد)، زۆر جار، لە ژێر دار سنۆبەرەکەی سەر کانی ماسی دادەنیشتین. تام‌و چێژمان لە خۆشی شەوی هاوین وەردەگرت. (رینی)ی تاقانەمان زوو دەخەوت، بەڵام لەو ساتانەدا لێی دەگەڕاین. لەلای ئێمە بمێنێتەوە. گوتم (رینی) تاقانەمان چونکە پێش ئەو، کچێکمان هەبوو بە جوانکیلەیی جوانەمەرگ بوو. ئەو ڕۆژەی پێ مرد، سبەینەکەی زۆر چوست‌و چالاك بوو. پێدەکەنی‌و گەمەی دەکرد. کەچی شەو جوانەمەرگ بوو. ئێستایش نەمزانی هۆی مردنی چی بوو. سووبوونەوەو خەفەتخواردنم بۆ مەرگی ئەو کچە بەشێك بوو لەو نرخەی دەبوایە بەرامبەر خۆشەیستیی (جیرالد)و چوونە چین، بیدەم.
ماوەیەکی زۆر پێچوو بێ ئەوەی هیچ منداڵی ترمان ببێ. ئەو ماوەیەمان بە لاوە زۆر دوورو درێژ بوو. من خۆم تووشی خەفەتێکی کوشندە هاتبووم بەڵام ئەوەندە هەبوو کە غەم‌و کەسەری (جیرالد)م دەدی، نەختێ باری خەفەتم سووك دەبوو! (جیرالد) زۆری غەم

دەخوارد! وام هەست دەکرد (جیرالد) هەرگیزاو هەرگیز لەو کوڵو کۆڤان‌و کەسەرە ڕزگاری نابێ. تا چەند مانگێك، ئەوەی خەو بێ نەچووە چاوی. زۆر کەم نەبێ، ئەوەی زاد بێ نەچووە زاری. بەو بەژن‌و باڵا بەرزەوە وەکوو ئەسکەلتێکی لێ هاتبوو. گوێم لێ دەگرت باسی غەم‌و خەفەتی خۆی بۆ دەکردم، خۆم دەگوشی بۆ ئەوەی گڕی دەروون‌و فرمێسکی چاوم دەرنەچێ. ناو بە ناو دەیگوت:

((دەبوایە لە وڵاتی ئێوەدا بمێنمەوە. ئەگەر لە ئەمریکا باین، کچەکەمان لە دەست نەدەچوو. لە زۆر شت بێ بەشم کردی!))

منیش سەرم دەخستە سەر سینگی‌و وەڵامم دەدایەوە:

((تۆ بچیتە هەر شوێنێ، من لەگەڵتام. بە هەر چەندە لەسەرم بوەستێ، قەت بە لامەوە هیچ نییە.))

بە حەپەساوی سەیری دەکردم‌و دەیگوت:

((جیاوازیی بەینی ژنی ئەمریکی‌و ژنی چینی ئەمەیە. تۆ هاوسەریت زیاتر لەوەی کە دایك بیت!))

وەڵامم دەدایەوە:

((کاتێ لەگەڵ تۆ دابم، بە هەموو مانای وشەوە هاوسەرم! جگە لەوەیش، تۆ هەرگیز پێت خۆش نەبوو لە ئەمریکا بمێنیتەوە.))

بەڵێ، (جیرالد) ژیانی ئێرەی بە لاوە خۆش نەبوو. ئەوسا ئەمەم دەزانی‌و ئێستایش دەیزانم.

ئەگەر چی لەو ماوەی ژیانمدا  کە لە پەکین بووم، لە هەندێ چرکەساتی ڕاگوزەردا، کە بیرم لە چیا پاك‌و فێنکەکانی (ڤێرمۆنت) دەکردەوە، غەریبی وڵاتی خۆمانم دەکرد، بەڵام بە ڕاستی لەوێ شادو بەختەوەر بووم. پەکین لە چاو شاران وەکوو گەوهەرێکی شەوچرا وایە!

شکۆمەندو بە تەنتەنەیە. ڕۆژگار بە تەنتەنە تری کردووەو مێژوویش شکۆیەکی سەنگینی بە سەردا کێشاوە. خەڵکەکەی شادو ڕووخۆش‌و ڕۆح سووک‌و زۆر بە وێڵن. لەوێ، جوانیم لە هەموو شتێکی دەوروبەری خۆمدا دەدی‌و ژیانێکی ئارام‌و خۆشم هەبوو. وامدەزانی تا دەمرم هەر لەو خۆشییەدا دەبم‌و لەگەڵ (جیرالد)دا ژیانێکی دوورو درێژ بە یەکەوە دەژین. ئاخر من‌و ئەو، هەردووکمان، بە ڕەچەڵەك بەرەبابمان تەمەن درێژ بوون. بۆیە وامدەزانی تا تەواو دەکەوینە ناو ساڵانەوە، بە یەکەوە دەژین‌و ئەوسا لە تەك یەکتر دەنێژرێین. کەچی سەیر کەن ئێستا من لە کوێم؟ ئەوەتام ئێستا لەگەڵ (ڕینی) کوڕمان، کە تەمەنی حەڤدە ساڵە، لە گوندی (ڤیرمۆنت برالی)، لە خانوویەکی دەشتەکی لاچەپدا، دەژیم.

پاش ئەوەی نامەکەی (جیرالد)م خوێندەوەو دیتم چی تێدا هاتووە، تازە قەت باوەڕ ناکەم جارێکی تر چاوم بە (جیرالد) بکەوێتەوە.

هەروەکوو پێشتر گوتم. سەر لە بەیانی ئەمڕۆ وەکوو هەموو ڕۆژەکانی دی وا بوو. سەعات شەشی بەیانی، لە خەو هەستام. چوار مانگامان هەیە. یارمەتی (مات)م دا مانگاکانی دۆشی‌و مەنجەڵە شیرەکەم لەسەر پلیکانەی کۆگا دانا بۆ ئەوەی کاروانی شیر بێ بیبا. دۆلکەیەکی گەورەی پڕ شیرم بۆ (ڕینی) گێڕایەوە. چوومە مدبەق بۆ ئەوەی ناشتای بۆ ئامادە بکەم. (ڕینی) لاری نەبوو شەو تا درەنگ یارمەتیمان بداو ئیشمان لەگەڵدا بکا، بەڵام بەیانی زوو لە خەو هەڵنەدەستا.... نا.... ڕێك وەکوو (جیرالد)ی باوکی ئەمەی بە لاوە زۆر زۆر سەخت‌و ناخۆش بوو. بەڵام من، کە بە تەنیا مامەوە، گەڕامەوە سەر دۆخی ڕۆژگاری منداڵیم.

من، لێرە، لەسەر ئەم خاکە لە دایك بووم. ئەوسا ئێرە موڵکی باپیرەم بوو. دوای باپیرەم بوو بە هی باوکمو دوای ئەویش بوو بە موڵکی من.

باوکم، هەر بە هیوا بوو ببێ بە داهێنەرێکی بچووكو زەوییەکەی بکا بە کێڵگەی تاقیکردنەوە! هەروەکوو هەمیشە دەیگوت، هەوڵی دەدا شتی تازە لەسەر زەوییەکەی دابمەزرێنێ خەڵك پێشتر نەیاندیبێ. ڕاستییەکەی، لە دوو سێ شت سەرکەوتنی بە دەست هێنا. بۆ نموونە وەکوو هێنانی ئامێری شۆردن....

بۆ خواردن سوودمان لە بەروبوومی زەوییەکەمان وەردەگرتو بۆ پارەیش پشتمان بە میراتی باپیرەم دەبەست کە بۆ باوکمی جێهێشتبوو. باپیرەم جوتیار نەبوو، پارێزەرێکی بەناوبانگ بوو. دوای شووکردنم بە (جیرالد)، باوکم کۆچی دوایی کردو تەنیا دایکم لەسەر زەوییەکەمان مایەوە. هێشتا (رینی)م نەببوو، دایکیشم مردو زەوییەکەی بۆ من مایەوە. منیش ئەو ماوەی چووبوومە پەکین، سەرپەرشتی زەوییەکەم بە (مات گرین) سپارد. (مات) ڕۆژانە دەهات سەرپەرشتی زەوییەکەی دەکرد. کاتێ بە ناچاری ئەم زەوییەمان جێهێشتو ڕۆیشتین، دەمزانی ڕۆژێ دێو دێمەوە ئێرە، چونکە لەوە زیاتر هیچ جێگام نەبوو.

(ڕینی)، کە دەنووست، پەنچەرەکانی ژووری خۆی دانەدەخست. بایەکی ساردی لێ دەهاتە ژوورەوە. ئەو سبەینەیە، کە هاتە خوارەوە، لەبەر بای سارد، هەردوو گۆنای سوور هەڵگەڕابوون. داهاتەوە سەرم ماچێکی لە گۆنام کردو گوتی:

– بەیانی باش، دایکە.

وەڵامم دایەوە:

- بەیانی باش، کوڕم.

باوکی وای حەز دەکردو سووریش بوو هەر جارەی تووشی یەکتر بووین، یان لە یەکتر دابڕاین، چاك‌و چۆنی‌و خوداحافیزیی لە یەك بکەین.

(جیرالد) شیرەتی لە کوڕەکەی دەکرد:

- کە لای دایبابت ڕۆیشتی، دەبێ خواحافیزییان لێ بکەی. دەبێ پێیان بڵێی دەچیتە کوێ. کە هاتیتەوەیش، دەبێ یەکسەر ئاگاداریان بکەیتەوەو چاك‌و چۆنییان لەگەڵ بکەی. ئەمە پێش ئەوەی ئەرکی باوك بێ، ئەرکی سەرشانی منداڵە.

ئینجا (ڕینی) پێیگوتم:

- دایکە، ئەمڕۆ چۆنی؟

وەڵامم دایەوە:

- باشم، سوپاست دەکەم.

- خەوێکی باشت کرد؟

وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ، سوپاس.

(ڕینی) بزەیەکی بۆ کردم‌و منیش بە خەندەیەك وەڵامم دایەوە. بە دەم گرژینەوەمان بۆ یەکتر، بە یەکەوە ناوی (جیرالد)مان هێنا: ئەو ناوی باوکی هێناو من ناوی هاوسەرەکەم!

(ڕینی) زۆر بە باوکی دەچوو. لە چاو تەمەنی خۆی زۆر باڵابەرز بوو. قژو چاوی ڕەش بوو. پێستەی وەکوو باپیرە چینییەکانی لووس‌و

ڕەنگ عاجی بوو. ڕوخسارێکی قۆزو چارەیەکی نازدارو سیمایەکی سەنگینی هەبوو.

پێمگوت:

– دانیشە، کوڕم! تێشتم بۆ ئامادە کردووی!

جەمی بەیانی شتێکی تایبەتی بوو بۆ (ڕینی). نانی لە شەکری سوورو ماستی چەور هەڵدەکێشا. بۆیە لە شەکری سووری هەڵدەکێشا چونکە (جیرالد) شەکری سپی لێ قەدەغە کردبووین. لە پەکین تەنیا شەکری بۆری چینیمان دەخوارد. بەش بە حاڵی ماستیش! ماست خواردنێکی ئەمریکییە. بۆ وا نەبێ؟ ئەی (ڕینی) ئەمریکیش نییە؟ خوێنی باپیرە گەورە چینییەکانی ناو دەماری، لە چارەکێك تێناپەڕێ. هەیکەلی لە هی چینی ناکا: شان پانو پۆڕ، دەستو قاچ گەورە! هیچ ناسکییەکی لەشی باوکی تێدا نییە.

ئینجا وەکوو ڕەوشتی هەمیشەیی خۆی، پێیگوتم:

– زەحمەت نەبێ سێ هێلکە....

لە خوای بە زیاد بێ مریشکم هەبوو. ئەگەرنا، بەو میراتە کەمەی بۆم مابووەوە، نەمدەتوانی هەموو داواکانی (ڕینی) بۆ هێلکەو گۆشت بێنمە دی کە هیچ سنووری نەبوو. حەزم دەکرد گۆشتی بەرازیش دەرخواردی کوڕەکەم بدەم کە گۆشتێکی بە نرخو خواردنێکی مرۆی بە تەنتەنە بوو. بەڵام ئۆی!! چەند زوو لەباتی ئەوەی بڵێم: (کوڕەکەمان)، گوتم: (کوڕەکەم)! نابێ لە بیرم بچی! (ڕینی) چۆن کوڕی منە، ئاوها کوڕی (جیرالد)یشە. ئایا ئەمە ئیشی نامەکەیە ئاوها زوو کاری لێ کردم؟ ئایا ئەو نامەیە تا چ ڕادەیەك کاری لەسەر ژیانم دەبێ؟!

ژووری نان خواردن بە سەر ڕێگایدا دەڕوانی. (رینی) لەسەر کورسی خۆی، لەسەر مێزی نان خواردن، بە ئاسانی ترومبێلی قوتابخانەی لێ دیار بوو کە دەهات. یەکەم جار، ئەو کورسییەمان بە چۆڵی جێهێشتبوو. هەر بە تەما بووین ڕۆژێ بێو هاوسەری منو باوکی ئەو بێتەوەو لە سەریا دابنیشێ. چونکە کاتێ، لە شەنگهای، (جیرالد)مان جێهێشت، پێیگوتین بە ماوەی سێ مانگی تر منیش دەگەمە لاتان. ئەو ماوەیە تێپەڕیو هیچ دەنگو باسی نەبوو. چەند حەفتەیەکی پێ دەچوو ئینجا نامەیەکی بۆ دەناردین. کە ئیش وای لێهات، (رینی) پێشنیاری کرد، تا باوکی دێتەوە ئەو خۆی لەسەر کورسییەکەی دابنیشێ بۆ ئەوەی چاوی لە هاتوچۆی ڕێگا بێ. من نە بە (ئێ)و نە بە (نا)، وەڵامم نەدایەوە. وەکوو ئەوەی لە دڵی خۆمدا هەستم کردبێ ئەم نامەیە وا بەڕێوەیە بۆ من.

(رینی) هاواری کرد:

– ئەوەتا ترومبێلەکە هات. هێلکەو گۆشتو سێ لەتە نانو هەندێ کەرەی خواردبوو. کووپە شیری دووەمی خواردەوە. هەستایەوە، شەپقەی لە سەری ناو گوتی:

– خوداحافیز، دایکە!

وەڵامم دایەوە:

– ئەمانەتی خوای بی، کوڕم!

(جیرالد) قەت لێ نەدەگەڕا وەکوو خەڵك ناوم بچووك بکەنەوە. لەم بارەیەوە زۆر توند بوو. تەنانەت کاتێ (رینی)، لە شەنگهای، لە برادەرە ئەمریکییەکانی فێری وشەی (موم)و (ماما) بوو، (جیرالد) بە خەفەتەوە پێیگوت:

- کوڕم، وشەی (دایك) وشەیەکی جوانە، تکایە ڕەونەقی مەبە!

(جیرالد) ڕەوشتی وا بوو کە بیویستایە کوڕەکەی فێری شتێ بکا، بە چینی قسەی دەکرد. (رینی) لەوساوە هەرگیز لە قسەی باوکی دەرنەدەچوو.

کاتێ بە تەنیا لە ماڵەوە مامەوەو دەوروبەرم کش‌ومات بوو، دەستم بە ئیشی ڕۆژانەی ماڵەوە کرد. هیربارم شووشت، چوومە سەرەوە بۆ ئەوەی ژوورەکانی نووستن ڕێك بخەم. ژوورەکەی من کاتی خۆی ژووری دایبابم بوو. کەوتبووە لای پێشەوەی ماڵەوە. پێنج پەنجەرەی تێدابوو. مرۆڤ لەو پەنجەرانەدا، دیمەنی جوانی ڕاکشاوی بەردەمی خۆی دەدی. دیمەنەکە ڕۆژ بە ڕۆژو بگرە سەعات بە سەعات دەگۆڕا.

ئەمڕۆ بەیانی، کە سەعات شەش بە ئاگا هاتم، مانگم دی بە ڕوخساری خڕو گەورەی خۆیەوە کەوتبووە پشت درەختەکانی قەدپاڵی چیا بەرزەکان‌و تریفەی بە بەینی درەختەکاندا دەهات‌و سێبەری دار سەندەلی بەرز بە سەر کەوری بۆری ژێر دارەکاندا دەکشا.

دیواری داخراوی پەکین ئارامی بە دڵم دەبەخشی‌و ئۆخەم لە خۆم دەکرد، بەڵام ئەم دیمەنە لادێییە جوانەی لە بەردەمم ڕاکشاوە لەویش جوانترە. من کە (جیرالد)م لە تەك نەبێ نیشتمانی خۆمم بەلاوە لە هەموو شوێنێ خۆشترە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ (جیرالد)دا بم، هەموو شوێنێکم بەلاوە وەکوو یەك وایە. بچینە هەر وڵاتێ، لام شیرین‌و جوانە.

شانشینەکەم کەوتۆتە لای باشوور. ئەو ڕۆژەی ساماڵ بێ‌و ڕۆژ بە دەرەوە بێ، خۆم دەدەمە بەر بەڕۆچکەو چێژی لێ وەردەگرم.

نوێنەکەمم ڕێك خست. مێزەکەمو سۆبەو سندووقو کەلوپەلەکانی ناو ژوورەکەمم هەموو پاك کردەوە. لەبەر ئەوەی ئێرە هەوای پاکەو تۆزو خۆڵی کەمە، زۆر بە پاك کردنەوەی ناو عەردی ژوورەوە ماندوو نەدەبووم. جار جار لە دڵی خۆمدا تووشی سەرسامی دەهاتم چۆن ئاوا بە ئاسانی کاروباریماڵەوەم پێ ڕایی دەکرێ، کەچی لە خانووەکەی چینیماندا، پێنج خزمەتکارم پێدەویست، یان وای بۆ دەچووم ئەوەندەم پێ دەوێ، چونکە (جیرالد) وای پێدەگوتمو سوور بوو کە من پێویستم بەو ژمارە خزمەتکارە هەیە. نەیدەویست من بە دەستی خۆم ئیش بکەم تا دەستم نەپروێ. ڕاست دەکا، دەستەکانم ناسكو جوانن. ئەمە یەکەم شت بوو (جیرالد) پێیگوتم:

- بە ڕاستی دوو دەستی ناسكو جوانت هەیە.

دەستەکانم بڵند کردو لە چاوم نزیك کردەوە بۆ ئەوەی بە وردی تەماشایان بکەم.

- بە ڕاستیتە؟!

بۆ وەڵامی قسەکەی بە گێلی ئەم پرسیارەم کرد. نەخێر، گێلی نەبوو. بە ئەنقەس وامگوتو ویستم گوێم لێ بێ دووبارەی بکاتەوە.

- کچە ئەمریکی بە زۆری دەستیان جوان نییە.

ئینجا گوتی:

- بۆیە هەستم پێ کرد چونکە دایکی خۆم چینی بوو و دوو دەستی جوانی هەبوو.

لێمپرسی:

- ئایا هەموو چینییەکان دەستیان جوانە؟

- بەڵێ!

بە بیرم نایێ باسی دەستی هیچ ژنێکی تری کردبێ، یان ئاماژەی بۆ جوانی کردبێ. ئەوەندە ساڵەی بە سەردا چووە، ئێستایش قسەکەیم هەر لەبیر ماوە. تۆ بڵێی بۆیە منی خۆش ویستبێ چونکە دەستم بە دەستی دایکی دەچوو؟ ئێستا لە کوێ وەڵامی ئەم پرسیارە پێ بکەوم؟!

تا ئەمڕۆ، ئەوە سێ مانگە هیچ نامەی (جیرالد)م بۆ نەهاتووە. هەستم کرد ئەم نامەیە لە (هونگ کۆنگ) ڕەوانە کراوە، نەك لە (شەنگهای). دەستخەتی سەر زەرفەکەم بەلاوە نائاشنا بوو. (جیرالد) یەکێ لەو شتانەی لە نامەکەدا نووسیبووی ئەمە بوو:

((نابێ نیگەران بی ئەگەر درەنگ درەنگ نامەت بۆ بنێرم. ناتوانم پێت بڵێم چەندی زەحمەت پێوە دەکێشمو ناتوانم بۆت باس بکەم بە چ شێوەیەك ئەم نامەیەم بۆ ڕەوانە کردی. کە وەڵامی نامەکەت بۆ نووسیم، بە ناونیشانی خۆم ڕەوانەی مەکە، بە ناونیشانی سەر زەرفی نامەکە ڕەوانەی بکە. ڕەنگە چەند مانگی پێ بچێ تا بتوانم نامەیەکی ترت بۆ بنووسم.))

کاتی خۆی، کە لە یەك دادەبڕاین، هەموو ڕۆژێ نامەمان بۆ یەکدی دەنووسی. پێش هەڵگیرسانی جەنگ لەگەڵ یابان، قەت وا ڕێك نەکەوتبوو لە یەك دابڕێین. کە جەنگ هەڵگیرساو وای بۆ چووین هەرێمەکانی باکوور دەکەونە بەر دەستی دوژمن، (جیرالد) داوای لێکردم، بەر لەوەی هێڵی شەمەندەفەری نێوان ئێمەو (هانکاو) ببڕێ، (رینی) لەگەڵ خۆم ببەمو بچمە (چنگ کنگ).

بە سەرمدا زریکاند:

– ئەی تۆش لەگەڵمان نایەی؟!

وەڵامی دایەوە گوتی:

- هەر دەرفەتم بۆ بڕەخسێ، منیش خۆم دەگەیەنمە لاتان. تا کۆلیج تەواو نەکەمو دەستم بەر نەبێ، ناتوانم بێم.

(جیرالد) سەرۆکی زانکۆ بوو. ئەرکو لێپرسینەوەی گەورەی لە ئەستۆدا بوو. لە دڵی خۆمدا دەمزانی هەڵوێستەکەی ڕاستە.

(ڕینی)م بە گەڵ خۆمداو بەرەو باکور ڕووم کردە (چنگ کنگ). ئەم سەفەرە بۆ ئێمە مانان ئاسان نەبوو. شەمەندەفەر پڕ پەنابەر بوو. ئەوەندەی پەنابەر تێدابوو چووبوونە سەر فارگۆنەکانیش. لە (هانکاو)، میوانخانە جمەی دەهات لە چەتەو داردەستەکانیان. بە هەوڵو تەقەلایەکی زۆرەوە بەرگەی بارودۆخی نەمانی ڕێزو ڕووەتی سپی پێستەکانم گرت. زۆر بە زەحمەت شوێنێکم بۆ خۆمو بۆ (ڕینی) پەیدا کرد. توانیم بە دەم چەورکردن شوێنێ لەسەر ئەو پاپۆڕە بچکۆڵەیە بە دەست بێنم کە بە ناو بەنداوەکانی ڕووباری (بانجسی)دا، بە گەشتێکی ترسناکو پڕ مەترسی دەچووە (چنگ کنگ).

بڕیار بوو (جیرالد) لێرە بێتە لامان. بە ڕاستیش، چەند مانگێک دوای گەشتەکەمان هاتە لامان. قوتابیو مامۆستاکانی کۆلێجەکەی هێنابوو. منو (ڕینی) خانوویەکی بچووکمان بۆ خۆمان لەناو ئەو زوورگانە پەیدا کردبوو کە بە سەر شاردا دەیانڕوانی.

- ئای شادبوونەوە بە دیداری ئازیزو خۆشەویستان چەند خۆشە!!

بەو باڵابەرزەوە لێمان بە ژوورێ کەوت. لەڕولاوازو ڕەنگ زەرد!! لەبەر لاوازیی دەتگوت لە جاران درێژتر بووە. لەگەڵ ئەوەشدا شادو بە کەیف بوو. پاش ئەوەی قوتابییەکانو دەستەی مامۆستایانی بە سەلامەتی گەیاندە جێ، ماوەیەکی کەم لەگەڵیاندا مایەوە. عەیانو خانەدانەکانی شار ڕێگایان دان لە هەندێ شوێنەواری کۆن دابمەزرێن.

بەم جۆرە (جیرالد)، ئەوانەی هێنابوونی جێگای بۆ کردنەوە. کە لە جێ‌و ڕێ‌و شوێن‌و خواردنیان دڵنیابوو، هاتە لای ئێمە.

ئەو ڕۆژە، کە باوەشم پێدا کرد، هەستم کرد هەموو گیانی دەلەرزێ. کە زانیم ئاوها شەکەت‌و ماندووە، پێمگوت:

– لێرە نەختێ بحەسێوە!

(جیرالد) چاوی بە خانووەکەدا گێڕا. من حەزم لە ژووری گەورەو فەراح دەکرد. کاتێ ئەو خانووە لادێییەم لە نزیك (چنگ کنگ) دۆزییەوەو بە کرێم گرت، بە خاوەنەکەم گوت بە مەرجێ لێت بە کرێ دەگرم ڕێگام بدەی دەستکاری هەندێ لە دیوارەکانی بکەم. سێ ژوور بکەم بە یەك ژووری گەورە.

– ئەی لە کوێ دەخەوی؟

خاوەنی خانووەکە ئەم پرسیارەی لێکردم. چاوی بچووکی لەناو قەپێلکدا سووڕاو سەری بادا. پیاوێکی تۆکمەو چوارشانە بوو. سەری تاشی بوو. کابرایەکی پیس بوو. خاوەن موڵك بوو، نەك لە جوتیار. بە کرێی موڵکەکانی دەژیا.

خۆم لە گێلی دا، وام پێشان دا هەر گوێم لە قسەکەی نەبووە، چونکە شتەکە، کەم‌و زۆر پەیوەندی بەوەوە نەبوو. من خۆم وام دانابوو ئەو کۆگایەی کەوتبووە ئەم لاو ئەولای دالانەکە بکەم بە دوو ژووری نووستن. وام دانابوو ژوورەکانی پێشەوە، ئەوانەی لای دەرگای حەوشە، بکەم بە مدبەق‌و کۆگا.

بەم جۆرە ئەو ژوورەی (جیرالد) بینی، ژوورێکی گەورەو فراوان بوو. ئێمە، ئەگەرچی کاتێ لە پەکین هاتین، هیچ کەل‌و پەلی ماڵەوەمان لەگەڵ خۆمان نەهێنا، بەڵام من دەمزانی چۆن هەرچی پێم دەوێ لە

دوکانی شارەکانی چین پەیدای بکەم. پیشەوەری چینی کارامەو دەست ڕەنگینن. حەز لە جوانی دەکەن‌و ڕێزی جوانیی دەگرن.

(جیرالد) لە سەر کورسییەکی نەرم‌و خۆش دانیشت‌و سەری بە پشتەوە داو گوتی:

– بە راستی لە خەڵق کردنی ماڵ لێهاتووی!

ئینجا چاوی نووقاندو گوتی:

– بەهەشتە!

لێرەدا، لە نووسین وەستام، چونکە بە دەستە خۆم نەبوو گریام.

× × ×

# (٢)

ئەمڕۆ یەکی مانگی شوباتە. چەند حەفتەیەکە لە (ڤیرمۆنت) زستانەو چیاکان بەرگی سپی بەفریان پۆشیوەو شەختەو بەستەڵەکی کپ باڵی بەسەر دۆڵی ناو چیاکاندا کێشاوە! ئەوە سێ ڕۆژە، بایەکی خۆشی دێ. ڕۆژ بە دەرەوەیە. بەفر لە قەد چیاو لە ڕێگاوبانان تواوەتەوە. بەڵام وابزانم ئەمە هەڵخەڵەتێنەیەو دووبارە زستان دێتەوە. لێرە بەفر تا ئادار درێژە دەکێشێ و بارستایی زیاد دەکا، بگرە هەندێ جار تا نیسان درێژ دەبێتەوە. ئیتر ناچار دەبین گەڵاڵە کردنی شەکر، کە لە وەرزی بەهار دەبێ، چەند ڕۆژێك دوا بخەین تا هەوای خۆش دەبێ بۆ ئەوەی شیلەکەی لەناو بۆڕی گەڵاڵەکردندا نەیبەستێ. دۆڵ لە مژو مۆراندا نقووم بووە. چیامان لێ دیار نییە. بگرە لە دەرگای حەوشە دوورتر نابینین. ئەو شوورەیە، باوکم لەسەر داوای دایکم دروستی کردبوو. دایکم تاقەتی سەیر کردنی ئەو مەودا دوورو ترسناکەی نەبوو

کە لە پەنجەرەی ماڵەوە دیار بوو. زنجیرە چیاکانی لێ دیاربوو، تا چاو بڕ دەکا درێژ دەبوونەوە.

دایکم هەموو جارێ بە باوکمی دەگوت: دەبێ دەرگایەکم هەبێ لە پشتەوەی بژیم، نەوەك نازانم لە کوێ دەژیم.

باوکم زۆر درەختی گەورەو بچووکی جۆراوجۆرو بە ڕەنگی جیاجیای بۆ دروستکردنی شوورەکە بە کار هێنا بوو. دایکم کەم جوان نەبوو. تا دوا ڕۆژی ژیانی، قەدو باڵایەکی زراڤو ڕێكو پێکی هەبوو. چەند ساڵێکی زۆر، دوای وەفاتی باوکم ژیا. ژنێکی توندو تۆڵ بوو. بێ تاقەتیی پێوە دیار نەبوو.

دایکم، کاتی خۆی سوور بوو لەسەر دروستکردنی دیوارو دەرگای حەوشە. لە ماڵی خۆی، لە پشت دیوارو دەرگای حەوشە دەژیا. کەم وا دەبوو بچێتە دەرەوە. کاتێ پێمگوت دەمەوێ شوو بە (جیرالد ماك لوید) بکەم، ڕای لەسەر نەبوو. چونکە هەر چەندە باوکمی خۆش دەویست، هیچ خۆشییەکی لە شووکردندا نەدی بوو، بۆیە پێی خۆش نەبوو من شوو بکەم.

کە پێمگوت بۆچی پێت خۆش نییە شووبکەم، پێیگوتم:

– شووکردن شتی ناپەسندی تێدایە بۆ ژنی ناسك، ئەگەرنا من هیچ تێبینم لەسەر (ماك) نییە.

لەحزەیەك بە خەیاڵمدا هات ئاخۆ پێی بڵێم (جیرالد) نیمچە چینییە، یان نا؟

دەشێ (جیرالد) وەکوو قەوقاسییەکی ڕەشەسمەر بکەوێتە بەر چاو، چونکە هەرچەندە چاوی مەیلەو بادەمی بوو، بەڵام چاوی لە ژێر برۆی

جواندا، گەورە بوو. جیرالد، وەکوو پیاوێك لە ناو پیاوانی دی، لە من جوانتر بوو، وەکوو ژنێك لەناو ژنانی دی.

من خۆم وردو ناسکم، چاوم بەلای کاڵیدا دەشکێتەوە تا شین. من هیچ ڕۆژێ هەستم نەکردووە ژنێکی جوان بم، (جیرالد)یش قەت وای پێنەگوتووم. قەت نەیگوتووە: پێستێکی ناسكو جوانت هەیە، دەمێکی بچووكو نازدارت هەیە. جاروبار کە دەیەویست بە وردی باسی لەشو لارم بکا، وای دەگوت بەڵام هەرگیز بە جوانی منیدا هەڵنەدەگوت. کەچی من خۆم لە ناخی دڵەوە زۆر بیرم لە جوانیی ئەو دەکردەوە. بۆم دەرکەوتبوو راستە کە باس دەکەن گوایە تێکەڵبوونی خوێن جۆرە سیحرێکی تێدایە، بەڵام نەمدەزانی ئەو سیحرە نهێنییەکەی لە چ دایە. کێ دەزانێ ئەم سیحرەمان لە چ لایەکەوە بۆ دێتە خوارێ. بۆی هەیە تێکەڵ بوونی دوو ڕەگەزەکە ئەم سیحرەی لێ بکەوێتەوە.

ڕاڕایم لە شاردنەوەی ڕەچەڵەکی (جیرالد) لە چرکەیەك زیاتری نەخایاند. دایکم تا بڵێی زیرەك بوو. بێئەوەی بە قسە باسی شتێ بکەین، بە مەزەندەو تەخمین دەیزانی. وام پیشان دا بەبێ ئەنقەس قسە دەکەم، گوتم:

– باوکی (جیرالد) لە (پەکین) دەژی. ئەمریکییەو ژنێکی چینی هێناوە. بۆیە (جیرالد) نیمچە چینییە.

دایکم لە سەرسامییان دەمی بەش بووەوە. سەیری کردمو دوو چاوی پڕ ترسی تێبڕیمو گوتی:

– ئاخ! ئیلیزابێت... قەت نەبێ!!؟

دایکم نەبێ، کەس بە ناوی (ئیلیزابێت) بانگی نەدەکردم. من بە ناوی داپیرەم کرابووم (ئیلیزابیت دوین). (جیرالد) پێی دەگوتم (حەووا). ئەو ناوەی پێخۆش بوو و بەو ناوە نازێکی پێدەدام. ئەو دووەی لێ دەرچێ، ئەوانی دی بە هەر ناوێك حەزیان بکردایە، بانگیان دەکردم.

کە بەڵێنی زەماوەندمان دا، (جیرالد) پێیگوتم:

– حەووا، تۆ یەکەمین خۆشەویستی منی.

بە ناز وەڵامم دایەوە:

– چۆنە منیش بە تۆ بڵێم: ئادەم!؟

سەرنجێکی تێکەڵ لە گومانو ڕازی بوونی لێدامو گوتی:

– باوەڕ ناکەم گاور ڕازی بن ئەم ناوە لە چینییان بنێن.

خێرا بە توندی وەڵامم دایەوە:

– تۆ هەر پێدادەگری کە چینیت، کەچی نیوەیشت چینی نییە. (جیرالد)، تکات لێ دەکەم کاتێ دەچیتە لای دایکم، نیوە ئەمریکییەکەت بە!

لێرەدا، بە هەموو مانایەکی وشە وەکو چینییەکی لێهات. کەمۆو بە وێڵو فێڵباز! بەڵام ڕۆح سووكو خۆش مەشرەب! لەگەڵ ئەوەشدا نەمزانی ڕەفتاری لەگەڵ دایکم چۆنە. داخم دەخوارد کە باوکم نەماوە. ئەگەر بمابایە بە گەرمی پێشوازیی (جیرالد)ی دەکرد. جگە لەوەیش شادمان دەبوو کە جیرالد نیوەی چینییە. باوکم مێشکی کراوە بوو. پەنجەرەی ئەقڵی بە سەر هەموو لایەکی دونیادا کرابووەوە. بۆیە پاش ئەوەی ئەو مرد، من هەموو پەنجەرەکانم بە کراوەیی هێشتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا متمانەم بە ڕەفتاری (جیرالد) هەبوو، چونکە کاتێ یەکەم جار چووە لای دایکم، لەبەر دەمی دایکمدا، لە قژی سەرییەوە تا بنی پێی، گەنجێکی ئەمریکی قۆز بوو. لە خەسییەتی باپیرە گەورە چینییەکانی تەنیا ئەدەبی بەرزو سروشتی ناسکی پێوە دیار بوو. تەنیا قژی ڕەش و نەرمی ناجۆر بوو کە بە ڕێکی دایدەهێنا. لەو ساتەدا، چاوەکانی گڕی زیرەکی و تیشکی ڕۆشنبینییان لێ دەدرەوشایەوە. ئەوەی لە چاواندا نەبوو کە هەندێ جار لە سەرنجی چینیاندا دەمدی و گۆشەگیریی خاوەنەکەی دەگەیاند. هەروەکوو ئەو پیاوە دوورەیشی دەگەیاند کە ڕۆحی خۆشەویستەکەمی تێدایە.

دەشێ دایکیشم بە شێوەی تایبەتی خۆی، شێوەیەکی بچووککراوەی ئەم جۆرە بێ.

ئەو ڕۆژە، دایکم ڕەق و سەخت و سەنگین بوو. لە هەیوانێ دانیشتبوو. کراسە حەریرە بۆرەکەی لەبەر بوو، چاوەڕێی هاتنی (جیرالد)ی دەکرد. مێزی چای لە تەك بوو، حەوجۆشی زیوی میراتی دایکی لەسەر بوو، ئەویش چەند فنجانێکی پورسەلینی بە ژێر فنجانەوە لە تەك بوو کە یەکێ لە باپیرە گەورەکانمان، سەد ساڵ بوو، لە گەشتێکی دەریادا، لە (کانتۆن)و (چین) هێنابووی.

کە (جیرالد) هات، بە دایکمم گوت:

– دایکە..... ئەمە (جیرالد)ە.

دایکم دەستی زەردباوی بۆ درێژ کردو بە نزمی گوتی:

– چۆنی؟

دایکم، هەر چەندە جورمی بچووك بوو، گەورەیی و سەنگینی و شکۆمەندیی لە دەوری خۆی دروست دەکرد.

(جیرالد) بە دەنگێکی سەرشار لە گەرمیو شادی، وەڵامی دایەوە گوتی:

- باشم، سوپاس.

ئینجا گوتی:

- خانمی (کیرك)، زۆر بەختەوەرم کە دەرفەتی ناسینی ئێوەم بۆ هەڵکەوت.

من پێمگوت:

- (جیرالد)، دانیشە!

وامگوت بۆ ئەوەی ڕێ نەدەم ئەو ڕقەی بەرامبەر ڕەفتاری دایکم لە دەروونم جۆشابوو، دەربکەوێ. دایکم، بێئەوەی هیچ لە سەنگینیو شکۆمەندیی کەم بێتەوە، دەیتوانی بە شێوەیەکی جوانتر جیرالد بە خێر بێنێ. دایکم زۆر بە دەگمەن زەردەخەنەی دەهاتێ، بەڵام ئەگەر زەردەخەنەی بهاتایە، زەردەخەنەکەی زۆر جوانو شیرین بوو. ئێستا لەو ساتەدا، هیچ زەردەخەنەی لە ڕووی سەختو سەنگیندا نەبوو.

(جیرالد) چاوی بە دەورووبەری خۆیدا گێڕاو گوتی:

- ئەم خانووە خانوویەکی زۆر خۆشە! من حەز لە خانووی ئاوها کۆن دەکەم کە لەگەڵ دیمەنی سروشتی دەورووبەریدا دەگونجێ.

دایکم، بێ ئەوەی خۆی پێی بزانێ، بەم قسەیە دەموچاوی گەش بووەوە، گوتی:

- زۆر لە ڕادەی پێویست گەورەترە!

ئینجا دەستی بە چا تێکردن کرد:

(جیرالد) وەڵامی دایەوە، گوتی:

- من خانووی بچووکم هیچ پێ جوان نییە. خانوو دەبێ لە چاو دەورووبەرەکەی وەکوو مرواری بەهادار وا بێ.

دایکم وەڵامی دایەوە:

- وا بزانم تۆ حەز لە چای چینی دەکەی! ئێمە حەز لە چای هیندی دەکەین.

(جیرالد) گوتی:

- مادەم وایە، با کەمێ شیری تێدا بێ.

(جیرالد) جلەوی خۆی گرتبوو. جووڵانەوەی ئاسایی بوو. لە هەمان کاتدا، کە دەستی بە چا خواردنەوەو خواردنی کولیچەی ئینگلیزی کرد، وەك من دەمدی، تەواو ئاگاداری ڕەوش و هەڵوێستی دایکم بوو. چونکە دایکم، ئەگەر بیویستایە، دەیتوانی بە خوێن و گۆشت ئینگلیزی بێ. هەموو جارێکیش کە خۆی تەواو سەنگین دەنواند، خۆی وا لێ دەکرد. (جیرالد) گوتی:

- ئۆی لەو کولیچەیە! لەوەتی داپیرەی سکۆتلەندیم مردووە، شتی وام نەخواردووە.

دایکم لێیپرسی:

- بۆچی چما داپیرەت سکۆتلەندی بوو؟!

- بەڵی سکۆتلەندی بوو، هەر چەندە بنەماڵەکەمان لە زووەوە، لە ڤیرجینیاوە هاتبوون.

ئینجا گوتی:

- من منداڵ بووم هاتە لامان. شارەکەمانی زۆر پێ خۆش بوو. تا مرد لای ئێمە مایەوەو لە ترپە سپیان شاردمانەوە.

دایکم، قەپی لە کولیچەیەك داو گوتی:

- شاری ئێوە کامەیە؟

(جیرالد)، وەك ئەوەی ناوی (لەندەن)، یان (پاریس)، یان (ڕۆما) بێنێ، وەڵامی دایەوە:

- (پەکین، پایتەختی کۆنی چین!)

ئینجا گوتی:

- ئەمە چایەکی چاکە.... لەوانەیە چای هیندی خراپ دەربچێ، چای چینیش هەر وایە. خانمی (کێرك)، تۆ بە ڕاستی لە چا دەزانی!

دایکم سینی کێکی بڵند کردو لە جێی خۆی داینایەوەو گوتی:

- بە کچێنی فێریان کردم چۆن جۆرەکانی چا لە یەك جیا بکەمەوە.

(جیرالد) پێکەنی و گوتی:

- زەحمەت نەبێ لەحزەیەك...... دایکم فێری کردووم کێك لەگەڵ کولیجە نەخۆم.

دایکم، بێ دەستی خۆی بزەیەکی هاتێو لێوی بە خەندەیەکی هێمن و خێرا لێك بووەوە. من پێکەنیم. بە خەندەی دایکم پێکەنیم چونکە هەستم بە شادیو بەختەوەری کرد. بە (جیرالد)م گوت:

- (جیرالد)، باش پەروەردە کراوی!

دایکم ڕووی تێکردمو گوتی:

- ئیلیزابێت، ئەو قسەیە چییە دەیکەی؟! وابزانم تۆیش باش پەروەردەکراوی. جەنابی (ماك لیود) ڕاست دەکا. تۆ نابێ شتێکی وا بکەی لە جێی خۆی نەبێ.

- وەکوو بە منداڵی فێر ببووم، گورج تەوازۆم هێنایەوەو گوتم:

- ببوورە، دایکە!

ئەمە باوکم، بە نهێنی لە بەینی منو خۆیەوە، فێری کردبووم، پێیگوتبووم:

– لیز، (باوکم هەر بە لیز بانگی دەکردم) چەند ئاسانە مرۆڤ بڵێ: (ببوورە!) هیچی لێ کەم نابێ، بەڵام ئازارێکی زۆری لەسەر لادەکەوێ. ئەم وشەیە دراوێکی چالاکی ژیانی ڕۆژانەیە، بە تایبەتی لە بەینی ئەو کەسانەی یەکتریان خۆش دەوێ.

دایکم ڕووی لێوەرگێڕاو دەمی قسەی کردە (جیرالد):

– (ماك لوید)، ئایا داپیرەت لە (ریچ مۆند) ژیاوە؟

وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ.....

ئینجا گوتی:

– بنەماڵەی سکۆتلەندی ڕەسەنو دێرین لە (ڤیرجینیا) هەن. داپیرەم هەموو جارێ دووبارەی دەکردەوە کە (دانیال)ی باپیرە گەورەی دووری، یەکێ بووە لە دامەزرێنەرانی ئەو بنەماڵانە. ڕەنگە وایش بێ.

لێرەدا، دایکم گوتی:

– زۆر بەرزە!

دایکم مەراقی (درەختی بنەماڵە) بوو. زۆری هەوەس پێدەهاتو زۆر بایەخی پێ دەدا. من نەمویست خۆم لە شتەکە هەڵقورتێنم، بە تایبەتی کە دیم (جیرالد) بە پێی توانا دڵی سەنگینی دایکمی ڕاکێشاوە. ئەمەیش مانای وا نییە پاشان گومانی لە دڵ پەیدانەبووبێ. پێش تەواوبوونی کاروباری زەماوەند، (جیرالد) زۆر جار بە سەردان دەهاتە ماڵمانو دەڕۆیشت، دایکم، درەنگی شەو، بانگی دەکردمە

ژووری خۆی. جارێکیان کە چووم دیم قیت لەسەر کورسی نەرمی دانیشتووە، جلی نووستنی لەبەرەو قژی ڕەشی لە دواوە گرێ داوە:

– ئیلیزابێت، زۆر دەترسم کە منداڵت بوو، منداڵەکە چینی بێ. منداڵ بە داپیرو باپیریان دەچن. بۆ نموونە خۆت نموونەیەکی کتومتی (دوین)ی داپیرەتی.

پێمگوت:

– بۆیشی هەیە بە باپیرەکەی تری بچێ، (ماك لیود)

وەڵامی دامەوە:

– کێ دەستەبەری شتی وا دەکا؟

ئینجا لە سەری ڕۆیشت:

– ئای لە خۆمێ! چۆن بەروەست دێم نەوەم چینێ بێ! لە (بۆستن) چ جوابی خەڵکی بدەمەوە!؟

دایکم هەرگیز هەستی نەدەکرد خەڵکی (ڤێرمۆنت)ە. هەمیشە هەستی دەکرد بە دڵو بە گیان (بۆستنی)یە.

پێمگوت:

– دایکە، گوێ مەدەرێ! دەچم لەگەڵ (جیرالد) لە (پەکین) دەژیم.

کە ئەمەی بیست، تۆقا. بە ناڕەزایی گوتی:

– هەرگیز شتی وا نابێ! تۆ بچی لە (چین) بژی؟!

بەرگریم لە خۆم کردو گوتم:

– ئەی تۆیش نەهاتیتە (ڤێرمۆنت)و ئێستا وا لێرە دەژی؟!

– بەڵام چین......

بە سووربوونەوە وایگوت. گورج وەڵامم دایەوەو قسەکەی (جیرالد)م دووبارە کردەوە:

- (پەکین) لە (لەندەن)و (پاریس)و (ڕۆما) دوورتر نییە.

هەر لەسەر ناڕەزایی خۆی بەردوام بوو بەرامبەر ماوەی نێوان ئێمەو (پەکین)و گوتی:

- من نەمبیستووە کەس چووبێتە (پەکین)!

- داپیرە (ماك لیود) چووە.

بۆیە وامگوت تا بە بیری بێنمەوە.

- لەوەیش زیاتر، لەوێ نێژراوە.

دایکم بە توندی وەڵامی دامەوە:

- نەیدەزانی لە کوێ دەمرێ، نەشیدەتوانی خۆی لێ بە دوور بگرێ.

- (جیرالد) دەڵێ زۆری مەراق بوو لەوێ بنێژرێ.

دایکم، دوای ئەوە هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە هەنسك هەڵبکێشێ.

ئینجا پێی گوتم:

- دە ماچی ئێوارەم لێ بکە! بەڵام من قەت ناچمە (پەکین).

داهاتمەوە سەریا و ماچم کرد. ئینجا بە شادی پێمگوت:

- بۆی هەیە بچی.

دڵم شادی لەسەر دەڕژایەوە. ئەو ڕۆژانە، شادومانی خۆم پێ نەدەشاردرایەوە. دایکم سەری ڕەت کردنەوەی بادا. دایکم، قسەکەی ڕاست دەرچوو، هەرگیز نەیتوانی بچێتە (پەکین). ساڵی یەکەمی زەماوەندمان بوو، دایکم بە هۆی هەوکردنی سییەکان و سەرمابردەییەکی کتوپڕ، گیانی لە دەست دا. ئەوسا بە بیرم هاتەوە، هەموو زستانان کۆڵوانەکەی لە خۆی لوول دەداو دەیگوت:

- ئای های!! ئەم زستانە لە (ڤیرمۆنت) دەمرم!

زۆر جار وای دەگوت. بە ڕاستیش قسەکەی هاتە دی. بوو بە قوربانییەك لە قوربانییەکانی زستان. ئەو زستانە بوو دایکمی کوشت کە هەمیشەو لە هەر کوێ بوایە، زستانی لە دڵو دەروونda بوو.

× × ×

# (٣)

دوێنێ، پێش ڕۆژئاوا، لە پڕ گەواڵە هەورێکی ڕەش و تاری لە پشت چیاکانەوە هێنا. ئاسمانی تاریك کرد. لە هەموو لایەکەوە هەور زگی لە عەردی نا. گەیشتە سەر زەوی و کێڵگەکەمان. هەموو خەڵك و هەموو ئاژەڵ و ماڵات تووشی هەراسانی هاتن. تەنانەت منیش، کە پێشتر، زۆر باهۆزو زیخبارانم لە (پەکین) دیبوو، تووشی نیگەرانی هاتم. بەڵام ڕەشەبای دوێنێ زیخ و بارانی لەگەڵدا نەبوو. تەنیا بای پێش گەیشتنی هەورەکە. چەند دڵۆپە بارانێکی لەگەڵدا بوو. ئەو بایە هەرچی هەبێ، ئەوەندەمان بەس بوو هەورو تاریکی لەسەر ڕەواندینەوە. ئەو دۆڵە لە ژێر تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوەو گەرمای خۆری هەڵدەمژی. گەرمای خۆر تەمی سەر بەفری ڕەواندەوەو دونیا ساف و ئاسمان ساماڵ!

من خۆم چاوەڕێی هاتنی بەهارم نەدەکرد. بگرە لە بەهار دەترسام و لێی تۆقیبووم. تەماشای سەعاتیشم نەدەکرد بزانم چ وەختە. پێویستم بە شتی وا نەبوو. چاوەڕێی پۆستەچیشم نەدەکرد. هەموو ڕۆژێ، لە

دڵی خۆمدا دەمگوت: تازە کە زانیم هیچ نامەی تری (جیرالد)م بۆ نایێ، چاوەڕێی چ بکەمو بە تەمای چ بم؟

ئەمڕۆ بەیانی، کاتێ (مات) پۆستەی هێنا، ئەزیەتم نەدایە بەر خۆم ئاوڕێکی لێ بدەمەوە. هەر ئەوەندە بوو گوتم: لە سەر مێزەکەمی دانێ! هەر چەندە دەمزانی پۆستەکە هیچ نامەی تێدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆم پێنەگیرا چووم تەماشایەکم کرد.

ئەو ڕۆژانە زۆر سەرقاڵم. بەر لەوەی شیلەی دار بە ناو ڕەگەکاندا هەڵبکشێ، دەبێ دارەکان هەڵپەرتاوتین. بەرهەمێکی باشی سێومان هەیە. سێوە کۆنەکە باشە! لەگەڵ ئەوەی بە درێژایی زستان، سێوم دەبەشییەوە، هێشتا سێوێکی زۆر لەناو کۆگا ماوە. من لە هەموو سێوەکان حەزم لە سێوی گەورەیە کە یەکی نیو کیلۆ، یان نەختێ کەمتر دەبێ. کە قەپی لێ دەدەی تەڕو ناسکە، نە ترشەو نە شیرینە، لەو بەینەدایە. هەر جارەی قەپ لە سێوێك دەدەم، بە بیرم دێتەوە (جیرالد) حەز لە سێو ناکا. سێوی چینی وشكو بێ تامە. بە هەر حاڵ، (جیرالد)، بە گشتی حەزی لە سێو نەدەکرد، تەنانەت لە سێوی ئەمریکی خۆمانەش. زۆر جار دەهات لە سێو ڕنین یارمەتی دەداین، بەڵام یەك جار چییە نەمدی سێوێك بخوا. زۆر باسی هەرمێی دەکرد. جارێکیان یەك سینییە هەرمێم بۆ هێنا، یەك دانەی نەخوارد. گوتی:

– زۆر نەرمە. هەرمێ لە (پەکین) وەکوو کەرەوز قەپی لێ دەدرێ، زۆر تەڕو پڕ شیلەی سافە.

بۆ ئەوەی تووڕەی بکەم، پێمگوت:

– کەواتە ئەمە هەرمێ نییە.

وەڵامی دامەوە:

- سبەینێ ئەوەندە دوور نییە.

ئەو کاتە دەمانزانی هەر هێندە (جیرالد) لە کۆلێژی پزیشکی دەربچێ و بڕوانامەکەی وەربگرێ، زەماوەند دەکەین.

پاشان کە تامی هەرمێی چینیم کرد، دیم بە ڕاستی لە هەموو هەرمێیەکی تر جیایە. ئەوەندە بە لەزەتە باس ناکرێ. بە هەموو مانای وشە هەرمێیە. لەگەڵ ئەوەشدا لە تامو ڕیشاڵو پێکهاتەوە ناگاتە هەرمێی ئەمریکی. یەکەم جار وام زەن برد، بەر لەوەی پێبگا، لێیان کردۆتەوە، وەکوو خۆخ کە چینی بەم جۆرە دەیڕنن. حەز دەکەن ئەو کاتە بیخۆن کە شیرینییەکەی نەختێ تامی کاڵی لێ دێ. بەڵام ئەو هەرمێیەی من خواردم تەواو پێگەیی بوو، بە درێژایی زستان تەڕیو ناسکی خۆی پاراستبوو.

ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ، خەریکی دار هەڵپەرتاوتن بووین. (مات)م لەگەڵدا بوو. (مات) پیاوێکی هێمنو لەسەرخۆیە. ڤیرمۆنتییەکی ڕاستەقینەیە. پیاوێکی داڵ گۆشتی باڵا بەرزە. خواردنی خراپە، هەر چەندەی هەوڵی لەگەڵ دەدەین وازی لێ ناهێنێ، لەبەر ئەو خواردنە خراپە هیچ ددانی لە دەمدا نەماوە. زۆر هەوڵم دەدا خواردن لەگەڵ من بخوا. چاوی دەبڕییە نانی ئەسمەرو زەڵاتەی من، بێزی دەبووەوەو دەینایە لاوە. لە دووری من دادەنیشتو خواردنی خۆی دەخوارد. خواردنەکەی پارچە گۆشتێك بوو لەناو دوو لەتە نانی هەرزنی دەنا هی ئەوە نەبوو پێی بڵێی نان، تەنیا ئاردێکی سپی بوو لە ئاوکرابوو و بەس.

(مات) هەموو شتێکی لەبارەی منو لەبارەی ژیانی من لە چین دەزانی. گومانی تێدا نییە ئەویش لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە ئێستا

دەبێ (جیرالد) چی بەسەر هاتبێ، بەڵام بێجگە لە کاروباری زەوی‌و باخ‌و شینایی، پرسیاری هیچ شتی تری لێ نەدەکردم. لەوە زیاتر بە لای هیچ شتێدا نەدەچوو تەنیا ئەوە نەبێ باسی هەندێ ڕووداوی ناخۆشی بۆ دەکردم لە دۆڵەکەمان دەقەوما.

بۆ نموونە، ئەمڕۆ لێم بیست کێشەی بەردەوامی بەینی (تۆم موسەر)ی بچووك‌و ژنەکەی گەیشتە ڕادەی قسە پێك گوتن. (مات) پێیگوتم:

– تۆم چەقۆیەکی لێداوە بەڵام بە دەمەکەی نا.

لێم پرسی:

– ئەی چۆن لێیداوە؟

– بە دەسکەکەی لێیداوە. دەسکەکەی شاخە.

– لە کوێی داوە؟

– لە سینگی.

– لە سینگی؟!

دەمزانی (موللی موسەر) سینگ‌و بەرۆکێکی پان‌و پۆڕی هەیە. کراسی توند لەسەر سینگی گرێ دەدا. نەمتوانی لەسەر ئەم جۆرە باسە بەردەوام بم، پێمگوت:

– پێش ئەوەی (رینی) لە قوتابخانە بێتەوە، دەبێ کاری ناوباخ تەواو بکەین.

دەستمان بە ئیش کردەوە.

بەم جۆرە خۆم لێرە بووم‌و دارسێوم هەڵدەپەرتاوت کەچی خەیاڵم لە شەققەی باڵی دەداو لە زورگ‌و چیاو دۆڵەکانی (ڤیرمۆنت) دوور دەکەوتەوە. لە بیرم بوو کە تەنیا کەدی بچووکی لقە گەرەکانی دار سێو

بەر دەگرن. لە لقە گەورەکانەوە دەستم پێ دەکرد. دوو سێ ئینجم دەبڕییەوە بۆ ئەوەی دارەکە پەل‌وپۆی بڵاونەبێتەوە. دراوسێکەم دەیگوت: ئەگەر مشار تیژ بێ، ئێستا کاتی دار هەڵپەرتاوتنە.

قسەکەی زۆر ڕاستە. زستانان، کە ئاوو هەوا ناخۆش بێ‌و پێمان نەکرێ لە دەرەوە ئیش بکەین، لەماڵەوە داس‌و مشارەکانمان تیژ دەکەینەوە. من بۆ کەرەستە گەورەکان، چەرخێکی بەردی کۆنم هەیە، بۆ بچووکەکانیش، خۆم بە دەست، بە بەردە زوورگ‌و بە هەسان تیژیان دەکەم‌و دەیانسووم.

زۆرم ئەزیەت خوارد تا فێری دار هەڵپەرتاوتن بووم. بۆم دەرکەوت دار بە بڕینی وردو پاك زیاتر بەردەدا، کەچی بە بڕینی گەورەو قووڵ لە تاقەت دەکەوێ. بۆی هەیە کەدە دارەکە پەرك دەربچێ‌و لەوە بە دواوە هیچ بەر نەگرێ.

× × ×

## (٤)

چەرخی ڕۆژگار دەسووڕێ. ناتوانین لە سووڕانەوە ڕایبگرین. ئەوەتا خۆشم بێو ترشم بێ، بەهار هاتووە. (رینی) هەموو ڕۆژێ پرسیارم لێ دەکا:

- دایکە، هیچ نامە نەهاتووە؟

سەر بادەدەمو وەڵامی دەدەمەوە:

- دەترسم شتەکە بۆ باوکت زەحمەتتر کەوتبێ! بە هۆی پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستەکانەوە، دژایەتی کردنی ئەمریکا، تا دێ زیاتر تەشەنە دەکاو خراپتر دەبێ.

(رینی) بیر دەکاتەوەو دەڵێ:

- ئەو کۆمۆنیزمە چییە؟

وەڵامی دەدەمەوە:

- کێ دەزانێ؟! خەڵك چۆنی تێدەگا، ئاوهایە!

ئەوسا باسی (کارل مارکس)ی بۆ دەکەم کە پیاوێکی وردو سەیر بوو. لەمێژە مردووە. ژیانێکی سادەو ناخۆشی هەبوو. بە زەینی تیژو بیری وردی خۆیەوە، توانی خۆی بە سەر ملیۆنەها کەسدا بسەپێنێ.

بەوە کۆتاییم بە قسەکەم هێناو گوتم:

– تەنانەت ژیانی تایبەتی ئێمەیش (رینی)! هۆی ئەوە، ئێمە لە یەك دابڕاوین و هەریەکە لە لایەکی دونیادا دەژین. هۆی ئەوە، تۆ لە باوکت دابڕاوی و من لە هاوسەرەکەم!

کوڕەکەم لێیپرسیم:

– باشە، باوکم ناتوانێ خۆی لەوێ ڕزگار بکا؟

چۆن وەلامی ئەم پرسیارەی بدەمەوە؟ گوتم:

– وابزانم دەتوانێ. ئەگەر هات و ولاتەکەمان بوو بە کۆمۆنیزم، ئێمە وەکوو خۆمان دەمێنینەوە. بڕوامان بە ڕابردوو و ئایندە دەبێ و ئومێدمان بە ڕزگاری دەبێ.

– جا ئەوەمان بۆ ڕێك دەکەوێ؟

سوور بوو لەسەر پرسیارەکەی:

– ئایا ئەمە بۆ باوکم دەبێ؟

ولامم دایەوە:

– نازانم.

پێیگوتم:

– منیش نازانم، دایکە. ئایا ئەمە بە ڕاستی ولاتی منە؟

خێرا وەلامم دایەوە:

– ولاتی تۆیە چونکە ولاتی منە. با لێرە کۆتایی بەم باسە بێنین.

باش دەمزانی ئەمە دوا باس و دوا شت نییە. دەمزانی دەبێ ڕۆژێ بێ و (رینی) ولاتی خۆی و نیشتیمانی خۆی دەست نیشان بکا. دەشمزانی، چ زوو چ درەنگ، کوڕەکەم دەبێ بە دوا نامەی باوکی بزانێ. ئەو

نامەیەی لەناو چەکمەزەی نهێنی مێزەکەمدایە کە لە دایکمەوە بۆم ماوەتەوە، ئەو نامەیەی دەزانم هیچ نامەی تری ئەوی بە دوادا نایێ.

هەر هێندەم بۆ کرا قسەی ئەو ڕۆژەم بۆ شەو دواخست. سۆبەیەکمان لەناو مدبەق هەبوو، سۆبەیەکی کۆن بوو. وابزانم کاتی خۆی بۆ چێشت لێنان بە کار دەهات و منیش هەندێ جار، کە لە ڕۆژی ڕەشەبادا کارەبا دەبڕا، ئاوم لەسەر گەرم دەکرد. شێوی ئێوارەمان لە تەك ئەو سۆبەیە خوارد. ئینجا (رینی) دەستی بە قسە کردو بەم جۆرە کەوتە تەواوکردنی قسەی ئەو ڕۆژە:

– لەو بڕوایە دام باوکم پەکی ناکەوێ، ڕێگایەك دەدۆزێتەوە نامەمان بۆ بنێرێ.

وەلامم دایەوە:

– خۆیشمان نازانین چ کۆتێکمان لە پێ کراوە. باوکت پایەکەی ناسکەو خۆیشی زۆر مەترسی لە سەرە، چونکە باوکی ئەمریکییە.

(رینی) لێی پرسیم:

– ئەدی (ماك لیود)ی باپیرم لە کوێیە؟

(رینی) زۆر حەز لە سێو دەکا. هەموو ڕۆژێ سینییەکی پڕ سێوم لە سەر مێزی مدبەق دادەناو ئێواران دەمانخوارد. (رینی)، کە قسەی بۆ دەکردم، بە دەم قسەکردنەوە سێوێکی سووری (بولدوین)ی بە دەستەوە بوو دەیخوارد، وەلامی پرسیارەکەیم دایەوەو گوتم:

– لە (کنساس)ە، ڕۆژێ دەچینە سەردانی. لە بیرت کردووە هەموو جارێ پێت دەگوت: (بابا).

کتێبێکم بە دەستەوە بوو لەبارەی دانەوێڵە بوو. لەباتی ئەوەی کتێبەکە بخوێنمەوە، چاوم بڕیبووە ئاگری بەردەمم و چووبوومە ژێری.

ماوەیەك بوو بە تەمابووم سەردانێکی باوکی (جیرالد) بکەم. ئەمە یەکێ بوو لە داواو ئارەزووەکانی خۆشەویستەکەم. ئەو ڕۆژە، لە سەر پیادەڕۆی (شەنگهای) وەستابووین، پێیگوتم:

- بڕۆ سەردانی باوکم. (رینی)ش لەگەڵ خۆت ببە. زۆر بە دیداری نەوەکەی شادو گوشاد دەبێ!!

ئەمەی بە مەیلەو تکاو پاڕانەوەیەك گوت. لێمپرسی:

- بۆ ئەوە ڕەوانەی ئەمریکامان دەکەیتەوە؟

وەڵامی دامەوە:

- یەکێ لە هۆیەکان ئەمەیە.

وەڵامم دایەوە:

- مادەم وایە من لێرە دەمێنمەوە.

(جیرالد) پێیگوتم:

- دەبێ بچی! دەبێ (رینی)ش لەگەڵ خۆت ببەی!

ئینجا بە ئاشکرا باسی قسەی ناو دڵی هەردووکمانی کرد کە ئاشکرامان نەدەکرد. گوتی:

- ئێوە ئەگەر لێرە بمێننەوە، لە ژیانی خۆتان ئەمین نابن!

(جیرالد)، بە دەم ئەم قسانەوە، بە وشتی، ئاوڕی لە دەوروبەری خۆی دایەوە. ئەمە یەکەمین جار بوو ببینم (جیرالد) بترسێ. کاتی خۆی بێئەوەی دڵی بلەرزێ، یان جوولە بکا، لە ژێر بارانی گوللەو بۆمبادا جەنگابوو. ئەگەر جارێ ترسابێش، کەس ترسی پێوە نەدیوە. بەڵام ئێستا ترسێکی وا دایگرتووە، ناتوانێ لێمان بشارێتەوە. منیش ترسامو لێم پرسی:

- ئەوە تۆ چیتە؟

پێیگوتم:

- هیچ! من نیمچە چینیم، هەوڵ دەدەم سوود لەم لایەنە وەربگرم.

بە ورتە ورت گوتم:

- جا ئایا (ئەوان) شتی وات لێ قبووڵ دەکەن؟

(لەم ڕستەیەدا، ڕاناوی کەسی سێیەم (ئەوان) بۆ کۆمۆنیستەکان بە کار هاتووە)

وەڵامی دامەوە:

- دەبێ ببم بە شتێ نەتوانن دەستبەردارم بن!

بە من بوایە ئەو گفتوگۆیە تەنیا لە بەینی منو (ئەو) بێ. لە خانووی خۆمان، لە (پەکین)و لە ماڵی خۆمانو لە ژووری نووستنمانو دەرگاو پەنجەرەکانیش دابخەین. بۆ ئەوەی خۆی بە باوەشدا بدەمو ڕاستی مەسەلەکەی لێ دەربێنم. بەڵام ..... ئایا شتی وام پێدەکرا؟ ئایا (جیرالد) هیچ شتی لێ دەردەهێنرێ؟ (جیرالد) ورەیەکی بەرزی هەیەو قسەزانێکی شارەزایە. ئەو ڕۆژە، لە سەر پیادەڕۆی بەندەر، لە تەنیشتی وەستابووم. با لە قژی دەدام. نەمتوانی ڕەتی بدەمەوە. هەر ئەوەندەم پێکرا بە دەنگێکی نزمو کەرخو بێسۆز لێمپرسی:

- بۆچی (جیرالد)؟ ..... بۆچی دەتەوێ لێرە خۆت بکەی بە شتێ نەتوانن دەستبەردارت بن؟!

وەڵامی دامەوە:

- مرۆڤ دەبێ بزانێ چ دەکا!

لەوە زیاتر کاتمان نەبوو. چاوەڕێمان دەکرد بچینە لای کەشتیو ماقووڵ نییە مرۆڤ لەسەر بەلەمی بچووکو قەوغا باسی شتی وا بکا. لە بیرمە، زۆر شتم بە مێشکدا هات: لە کەیەوە وای لێهاتووە خەتەر بێ

مرۆڤ قسە بکا؟! لە کەینێوە وای لێهاتووە ئەو خەڵکەو ئێمەیش نەوێرین شادیو هەستو سۆزی خۆمان دەربڕینو هیچ شتێ لە یەکدی نەشارینەوە؟ لە کەیەوە وای لێهاتووە خەڵك بە پارێزەوە هەڵس‌وکەوت بکەنو بێ‌دەنگ بن؟ نازانم لە کەنگییەوە خەڵك وردە وردە گەیشتنە ئەم بارودۆخە؟ کە کەوتنە ئەم بارودۆخەیش، چنگیان لێ گیرکردن.

هەمووومان بێدەنگ بووین. منو (جیرالد) بە بێ دەنگی لە یەك جیابووینەوە.

× × ×

# (٥)

شەوان، بە پچڕ پچڕی نەبێ خەوم لێنەدەکەوت. لەناو جێ دەهاتمە دەرێ‌و لە ژوورەوە دەهاتم‌و دەچووم. بەڵام هەوڵم دەدا (رینی) بە خەبەر نەهێنم. هەستم دەکرد هەمیشە گوێی لە لای منە. دەتگوت هەست بە ئازارم دەکا.

من هەر لە سەر بڕیاری خۆم مامەوە، هیچم لەبارەی دوا نامە پێ نەگوت. وایدەزانی بۆیە ناڕەحەتم چونکە چەند مانگێکە هیچ نامەم لە باوکییەوە بۆ نەهاتووە. پێیدەگوتم:

– دایکە، دڵنیام، بێ‌ئەوەی خۆیشمان بزانین، زۆر نامە چاوەڕێمان دەکا. خۆت باش دەزانی پۆستەچی چۆنن! زۆر جار دادەنیشن بۆ ئەوەی قاپە برنجێکی گەرم بخۆن، یان لە ژێر درەختێك ڕادەکشێن‌و دەخەون.

ڕاستییەکەی وا نەبوو. بەریدی نێوان ئێمەو پەکین ڕێك‌و پێك بوو. وا بزانم ئێستایش هەر وایە. ئینگلیز نیزامەکەیان داناوەو ئەوانیش لە هەموو کەس باشتر ئەو جۆرە خزمەتگوزارییە ڕێك دەخەن.

بزەم هاتێ بۆ ئەو ئومێدەی (رینی) دڵی خۆی پێخۆش دەکردو پێم گوت:

- بێگومان تۆ ڕاست دەکەی. چیدی خۆم بە شتی وا خەریك ناکەم. مادەم هیچ دەنگ‌و باس نەبێ، ئەمە خۆی لە خۆیەوە دەنگ‌و باسێکی خۆشە! ئەمە پەندێکی کۆن‌و قسەیەکی نەستەقە هەموومان دەیزانین.

زۆرم حەز دەکرد ئێستا (جیرالد) لەگەڵمان بوایە. باشە ئەگەر ئەو نامەیەش نەبوایە کە لەناو چەکمەزەی نهێنی مێزەکەمدایە، چم دەکرد؟

نامەکەم بە مۆمی سوور قەپات کردبوو نەوەك ڕۆژێ لە ڕۆژان (رینی) بە خەیاڵیدا بێ چەکمەزەی مێزەکەم بکۆڵێتەوەو نامەکەی بکەوێتە بەردەست. هەر چەندە شتی وا لە یەکێکی وەکوو ئەو دوور بوو. کە مۆرم کرد، بەڵێنم بە خۆم دا، جارێکی تر نەیکەمەوە.

دوێنێ شەو هەستم بە تەنیاییەکی سەخت‌و کوشندە دەکرد. ناو بە ناو لێی توند دەکردم. هەستم بە بۆشاییەکی گەورە دەکرد، لە بۆشایی مەرگ قورستر! من بێوەژنێکی بێمێردم. کە پیاوێ دەمرێ ژنەکەیشی بە هەست‌و نەست لەگەڵیا دەمرێ‌و لەگەڵ مردنی مێردەکەیدا، خۆشەویستیشی بۆ مێردەکەی دەمرێ.

ئەگەر خۆشەویستییەکە لەوەیش گەورەتر بێ، بەشێکی لەگەڵ مێردەکەی دەمرێ‌و جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ پیاوێکی تردا بژی. بەڵام من بێوەژن نیم. زۆر شەو وا دەبێ لەناو نوێن ڕادەکشێم، خەوم لێ ناکەوێ. خەیاڵم دەڕواو بە سەر دەریاکاندا دەپەڕێتەوە. بۆشایی دەبڕێ‌و لە سنووری کات‌و ڕۆژگاردا تێدەپەڕێ! دەمەوێ خۆشەویستەکەم ببینم. لە جادە دەپەڕمەوە بۆ بەر دەرگای حەوشەی ماڵە گەورەکەمان. لە دەرگای داخراوەوە دەچمە ناو حەوشە.

دەرگەوانەکە نووستووە، بە خەبەر نایێ. ئاگای لە من نییەو ناتوانێ ڕێم لێ بگرێ. ئەوەتاماڵەکەمان لە بەرامبەرمە. چۆنم جێهێشتبوو بە دەق خۆیەتی. ڕەنگە چاوەڕێی هاتنەوەی من بکا. هیچ شتێ ناتوانێ منو (جیرالد) لە یەك جیا بکاتەوە. کاتی خۆیشی بڕوام هەر وا بوو، بۆیە کە ڕۆیشتم، بە خزمەتکارەکانم گوت:

- دەستکاری هیچ شتێ مەکەن! با هەموو شتێ وەکوو خۆی بمێنێتەوە!

بەڵێنیان دا بە قسەم بکەن. ئینجا پێمگوتن:

- لە بیرتان نەچێ، سەروەرەکەمان هەر چەندە درەنگ بێتەوە، کە هاتەوە دەبێ خواردنەکەی گەرم بێ.

دیسان بەڵێنیان پێدامو گوتیان:

- قەتاو قەت لە بیر ناکەین!

ئینجا پێمگوتن:

- من دێمەوە.

لەگەڵ من دووبارەیان کردەوە:

- خانمەکەمان دێتەوە.

ئەوسا بە ڕۆحو خەیاڵ، خێرا بە ناو ژوورەکاندا دەگەڕێم. دەگەمە ژووری نووستنی (جیرالد). (جیرالد) خەوتووە. بەڵام ئایا بە تەنیا خەوتووە؟ ئایا ئێستایش هەر تەنیایە!؟

ڕۆحم لەبەر دەرگا دەوەستێ. دەترسمو لە پڕ بە ڕۆح دەگەڕێمەوە شوێنی خۆم.

ئایا (جیرالد) چ ڕۆژێ ئەو نامەیەی نووسیوە؟ ئایا نامەکە هیچی تێدایە مێژووی نووسینی پێشان بدا؟ دڵنیا نەبووم. ڕۆحی پەرۆش و بە مەراقم هانی دام قیت ببمەوە.

هەستام چەکمەزە نهێنییەکەم کردەوەو نامەکەم دەرهێنا. بەڵێ، من خۆم مۆرەکەم شکاند. وشەکانی سەرەتام خوێندەوە:

(بە ئاشکرا پێت بڵێم من لە تۆ بەولاوە هیچ کەسم خۆش ناوێ...)

بە هەر دوو دەست سەری خۆمم گرت و گریام. ئایا ئەوەندە بەس نییە کە نووسیویەتی؟ چی تیا بەستەیە ئەگەر ئەمشەو بە تەنیا بخەوێ، یان بە تەنیا نەخەوێ؟!

هیچ وەڵامم دەست نەکەوت دڵم فێنك بکاتەوە. نامەکەم دەق کردەوە. دووبارە مۆرم کردو لەناو سندووقی داخراوی چەکمەزە نهێنییەکەمم دانایەوە.

نەمتوانی بچمەوە ناو پێخەفەکەم. ئەگەر ژنێ بە مردنی مێردی بێوەژن ببێ، هەست و سۆزیشی لەگەڵ مێردەکەی دەمرێ، یان جەستەی زیندووی داوای مافی خۆی لە جەستەی نێژراوەی ژێر خاك دەکا؟ بەڵام خۆ من (جیرالد)ی مێردم نەمردووە. زیندووەو بە هەموو یادو بیرەوەرییەکانەوە لەگەڵ مندا دەژی. ئێستا لەوێ، لە ماڵی خۆمانە. ئێواران دەچێتەوە ماڵێ. شێو دەخواو دەخەوێ. بەیانی بە خەبەر دێ و دووبارە دەست بە ژیانی ڕۆژانەی دەکاتەوە.

ئێستا تەماشای ئەو مانگە دەکا. ئەو مانگەی ئێستا تریفەی لە پەنجەرەی ژووری من دەدا. هەست بە لەشی دەکەم، خوێنی گەرمم لە دەمارەکاندا دەبزوێ. ئارەزووم هەڵدەستێ. جەستەم بانگی دەکا. (جیرالد) زیندووەو نەمردووە. دڵنیام بەو هەموو شتە دەزانێ. دەزانێ

من ئێستا لێرە، لە تەنیشت پەنجەرە وەستاوەو تەماشای مانگ دەکەم لەناو تەموومژی شەوێکی بەهاردا بەرزبۆتەوە ئاسمان.

لە بیرمە... لە بیرمە... ئێمە لەناو ئەو ماڵەدا بوو کە یەکەم جار شەرابی خۆشەویستیمان چەشت. هێشتا مارەییمان نەبڕی بوو. کە ئەمە دەنووسم، هەست بە هیچ شەرمو شوورەییەك ناکەم. تا ئێستا نهێنی بەینی خۆمانم بۆ کەس نەدرکاندووە. ئەویش بۆ کەسی نەدرکاندووە. دڵنیام لای کەس باسی نەکردووە. سووری لەسەر ئەوەی تەنیا منی خۆش دەویٚو هەرچی ببێ، لەسەر ئەو خۆشەویستییەی خۆی دەمێنێتەوە. لەوانەیە من هەڵەم کردبێ دەرهەق بەو شتەی ڕووی دا، بەڵام شادو بەختەوەرم بەوەی کردم. (جیرالد) هەستی زۆر ناسکە. لە ڕۆژانی هەوەڵدا، کە هێشتا باسی خۆشەویستی خۆی بۆ نەکردبووم، تووشی ترسێکی سەیر هاتبوو. دەترسا ڕەچەڵەکیی چینی ئەو بە خراپ بە سەر مندا بشکێتەوە. ڕاستییەکەی (جیرالد) هەندێجار زیاتر چینی بوو تا ئەمریکی.

بە ڕوویدا دەمچریکاند:

– ئای، ئازیزەکەم، چەند پەستو چروکی!

زۆر پێش ئەوەی ئەو بە من بڵێ (ئازیزەکەم)، من بەوم دەگوت (ئازیزەکەم).

کە وای لێهات بە ناوی نازو خۆشەویستیش بانگم بکا، هەموو جارێ بە ئاسانی بۆی نەدەکراو لەبەر دەم خەڵکیش بەو ناوە بانگی نەدەکردم. ئێستایش لە بیرمە جارێکیان بە چ سەرنجێك، بە دوو چاوە ڕەشو غەموونەکانی تێمڕاما و گوتی:

- ئێستا دەتوانم بەبێ خۆشەویستی تۆ بژیم، بەڵام کە بووی بە هی من، قەت ناتوانم بەبێ خۆشەویستی تۆ بژیم، بۆیە زات ناکەم بڵێم کەی زەماوەند دەکەین.

ڕاستە، قەت ئەو پرسەی پێنەکردم! ڕازیش نەبوو لە جێییان باس بکەم کە دەزگیرانین. منیش گوتم:

- هەمیشە هەر تۆم خۆش دەوێ!

گوتی:

- تۆ خۆیشت نازانی چ دەڵێی و متمانەت بە قسەی خۆت نییە. جەستە ئارەزووی زۆرە، جلەوی بە کەس بەرزەفت نابێ.

ئەم گفتوگۆیە، لە شەوێکی هەیوە شەوی دەق وەکوو ئەم شەو، لە بەینمان ڕووی دا. ئەو ساڵە بەهارەکەی درەنگ هات. ئەو شەوە، ماوەیەکی زۆر، دوور لە دایکم و لە خەڵك، بە ناو دارو درەختدا پیاسەمان کرد. دونیا سارد بوو، هەستم بە سەرما دەکرد. پاڵتۆی خۆی داکەندو بە سەر شانی داردادام. لە ژێر باڵی پارێزگاری ئەوا ڕۆیشتین. پێمگوت:

- تۆ متمانەت بە خۆت نییە.

ماوەیەکی زۆر لە بیرکردنەوەدا نقووم بووم. بەم جۆرە دەتوانم متمانە بە خۆم پەیدا بکەم. ئاخیری گوتم:

- ئەگەر بە هۆی هەر شتێکەوە بێ کە ئێستا نازانین چییە، وا تێدەگەی من تۆم خۆش ناوێ، ئەمشەو وەرە ژوورەکەم. هیچ شت لە یەك ناشارینەوە، بۆ ئەوەی بەر لە زەماوەند، لە خۆمان دڵنیا بین.

هەستم کرد هەموو گیانی چرك و هۆڕ لەرزی. زانیم چاوەڕێی شتی وای نەدەکرد بۆیە وای لێهات. ئینجا پێیگوتم:

- نەخێر، نابێ شتی وا بکەی!

مانگی کانوونی دووەم هات. هێشتا وەڵامی ئارەزووی منی نەدابووەوە. لە کۆلێجی پزیشکی هارڤارد دەرچوو. دایکیشم لە ئاهەنگی دەرچوونی ئامادە بوو. کاتێ گوێم لەو ڕستەیە بوو کە لە ئاهەنگی دەرچوونی زانکۆدا دەگوترێتەوە، لە هەلهەلەم دا!! شایم پێ دەهات کە بە پلەی شەرەف دەرچووە. کاتێ بە عەبای زانکۆ هاتە لامانەوە، دایکم ئەوەندە بە گەرمی پێشوازی کرد قەت شتی وام نەدیبوو. لەوێ، کەسی لەو کۆك‌و قۆزترم نەدی. لەو ساتەدا، هیچ دوو دڵی‌و ڕاڕایی پێوە دیار نەما. گەڕایەوە سەرباری ئاسایی خۆی: شادو سەرفراز!! ئینجا دەستی من‌و دەستی دایکمی گرت‌و گوتی:

- سوپاستان دەکەم کە هاتوون. ئەگەر ئێوە نەبان، من بێ کەس‌وکار بووم، لێرە تەنیا بووم.

دایکم دەستی گوشی‌و پیرۆزبایی لێکرد. منیش هەستامەوە سەر پەنجەی پێ‌و ماچێکم لە گۆنای کرد. ئەمە یەکەم جار بوو لە دیار دایکم شتی وا بکەم. کە ئەمەی دی، تێی ڕانەخوڕیم، بە دڵنیایی‌و ڕەزامەندی گرژییەوە.

ئەو شەوە، هەرسێکمان لە (بۆستن)، لە چێشتخانەیەکی چینی، بە یەکەوە شێومان خوارد. هەموو شتێکی بۆ ئەو بۆنەیە ئامادە کردبوو. دایکم گوێی نەدایێ، یەك یەك هەموو جۆرە خواردنە نامۆکانی تام کرد! من هەموو جۆرە خواردنەکانم خواردو دڵخۆشیی خۆم بەرامبەر هەر هەموویان نیشان دا. (جیرالد) هەر پێدەکەنی. هەستم دەکرد لە دڵەوە خۆشی دەوێم، هەرچەندە لە ڕەفتارەکانی بە پارێز بوو.

ڕۆژی پاشی، بە یەکەوە چووینە ماڵی ئێمە. لە بیرمە شەوێکی ساماڵ بوو. کزەبایەکی خۆشی دەهات، هەوای چیا تا بڵێی ساف‌و خۆش بوو. تا درەنگی شەو لەگەڵ (جیرالد)، لەسەر شانشین دانیشتین. باوکم، هاوینی پێش مردنی، ئەو شانشینەی دروست کردبوو. حەزم دەکرد باسی باوکم بکەم. حەزم دەکرد چی لە ژیانی باوکمدا بە بیرم ماوە بۆ (جیرالد)ی باس بکەم. ئینجا بە (جیرالد)م گوت:

- حەزم دەکرد باوکم هەموو شتێکی لەبارەی تۆوە بزانیایە!

(جیرالد) پرسی:

- چی لە بارەی منەوە بزانیایە؟

دەستی گرتبووم. هەستم دەکرد دەستی ساردە، بەڵام من دەستم وەکوو هەمیشە گەرم بوو. پێمگوت:

- حەزم دەکرد.... حەزم دەکرد باوکم ئەو پیاوەی بناسیایە کە دەبوو بە مێردم.

ئەوسا زۆر ئازا بووم، بەڵام خۆم دەمزانی چ دەڵێم. دەمزانی (جیرالد) خۆشی دەوێم، بەڵام بۆچی داوا ناکا شووی پێبکەم؟! ئەمەم نەدەزانی. بەڵام مادەم یەکترمان خۆش دەوێ، ئەوەندە کاتەمان لە پێشە، ، ئەمە ساغ بکەمەوە.

هەردوو دەستی گرتم‌و بە کپ‌و بێدەنگی دانیشت. ئینجا لەپڕ لە سەر کورسییەکەی هەستا. ڕایکێشامە بەر خۆی‌و ماچێکی وای لێکردم شتی وام نەدیبوو. هەوڵم دا خۆم لەو ماچە دوورو درێژە رابپسکێنم کە تیا نقووم ببووین. بە چرپە گوتم:

- ئەوە یەکترمان بە دەزگیران کرد!

منی گرتە باوەش‌و گوتی:

- بمتوانیایە پشت ڕاستی بکەمەوە!

وەڵامم دایەوە:

- با بە یەکەوە پشت ڕاستی بکەینەوە.

شەوێکی کڕو بێدەنگ بوو. شوێنەکەیش کش‌و مات بوو. دانیشتینەوە بەم تاریکییە ترسناک‌و تلی چاوە، باسی (پەکین)و باسی لانکەی دەوری منداڵی خۆی بۆ کردم. بۆ یەکەم جار باسی دایکی بۆ کردم، گوتی: ئافرەتێکی جوان نەبوو، دەم‌وچاوی سادەو ئاسایی بوو، بەڵام خۆی ئازاو ڕەوشتبەرز بوو. دەستی ناسك بوو، بۆنێکی خۆشی لێدەهات.

(جیرالد) دەستی دایکی لە بیر بوو. بۆنی دەستی دایکی لە بیر بوو کاتێ دەستی بە ڕوومەتەکانی دا دەهێنا. ئینجا گوتی:

- ژنی چینی وەکوو ژنی ڕۆژئاوایی منداڵەکانیان ماچ ناکەن. ئەوان تەنیا پەنجە لە لووتی منداڵەکانیان دەدەن‌و لووتیان بۆن دەکەن. کە لە دەوری منداڵی دەرچووم، دایکم بە هەر دوو دەست شەپی لە گۆناکانم دەدا. ناو لەپی زۆر نەرم‌و ناسك بوو.

لێمپرسی:

- دایکت کێبوو؟ چۆن شووی بە باوکت کرد؟

وەڵامی دامەوە:

- بە تەواوی نازانم. ئەوەندە دەزانم باوکم لە خۆشەویستی یەکەمی ناکام بوو. دەیەویست کچێ لە ئەمریکا بێنێ، ئەویش یان خۆی ڕازی نەبوو لە گەڵیا بچێتە چین، یان دایك‌و باوکی لێنەگەڕان. دیارە کچەکەیش ئەوەندە بەهێز نەبوو لە ڕوویان بوەستێ، بۆیە شووی بە باوکم نەکرد. دوای ئەوە، باوکم بە تەنێ چووە چین بۆ ئەوەی دەرمانی

دەردی دڵی خۆی بکا. دە ساڵ لە چین ژیا. خۆت دەزانی چینی چۆنن....

لێرەدا، لە قسەکردن وەستا. ئینجا دەستی پێکردەوە:

- نا.... تۆ چو زانی؟! ئەوان ڕایان وایە فەرمانی ئاسمانە دەبێ هەموو پیاوێك ژن بێنێ و هەموو ژنێك شوو بکا. ئەو گەلەی خێرو خۆشیی لەناو ژن و پیاوەکانیدا نەبێ، خێرو خۆشی تێدا نییە. بەم جۆرە، برادەرە چینییەکانی باوکم باوکمیان ڕازی کرد ژن بێنێ. برادەرێکی هەرە باشی باوکم خوشکی خۆی پێشکەش کرد. کابرا ناوی (هان بو وین) بوو. ئەوە بوو کە پاشان بوو بە خاڵم و خوشکیشی بوو بە دایکم.

دایکم تەمەنی بچووك نەبوو کاتێ مێردی بە باوکم کرد. مەیلەو بە بێوەژن دادەنرا. چونکە هێشتا کەنیلە بوو، لەسەر داوای دایبابی، شووی بە پیاوێك کرد. کابرا حەفتەیەك پێش زەماوەند کۆچی دوایی کرد. ئەگەر دایکم بە دەست خۆی بوایە، بە پێی خوو ڕەوشتی چینی، مێردی نەدەکردەوە، خۆی دەقەبەر دێرێك دەکرد.

لێمپرسی:

- ئایا دایکت ئامادە بوو شوو بە پیاوێکی ئەمریکی بکا؟

(جیرالد) وەڵامی دامەوە:

- ئەمە دڵی لە باوکم سەندبوو.....

ئینجا گوتی:

- زۆربەی کچی چینی ڕازی نابن شوو بە بێگانان بکەن. لە بێگانان زیرە دەکەن. مووی لەش و بۆنیان، کە لووت دەتووزێنێتەوەو شێوازی گشتی ژیانیان پەسند ناکەن.

کە قسەی دەکرد دەمی تێك دەئالا. ئینجا لێمپرسی:

- ئایا دایکت، پێش زەماوەند باوکتی دیبوو؟

ڕاستی، من خۆم زۆر بەو ژنە چینییە، بە دایکی (جیرالد)، داخبار بووم.

(جیرالد) پێیگوتم:

- یەك جار!... کاتێ باوکم چووبووە سەردانی ماڵی برادەرەکەی. ئەو، لە دالانی سەرەکی ماڵەوە وەستابوو. کە چاوی بە باوکم کەوت، یەکسەر کشایەوە، بەڵام باوکم هەر هەستیشی پێنەکرد.

- باوکت پیاوێکی قۆز بوو.

وامگوت بۆ ئەوەی بیری بێنمەوە پێشتر وێنەی باوکی پێشان داوم.

- بەڵێ!

- ئایا دایك‌و باوکت لەگەڵ یەکتر بەختەوەر بوون؟

پرسیارەکەم جەخت‌و پێدانی گرتنی تێدا بوو. نەختێ بیری کردەوە، ئینجا وەڵامی دامەوە، گوتی:

- تا ڕادەیەك بەختەوەر بوون. کەس نەبوو لەگەڵ باوکم هەست بە بەختەوەری نەکا. نە شادی‌و خۆشی دەنواند نە غەم‌و کەسەر. لەهەر کوێ بوایە دەستووری خۆی دەسەپاند.

گوتم:

- جا ئایا دەستوور ئەوەندە گرنگە؟

من خۆم دەستوورم بەلاوە ئەوەندە گرنگ نییە. شتی لەوە گرنگتر هەیە مرۆڤ خۆی پێ پەیوەست بکات بۆ ئەوەی هەر شتەو لە شوێنی خۆی دابنێ. بەڵام (جیرالد) وەڵامی دامەوەو گوتی:

- ژیان، بەبێ دەستوور، بەو جۆرە نابێ کە هەیە!

دەستمان لەناو دەستی یەکتر بوو، بە شێنەیی ئەم قسانەمان دەکردو مانگ لەو بەرزاییەوە، لە تاقی ئاسماندا بەسەریدا دەڕوانین. تریفەی مانگ لە چیاکانی دەداو ئەو چیایانە دەتگوت بۆ ئاسمان هەڵدەکشێن. کاتێ قسەمان دەکردو مێشکمان بە باسی ئەو دیو دەریاکانەوە خەریك بوو، هەستمان دەکرد ئەو شەوە شتێکی گرنگی بۆ حەشارداوین. (جیرالد) ڕەوشتی وا بوو ئەگەر هەستێکی قووڵی لە ناخی دڵ بجۆشایە، هیچ قسەی نەدەکرد. ئەو هەستەی دەروونی، بە سروشتی کپو سەرنجی خێراو بریسکەی چاوو ناسکیی دەنگ دەردەبڕی.

سەعاتی باوکم لەسەر دیواری هەیوانەکە بوو. گوێمان لێ بوو دوازدە جار لێیدا. بە یەکەوە هەستاین چووینە ژوورەوەو لە پلیکانە سەرکەوتین. ژووری میوانان لای پلیکانە بوو. لەوێ وەستاین. بێدەنگیی باڵی بەسەر ماڵەوەدا کێشابوو. دەرگای ژووری دایکم داخرابوو. ئەمە ئەو شەوە بوو کە چاوەڕێمان دەکرد. بە دەنگێکی نەرمو ناسك بە (جیرالد)م گوت:

– دەرگای ژوورەکەم بە کراوەیی جێدێڵم.

باوەشی پێدا کردمو ماچێکی تری لێکردم. ئەم ماچە وانەبوو هەر سۆزێکی گەرمی تێدابێ، بەڵکو ناسكو میهرەبانیش بوو. ئینجا جێی هێشتم، چووە ژووری میوانانو دەرگای لە دوای خۆیەوە پێوەدا.

منیش چوومە ژووری تایبەتی خۆمو دەرگام داخست بۆ ئەوەی خۆم ئامادە بکەم. هەستم کرد شادیو بەختەوەری بە ناو هەموو دەمارەکانی لەشمدا دەگەڕێ. ئەو کاتە بۆم دەرکەوت زەماوەند چ پیرۆزییەكو چ گوڕو تینێکی تێدایە. بە دەم بیرکردنەوە، خۆم

شووشتەو قژی درێژی خۆمم داهێناو کراسێکی سپی خەوتنم لەبەر کرد. ئینجا دەرگام کردەوە، دیتم دەرگای ژوورەکەی ئەو هێشتا داخراوە. لەسەر کورسی تەك پەنجەرەکە دانیشتمو چاوەڕێم کرد. سەیری ترۆپکی چیاکانی دەورووبەرم کرد. دوای دەوری سەعاتێ، کەمتر، یان زیاتر، گوێم لە ترپەی پێی بوو. ئاوڕم دایەوە، لەسەر کۆسپەی دەرگای ژووری من وەستابوو. ڕۆبێکی حەریری شینی چینی لەبەربوو. هەروا وەستاو تەماشای یەکترمان کرد. ئینجا بازووی کردەوەو منیش خۆم بە باوەشی دا دا.

× × ×

## (٦)

بیرەوەری خستمیە سەر باڵی خۆی‌و دووری بردم. ماوەیەکی زۆر لەگەڵ بیرەوەریدا ژیام. هەستم کرد باش نییە لەگەڵ بیرەوەریدا بژیم. هەستم کرد ناتوانم ماوەیەکی زۆر بەم جۆرە بژیم. (جیرالد) نەمردووە، تەنیا بیرەوەرییەکانی مابێ بۆ ئەوەی لەگەڵ بیرەوەرییەکانیدا بژیم. (جیرالد) ئێستا سپ‌و ساغ‌و زیندووە. مادەم مەسەلەکە وایە، پێویستە منیش بژیم، پێویستە بیرەوەری تەنیا پردێك بێ‌و بە یەکەوە بمانبەستێتەوە بۆ ئەوەی بە جەستەو ڕۆح لە یەك جیا نەبینەوە. ئێستا هەردووکمان ساغ‌و سەلامەتین‌و دەژین، ئەوەندە هەیە ماوەی نێوانمان زۆر دوورەو ڕۆژگارێکی درێژمان لە نێواندایە. دەبێ ئەو بۆشاییە پڕ بکەینەوەو ئەو ڕۆژگارە درێژە بقەتێنین.

سوپاس بۆ خودا ئەوەندە سەرقاڵی کاروباری زەوی‌و باخم، هیچ وەختم بە دەستەوە نییە. (رینی) چەند ڕۆژێك مادۆنی لە قوتابخانە وەرگرتووە. لە سۆری سبەینێوە تا شەو دادێ‌و تاریك دەکەوێتە عەردی، لەگەڵ من‌و (مات) ئیش دەکا. کە شەو دادێ، ئەوەندە شل‌و شەکەتم، ئاگام لە عەمری بێزار نییە.

قژم درێژە، بیرم کردەوە قژم ببڕمەوە. ئەمڕۆ بە دەم بای توندەوە شۆڕ دەبووەوە سەر پشتمو تێك دەئالا، بێزاری کردم، گوتم دەمەوێ قژم ببڕمەوە، (رینی) نارەزایی پێشان داو لە ڕووم وەستا. گوتم:

– دەبێ ئەم قژە لە کۆڵ خۆم بکەمەوە.

ئینجا بە دەم ئەم قسەیەوە قژی زەردو درێژی خۆمم گرتو توند لەسەری خۆمم ئالاند. (با) قسەکەی بردمو گەیاندیە بەر گوێی (رینی) کە لێمەوە دوور بوو. (رینی) هەردوو لەپی لە سەر زاری دانا و تا تینی تێدا بوو هاواری کرد بۆ ئەوەی دەنگی بگاتە من، گوتی:

– هەر چەندە ئازارت بداو سەخڵەتت بکا، نابێ شتی وا بکەی!

کاتێ، پاشان بۆ نان خواردن دانیشتین، لێمپرسی: بۆچی لەگەڵ ئەوە دا نی قژم ببڕم؟ وەلامی دامەوە:

– حەز لە ژنی قژکورت ناکەم.

پێمگوت:

– من بۆ تۆ ژن نیم! من دایکی تۆم.

– کەواتە تۆ دایکێکی قژکورتی.

لە دڵی خۆمدا گوتم: ئایا (جیرالد)یش بە منداڵی ئاوها بە سادەیی پێکەنیوە. کەس نییە وەلامی ئەم پرسیارەم بداتەوە. باوەڕ ناکەم کەسیش بدۆزمەوە ئەو شتانە بزانێ.

ئای لە دڵی مرۆڤ!! چەند زوو دەگۆڕێو وەردەچەرخێ!! کە لە نووسینی ئەم وشانە بوومەوە، بە بیرم هاتەوە (جیرالد) باوکی هەیە. ئەو، ئەم شتانە دەزانێ. لەگەڵ ئەم بیرە ڕاگوزەرەدا، پلانێکم کەوتە مێشك، دەتگوت چاوەڕێی ئەو ساتە دەکا. بڕیارم دا، کە لە کاروباری زەویو باخ بووینەوە، لەگەڵ (رینی) بچینە سەردانی باوکی (جیرالد).

پۆژی پاشی، کاتێ لە سووچێکی باخدا کارمان دەکرد، بە شێنەیی بە (رینی)م گوت:

- (رینی)، رات چییە (ماك لوید)ی باپیرەت بێنین لای خۆمان بژی! بە مەوە ماڵەکەمان پیاوێکی تریشی بۆ زیاد دەبێ!

(رینی) پێیگوتم:

- باپیرەمم لە بیرە!

بەر لەوەی یابانەکان بگەنە ناو (پەکین)، باوکی (جیرالد) ڕۆیشت‌و زۆر بە سادەیی بیانووی بەوە هێنایەوە کە بەرگەی بینینی ئەمانە ناگرێ‌و بە خەیاڵیش شتی وای بە مێشکدا نەهاتووە. ئەوە بوو پلیتی پاپۆڕێکی کڕی بۆ (سان فرانسیسکۆ)و لەوێوە، لە (کنساس) چووە شارێکی بچووك بە ناوی (سپرینگز). ئێستا هیچ ئاگام لێ نییەو هیچ لە بارەی ژیانییەوە نازانم. هەر ئەوندە بوو کاتێ هاتینەوە (ڤیرمۆنت)، جارێکیان نامەیەکی بۆ نووسیم‌و هەواڵی (جیرالد)ی لێپرسیم. ئەوەندەی دەمزانی وەڵامم دایەوە. دوای ئەوە هیچ نامەی تری بۆ نەناردم.

بە (رینی)م گوت:

- باشە؟!

چاوەڕێی وەڵامم کرد. وەڵامی دامەوە:

- دەبێ بیری لێ بکەمەوە.

(رینی) نەختێ توندە.... ئەو کوڕە ئەو توندییەی لە من ناکا. ڕەنگە ئەمەی لە دایکم بۆ مابێتەوە. ئەگەر وابێ توندییەکەی هی ڕژدی‌و بەخیلی نییە کە خەسڵەتێکی دایکم بوو. بەڵکو جۆرە توندییەکی ترە.

توندییەکە وردیو تاوتووکردنی تێدایە. بیر دەکاتەوە ئینجا بڕیار دەدا. زۆر بەخشندەو دڵفراوانیشە!

چەند ڕۆژێك پێچوو، (رینی) هەر بیری لە مەسەلەکە دەکردەوە. ڕۆژە ئیشی سەر زەویوباخ هەندێ جار کورتو هەندێ جار درێژە. کارێکی سەختو قورسو ناخۆشە، لە هەمان کاتدا مایەی سەرکەوتنو بەختەوەریمانە. باوکمان ئیشەکەی بۆ ئاسان کردووین. بە جۆرێ، دەتوانین بەروبوومەکەمان چەند هێندە زیاد بکەینو زۆر لە دراوسێکانمان تێبپەڕێنین. دراوسێکانمان زۆر پەسنی کاری باوکمیان دەدا بەڵام هەرگیز بیریان نەدەکردەوە ئەوانیش وەکوو باوکم بکەن. ئەوان بە شێوازی کۆنی باوكو باپیران ئیشیان دەکرد. من لە خۆیانو لە ئیشەکەیان بێزار بووم. لە (پەکین) باوكو باپیرو ڕەچەڵەك زۆر گرنگە بۆ خێزان. شانازیم دەکرد کە ڕەچەڵەکی (جیرالد)، لە دایکییەوە، بۆ هەزاران ساڵ دەچێتەوە، کەچی من نەمدەتوانی ڕەچەڵەکی خۆم بۆ دوو سەد ساڵ زیاتر ببەمەوە.

ئیشێکی زۆر باشمان دەکرد. بە درێژایی ڕۆژ ئیشمان دەکرد. تەنانەت دەرفەتی قسەکردنیشمان نەبوو. پاش خواردنی شێوی ئێوارە، یەکسەر ڕادەکشاینو خەوێکی قووڵمان لێ دەکەوت.

ئەوەتا دیسان زستان داهاتووە. کاری وەرزی کشتوکاڵمان تەواو کردووە. بەفر ڕێگاوبانی گرتووەو تا دێ بارستایی زیاتر دەبێ. دەتوانین تێر پشوو بدەینو بەکاوەخۆ، بێپەلە کردن، تێشت لە مدبەق بخۆین. (رینی) پاش چەند ڕۆژ دوورکەوتنەوەی لە خوێندن، ئەوەتا دەستی داوەتە کتێبەکەیو دەخوێنێتەوە. خوێندنەوەکەم پێ بڕیو لێمپرسی:

- (رینی)، کوڕم، بیرت لە مەسەلەی هێنانی باپیرەت کردەوە بۆ لای خۆمان.

ڕاکشابوو، هەردوو پێی دابووە دیوار. لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. کتێبی لە سەر سینگی داناو گوتی:

- بیرم لێ کردۆتەوە. پێم باشە!

گەڕایەوە سەر کتێبەکەی.

- کوڕی (جیرالد)، باش بیرت کردۆتەوەو بە کپو بێدەنگی بڕیارت داوە. ئیشێکی زۆر چاکت کردووە.

لە هیربار شووشتن بوومەوە. چوومە سەلال بۆ ئەوەی ئەو ژوورە ڕێك بخەم کە بۆ باپیرەمان دانابوو. خانووەکەمان گەورەو فەراح بوو. لە پێویستی خۆمان گەورەتر بوو. بە دڵی باوکم بوو. باوکم حەزی لە ژووری زۆر دەکرد. هەوەسی بە ژووری بچوك نەدەهات. ئەو خانووەی بۆی جێهێشتووین، جێی دەرزەنە منداڵێك دەبێتەوە. لە دارو بەرد دروستی کردووە. ڕووی لە باشوورو لەو دۆڵەیە کە لەبەر دەمیا ڕاکشاوە.

هاوینان زۆر کەس لە نیویۆرك‌و شیکاگۆ دێنە ئێرە. ئەوانە زۆر جار داوایان دەکرد خانووەکەیان پێ بفرۆشم، ئەوەندەیان پارە پێ دەدا دەمتوانی تا ماوم پێی بژیم، بەڵام من نەمدەفرۆشت.

ژوورەکانی سەرەوە گەڕام. ژووری گۆشەی باشووری ڕۆژهەڵاتم هەڵبژارد. (رینی) لەمێژبوو ژووری گۆشەی باشووری ڕۆژئاوای بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، چونکە حەزی دەکرد ڕۆژانی پشوو درەنگ لە خەو هەڵبستێ‌و تیشکی خۆری لێ نەدا. بەڵام پیرەمێرد زوو لە خەو هەڵدەستێ. ئەم ژوورە بۆ ئەو باشە. وەکوو هەر ژوورێکی نووستن

چوارگۆشەیەو چوار پەنجەرەی تێدایە. لە نەخشەی خانووەکەدا، حیسابی ئەوەی بۆ کراوە بەرگەی سەرمای زستان بگرێ. سۆبەیەکی لە بەینی دوو پەنجەرەکەی ڕۆژهەڵات تێدایە. ناو عەردی دار سنۆبەرەو دیوارەکانی بە کاغەزی قەنەفڵی داپۆشراوە. ئەو ژوورەی بۆ باپیری (رینی)م دانا، ئەوە بوو کە باسم کرد.

کاتی خۆی کە دایکم کەوتە ناو ساڵانەوە، لەم ژوورە دەنووست. کەرەستەو کەلوپەلی ناو ژوورەکە هی دایکمن. هەمووی بە شێوازی ڤیکتۆری لە دار دروستکراوە. دایکم بە دەستی خۆی ئەم پەردە سپییانەی دووریو ئاوها قایمی کردن. ئەم ژوورە بۆ پیاوێکی پیرو بەساڵاچوو پڕ بە پێستی خۆیەتی. ژوورەکە مێزێکیشی تێدایە. مێزەکە هی باوکم بوو. کە باوکم مرد. دایکم بردییە ژووری خۆی. ئێستایش لە بیرمە، دایکم لەسەر ئەم مێزە دادەنیشتو نامەکانی دەنووسی. دایکم هەموو شتێکی وەکوو خۆیو لە شوێنی خۆی جێهێشت. جێی شادیو شانازییە بۆ من ببینم یەکێکی تر جێگای بگرێتەوە.

لێرەدا دەکەومە بەردەم باری ڕاستەقینەی دەروونی خۆم. من حەزم دەکرد باوکی (جیرالد) بێ لەگەڵ ئێمە بژی بۆ ئەوەی چیم لە دڵدایە لەبارەی کوڕەکەیەوە بۆی باس بکەم. زۆر شت هەبوو نەمدەزانیو دەبوو بیزانم. وابزانم (جیرالد)م دەناسی. کاتێ لەبەردەمم بوو، بە دڵو ئەقڵو جەستە (جیرالد)ی هاوسەرمم دەناسی. ئێستا تەنیا چاوی بیرەوەریم ماوە، ئەویش ناتوانم هەموو شتێکی پێ ببینم، چونکە هەموو شتێ نازانم. زۆر پێویستە ئەو شتانە بزانم نەوەك ژیانم لە بنەڕەتەوە دەوەستێ.

× × ×

# (٧)

تا وەرزی کشتوکاڵ تەواو نەبوایە، نەماندەتوانی سەفەر بکەین. زریانو باهۆزێك هات، ئیشو کاری دوا خستین. ئینجا لە مانگی ئادار، کە ناوەڕاستی وەرزەکەیە، هەورێکی نزمی هێناو بارانێکی زۆر باری. دوای ئەوەی بەهاری درۆزنە، ئێمەو دارو درەختو دەشتیشی تەفرەدا، ترساین ئەمە لە ئیشو کار دوامان بخا. دوای ئەوە لەپڕ بایەکی توندو سارد لەلای کەنەداوە هەڵیکرد. دڵۆپە باران لەسەر لقی دەرەخت دەیبەست. بایەکی ئەوەندە قایمو بەهێز بوو، درەختی گەورەو بەرزی دەشکاند. شەو، شرقژنی شکانی دار دەتگوت تەقەی گوللەیەو لە گوللەیش قایمتر بوو.

بۆ سەبەینێ، باوبارانی لێکردەوەو دووبارە خۆر دەرکەوتەوە. منو (رینی) چووینە ناو باخ. گەڕاین بۆ ئەوەی بزانین زیانمان چەند بووە. دیمان شیلە لە لقە شکاوەکان دەچۆڕایەوەو لە ژێر گەرمای خۆردا دەتوایەوەو زەوی ژێرەوەی بە شیرناتی خۆی ئاو دەدا. زۆر جار ئەو زەرەرو زیانەمان لێدەکەوت. ئەوەتا من دیسان بەرەو ڕووی ئەو زیانە بوومەتەوە، درەختەکانیش لەگەڵ مندا بەرەو رووی زیانی لە دەستدانی ئەو گەرمایە بووتەوەوە کە بە درێژایی وەرزی هاوین لەناو

ریشاڵەکانیان پاراستبوویان. ئینجا (رینی) بە بیری هێنامەوە درەخت لەوە توندو خۆڕاگرترە کە من بۆی چوویمو چی شیلەی داکردووە هەمووی بە هەدەر نادا.

پێمگوت:

– هەر هیچ نەبێ دەتوانین چێژ لەم هەموو جوانییە وەربگرین.

وامگوتو چووینە سەر ترۆپکی چیای پشت گوندەکەمان کە بە سەر گۆڕایی بەردەم گوندا دەیڕوانی، هەمووی لە ژێر تیشکی ڕۆژدا دەبریقایەوە.

کە مانگی نیسان هات، بە (مات)م گوت لەگەڵ (رینی) بە سەفەر دەچینە (کنساس)و دەبێ بە تەنیا زەوی بکێڵێو ئەگەر پێویستی کرد دەتوانێ (جۆن ستارك) بە کرێ بگرێ بۆ ئەوەی یارمەتی بدا. پێم گوت بەر لەوەی ئەو دەغڵەی چاندوومانە شین ببێو سەر دەربێنێ دەگەڕێینەوە. ئینجا بۆ ئەوەی مێشکی بۆ کاتی هاتنەوە ئامادە بکەم، پێمگوت:

– لەوانەیە کە هاتمەوە خەزوورم لەگەڵ خۆم بێنم.

(مات) پیاوێکی کەمدوو بوو، تا پێویست نەبوایە قسەی نەدەکرد. تەماشای کردمو هەوڵی دا هەستی دڵی لە دەمو چاویدا دەرنەکەوێ.

پێمگوت:

– تۆ نایناسی. بە تەنیا دەژی. ئەگەر پێویستی بە ئێمە بێ، دەیهێنین بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێمە بژی.

پەشۆکاویی لە دەموچاودا دەرکەوت. سەرنجێکی لە چاواندا بوو، مانایەکی تایبەتی هەبوو. زانیم ئەمە هەمووی یانی چی! (مات)، (جیرالد)ی نەدەناسی. بیرەوەریمو وروژاندو گوتم:

- تۆ (جیرالد)ت دیوە؟

دەمزانی ماوەیەکی زۆرە (مات) لێرە کار دەکا. وەڵامی دامەوە:

- خەریکە لە بیری دەکەم! ئەرێ سەرو سیمای چۆن بوو!

چەکمەزەی مێزەکەمم کردەوە. وێنەی هاوسەرەکەمم دەرهێنا لە چوارچێوەیەکی زیو گیرابوو. لەوێم دانابوو بۆ ئەوەی ئێواران لە پێش خۆمی دابنێم کاتێ دوای ئیش لەگەڵ (رینی) دادەنیشین: ئەو دەیخوێندەوەو من دەرزیو درومانم دەکرد. بەم جۆرە هەر سێکمان یەکدیگر دەبووین. زاتم نەدەکرد بە ڕۆشنایی ڕۆژ سەیری وێنەی (جیرالد) بکەم. چونکە بە بیرم دەهاتەوە هەزاران میل لە یەك دوورینو گەورەترین ئۆقیانووسی ئەو زەوییەی لەسەری دەژین لە یەکمان جیا دەکاتەوە. کەچی ئێواران مەسەلەکە جیا بوو. هەستم دەکرد لێمەوە نزیکە. دەهاتە بەر چاوم لە (پەکین)، لە ماڵەوە دانیشتووە. بیر لە ئێمە دەکاتەوە. تۆ بڵێی بە ڕاستی بیر لە ئێمە بکاتەوە؟..... خۆزگە وا بێ!! لە خوای بانی سەر دەپاڕێمەوە وا بێ.

ئامارەم بۆ وێنەکە کردو گوتم:

- ئەمەیە!

بە هەردوو دەست، وێنەکەی لە دەست وەرگرتم. چاوی لە دەموچاوی قۆزی (جیرالد) بڕی.

- دیارە قۆزە!

بە دڵەڕاوکێ وایگوتو وێنەکەی دامەوەو چووە دوای ئیشی خۆی. ئێستا هەر هیچ نەبێ ئەو زانی (جیرالد) ماوەو نەمردووە. ئەم خەبەرە بە ناو خەڵکی ئەم دۆڵەدا بڵاو دەکاتەوە. هەڵبەت ئەوانیش لەمەودوا هەڵوێستیان دەگۆڕێو لێم دڕدۆنگ نابنو گەرمتر دەبن بەرامبەر بە من.

باپیرەم خەڵکی ئەم دۆڵە نەبوو. دایبابیشم بەش بە حاڵی ئەم دۆڵە سەرەتا تەنیا گەشتیاری ئێرە بوون و بەس. چاوەڕێم نەدەکرد خەڵکی ئەم گوندە بە یەك پشت، بە یەکێکم دابنێن لە خۆیان. ڕەنگە ئەوان گومان بکەن کە (رینی) هەڵەیەکە لە هەڵەکانی من.

مانگی نیسان، چووینە سەفەرەکە. چڵی درەخت هێشتا شکۆفەی نەکردبوو. یەکەمجار بە تەمابووین بە ترومبێل سەفەر بکەین. پاشان بە دوو قۆڵی لە شتەکەمان کۆڵییەوە. سەفەری بە ترومبێلمان خستە لاوە، بە چاکمان زانی بە شەمەندەفەر سەفەر بکەین چونکە خێراترەو ئەگەر لەو سەرەوە باپیری (رینی)مان لەگەڵدا بێ، بۆ پیاوێکی بە ساڵاچووی وەکوو ئەو ئیسراحەتترە!

لە دڵی خۆمدا دامنابوو لەگەڵمان بێ. پێم وا بوو، تەنیا ئەگەر خۆی نەیەوێ، ئەگەرنا هیچ شتێ نییە ڕێی لێ بگرێ لەگەڵمان بێ.

لەو ڕۆژانەی لەناو شەمەندەفەردا بووین و شەمەندەفەر دەشت و دۆڵی دەبڕی و چیامان دەدی توند تێدەپەڕی، ویستم شتێ لە بارەی وێنەی باپیرەی (رینی)یەوە بە (رینی) بدەم. بەڵام وێنەکە لە مێشکی خۆیشم ڕوون نەبوو. من بە چاوی خۆشەویسستی خۆمەوە بۆ (جیرالد) خەڵکم دەبینی. من یەکێ بووم لەو کەسانەی چارەنووس بەختەوەری کردبووم، زەماوەندم لەگەڵ یەکەم کەس کرد کە خۆشم دەویست. هەموو یادو بیرەوەریم لەگەڵ ئەودایە. جگە لەو کەسی ترم لە مێشکدا نییە. یەکەم خۆشەویستی وەکوو یەکەم بەری درەخت وایە. (جۆن بارۆن) وا دەڵێ. یەکەم بەری درەخت هەمیشە لە هەموویان باشترەو تەڕو پڕترە. تامی خۆشترەو مژارەکەی پاکترە. ئەم بەرە، پاك و ناسکەو لە هەموو بەرێکی تری دوای خۆی، باشترو بەتامترە.

ئینجا بە (ڕینی)م گوت:

- باپیرت پیاوێکی باڵابەرزو داڵگوشتە. دیمەنێکی ئورستوکراتی هەیە. لە بیرت نەچێ بە ڕەچەڵەك ڤیرجینییە. پێم سەیرە چۆن ژنێکی چینی هێناوە.

(ڕینی) هیچ وەڵامی نەدامەوە. بە ڕەفتاری ناسکی خۆیەوە، خۆی لە وەڵامدانەوەم دزییەوە. هەستم کردبوو، لەو ڕۆژانەدا، خۆی لە باسی داپیرەی چینی لادەدا. وابزانم ئەمە پەیوەندی بەو شتانەوە هەیە کە لە قوتابخانەدا، لە برادەرەکانی گوێی لێ بووە. ئەگەر وا بێ، باوکی (جیرالد) باشترین هاوکارییە بۆ من. ئینجا گوتم:

- باپیرەت قژی ڕەش ڕەشە. چاوی ڕەشە، وەکوو چاوی باوکت. بەڵام لەوانەیە ئێستا قژی وەکوو لۆکە سپی بووبێت. هیچت لە بیر نەماوە؟

- بە سووربوونو وەڵامی دامەوە:

- هیچم بە بیر نەماوە.

بەم جۆرە هیچی بە بیر نەمابوو. هەر کاتێ باسی ژیانی خۆمان دەکرد لە (پەکین)، ئەو دەیەویست ئەمریکی بێ.

- دەی باشە.... کە باپیرەتت بینی، هەموو شتێکت بە بیر دێتەوە.

وامگوتو نازانم قسەکەم ڕاست بوو، یان نا؟

شەمەندەفەر تیژ دەڕۆیشتو زەوی لوول دەدا. لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئاخۆ دەبێ ڕۆژێ بێو بە جۆرێ بەو ناوانەدا سەفەر بکەم، بتوانم لابدەمە هەموو گوندێکو بە ڕێگای بەینی ئەو شارانەدا بڕۆم کە لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەوە دەیانبینم بە خێرایی تێدەپەڕن. دەمەوێ پەیوەندیم بە خاکی وڵاتەکەم توندو پتەوتر بکەم.

دوێ شەو، لەناو شەمەندەفەر، لەناو نوێن پەردەی پەنجەرەم لاداو لەبەر تریفەی مانگەشەو تەماشای دیمەنی دەرەوەم کرد، نەمزانی لە کوێین و بە چ هەرێمێکدا دەڕۆین. من تەنیا نیشتیمانی خۆمم دەناسی، ئەویش هەموو شتێکم لەبارەوە نەدەزانی. لەوانەبوو، لە ناوچە دوورەکانی نیشتمانەکەم، کە نازانم سنووی تا کوێ دەڕوا، بە بێگانە بکەومە بەرچاو.

نەدەبوو سەرزەنشتی (جیرالد) بکەم کە نەهاتە ئێرە. نەوەکوو بترسێ وەکوو ئەوەی لێ بێ کە لە تاراوگە بێ.

دوا شەو کە لە میوانخانەی (شەنگهای)، لە سەر سینگی گریام. بە دەم هەنسکەوە پێمگوت:

– بۆچی تۆیش لەگەڵم نایەی؟ لە ژنی خۆت زیاتر چ شتێ بەم وڵاتەت دەبەستێتەوە؟

وەڵامی دایەوە:

– هیچ شت و هیچ کەس بەم وڵاتەم نابەستێتەوە، بەڵام بیر بکەوە، ئەگەر لە (چین) بڕۆم، چیم بە سەر دێ!! هەتا هەتایە بۆ من هەر وا دەبێ، لە ئەمریکا دەبم بە پیاوێکی بیانی.

بە دەم گریانەوە وەڵامم دایەوە:

– ئەدی من لەوێ نیم؟!

بە هێمنی و بە کەسەرێکی زۆرەوە گوتی:

– با تۆیش لەوێ بیت...

چی پێ گوتم هەمووم لە بیرە. هەمووی خزاوەتە ناو ژیانم و ناو بە ناو لە ڕەفتار و گفتار و ژیانمدا سەرهەڵدەداتەوە.

بەم جۆرە، بەو شەوە کپ و بیٚ دەنگە، لەم ناوچە فراوان و لەم خاکە هەراوەدا، بە شەمەندەفەر دەماندەقەڵاشت و تیژ دەڕۆیشتین. بەڵام هەستم دەکرد لە وڵاتی خۆیشم بیٚگانەم و لە بیر ناکەم (ئەو) چی پیٚگوتم.

# (٨)

ئاخیری گەیشتینە لای باپیری (جیرالد). لە ڕۆژاوای (کنساس)، لە دواوەی کۆمەڵە خانوویەکی یەك نهۆمی، لەناو کووخێکدا دەژیا. دیمان (لتل سپرینگز) شارۆچکەیەکی بچووکە، لەوەیش بچووکترە ناوێکی وای لێ بێ. ئەم شارە دەکەوێتە بانە بەرزەکانی باشووری چیاکان. هیچ زەحمەتمان بە دۆزینەوەی نەدی. کاتێ لە ئیستگە پرسیارمان کرد، هەموو کەس دەیانناسیو وەڵامەکەیان سەیر بوو. نیشانەی ناسینێکی پڕ ڕێزو ڕووەتو تێکەڵ بە گومانو دڕدۆنگی بوو:

– (ماك لوید)؟ پیرەمێردەکە؟

ئەو پیاوەی لای پەنجەرەی بلیت وەستابوو، وایگوت. قسەی دەکردو پارچە تووتنێکی لەناو دەم بوو دەیجویو دەیسووڕاند. ڕێنماییان کردین بۆ کۆتایی ڕێگایەك. پاش ڕۆیشتنی میلێك باوکی (جیرالد)مان بینی لە خانوویەکدا دەژیا. خانووەکە یەك ژوور بوو، ئەویش هەڵنەسوورابوو. هەر چەندە مانگی نیسان بوو و هەوا هێشتا سارد بوو، دەرگای خانووەکەی دانەخرابوو. دیمان لە ژوورەوە، لەسەر

مێزێك دانیشتبوو تەنیا کەوایەکی چینی لەبەر بوو. کتێبێکی چینی بە دەستەوە بوو دەیخوێندەوە.

کە چاوی بە ئێمە کەوت، لە جێی خۆی قیت بووەوەو بە زەردەخەنە لێمان وردبووەوە. دیم ڕدێنی بەرداوەتەوەو قژی درێژ بووە. سەرو ڕدێنی سپی دەتگوت بەفرە. زۆر لەڕو لاواز ببوو، چاوەکانی گەورەتر دیاربوون. پێشتر نەمدەزانی تا چ ڕادەیەك بە (جیرالد)ی کوڕی دەچێ. ڕامکردە لایەوەو باوەشم پێدا کرد.

- بابا... تو خوا بۆچی لێرە ماویتەوە؟

هەموو جارێ پێمدەگوت: (بابا). ئەمە لە وشەی (باوکە) سووكو خۆشترە. کە هاتین سەری دانەواندبوو، کە گوێی لە دەنگم بوو سەری بەرز کردەوە. کە منی بینی ناسیمییەوە. نیشانەی سەرسامی لە دەموچاوی دەرکەوت، بەڵام نەپەشۆکا. دەتگوت خۆیشی نازانێ لە کوێیە. باوەشی پێدا نەکردم بەڵام لێ گەڕا من باوەشی پێدا بکەم، خۆی نەکێشایەوەو لێم دوور نەکەوتەوە.

بە دەنگێکی کز، وەك ئەوەی لە جێگایەکی دوورەوە بێ، دەستی بە قسە کرد:

- لەناو شەمەندەفەر بووم، نەخۆش کەوتم. لێرە جێیان هێشتم. ناچار بووم لێرە بژیم. بە لامەوە گرنگ نییە لە کوێ دەژیم. هەمووم بە لاوە یەکە.

ئای منو (جیرالد) چەند خۆپەرست بووین، لە ڕۆژگاری سەختی پێش جەنگدا، لە (پەکین) لەسەر ماڵو حاڵی خۆمان دەژیاینو تەنیا بیرمان لە خۆمان دەکردەوە!! ئاوا خۆپەرست بووین. لەبەر بەختەوەریی خۆمان هیچ ئاگامان لە دونیا نەبوو. لە هەمان کاتدا

بڕوامان وابوو هەر کەسێ بۆی بکرێ سەفەر بۆ ئەمریکا بکاو بتوانێ بیگاتێ، مانای وایە بەهەشتی بۆ ڕەخساوە. دڵنیابووین مادەم (بابا) لە ناوچە ئاژاوەکانی (چین) نەماوە، سەلامەتە. جاروبار نامەی بۆ دەنووسین. لە نامەکانو لە هێمنییەکەیەوە، دەمانزانی لە ژیانی خۆی ڕازییە. پێیدەگوتین غەمی ئەومان نەبێ. دەشمانزانی هەندێ برادەری تازەی پەیدا کردووە. دوای ئەوە، لەبەر سەرقاڵیمان بە گێروگرفتی جەنگو مەترسییەکانی، بە تەواوی لە بیرمان کرد.

ئینجا (بابا) لە (رینی) وردبووەوە. نەختێ کشامەوە دواوەو بوارم بۆ ڕەخساند بە وردی تەماشای بکا. پێمگوت:

– ئەوەی خۆتە! لەوانەیە لە بیرت مابێ!

دەستی گەورەو لاوازی درێژ کردو ئاماژەی بۆ (رینی) کرد نەختێ بچێتە پێشەوە. ئەویش بە شەرمەوە چووە پێش. ئەوسا پیرەمێرد پرسیاری لێکردم، گوتی:

– ئەمە کوڕی (جیرالد)ە؟

یەکسەر وەڵامم دایەوە:

– بێ گومان....

چی بە بیر دێتەوە؟ ئەوەی بە بیریشی دێتەوە لە بیری دەکا! دواجار کە (رینی) بینی، (رینی) منداڵێکی شەش ساڵی بوو.

ئینجا باپیرە بە ورتەورت گوتی:

– بەڵێ، بەڵێ.... دە دانیشن!..... دانیشن!.....

هیچ نەبوو لەسەری دابنیشین. (رینی) لەسەر لێوی مێزەکە دانیشتو منیش لەسەر کورسییەکی بچووکی بێ پشتۆك دانیشتم. ئینجا لێمپرسی:

- بابا، ژیانت چۆنە؟

به ناڕەحەتی وەڵامی دامەوە:

- ئەوە دەژیم!! خواردنم بۆ دێنن. ژنێك دێ ماڵم بۆ پاك دەکاتەوەو جلەکانم دەشوا. پارەیش؟ چ پێویستم بە پارە نییە. خەڵکی ئێرە زۆر لەگەڵم باشن.

خۆیشی نەیدەزانی لە کوێیە؟و لە کوێ دەژی. هەر ئەوەندەی دەزانی چی پارەی هەبوو هەمووی تەواو بوو، لەناو شەمەندەفەر دایانبەزاندو یەکێ خۆی لێ کردە ساحێبو ئەم خانووەی دایێ. وا بزانم ئەمە بەشێکە لە خانووبەرەیەکی گەورە کە نیو میل لەم ڕێگایە دوورە.

چەکمەزەی مێزەکەی کردەوە. پریاسکەیەکی حەریری چینی زەردی دەرهێنا و کردییەوە. پێنج دانە یەك دۆلاری نیشان دامو گوتی:

- ئەوەندە پارەیەم هەیە.

پریاسکەکەی پێچایەوەو لە شوێنی خۆی، لەناو چەکمەزەکەی نایەوە. لەگەڵ (رینی) تەماشای یەکترمان کرد. هیچ گومانمان لە دڵدا نەما. بێ ئەوەی یەك وشەمان لە دەم بێتە دەرەوە، تێك گەیشتین‌و زانیمان هیچ قسەی لەسەر نییە دەبێ بابا لەگەڵ خۆمان ببەین‌و یەکسەر هەر ئێستایش..... دەمزانی ڕۆژێ، تەنیا یەك شەمەندەفەر دەچێتە ڕۆژهەڵاتو یەك شەمەندەفەریش دەچێتە ڕۆژئاوا. بیرم کردەوە، ئەگەر پەلە بکەین بەو شەمەندەفەرە ڕادەگەین کە دەچێتە ڕۆژهەڵات.

لێمپرسی:

- فراوینت خواردووە؟

وەڵامی دایەوە:

– وا بزانم.

– چت خوارد؟

بە شێنەیی لەسەر کورسییەکەی هەستا چووە لای سارنجێکی کۆن لە گۆشەیەکی ژوورەوەو کردییەوە. تەماشام کرد دیتم نیو شووشە شیرو پارچە کەرەیەك و سێ هێلکەو کولیچەیەکی بچووکی بە گۆشتی تێدا بوو، پارچەیەکی سێ گۆشەی لێ کرابووەوە.

دانیشتینەوە (رینی) لەبەر دەرگا وەستا. سەیری دەشتی بەرزی بەرامبەری دەکرد. گوتی:

– با بڕۆین.

ئاوڕم لە بابا دایەوەو پێمگوت:

– نایەی بچین لەگەڵ ئێمە بژێ؟

یەکەم جار چۆن دیمان ئاوها لەسەر مێز دانیشتبوو، بە وردی کتێبە چینییەکەی داخستو لێی پرسیم:

– بە ڕاستی وات پێ خۆشە؟!

وەڵامم دایەوە:

– لە هەموو شتێکم پێ خۆشترە.

لە پڕ لێیپرسیم:

– ئەی کوا (جیرالد)؟

– هێشتا لە (چین)ە، لە (پەکین)ە!

– دێتەوە؟

– چاوم لە ڕێیە بێتەوە.

ئەوسا گوێم لە (رینی) بوو، گوتی:

– یەکێ وا بۆ ئێرە دێ!

پیاوێك بوو دەهات. بە هەشتاوی بۆ لامان دەهات. کە گەیشتە بەر دەرگا، دیمان پیاوێکە تەمەنی گەنجێتی بواردووە. کامڵە، کەڵەگەت و چوار شانەیە، قژی زەردەو ڕەنگی پێستەیشی وەکوو ڕەنگی قژی وایە. دەموچاوی لەبەر بای ڕۆژاوا ئەسمەر بووە. کابرا بە دەنگێکی پتەو دەستی بە قسە کرد:

– هاتم بزانم، لێرە چ هەیە. من چاوەدێری و سەرپەرشتی ئەم پیرەمێردەی دراوسێم دەکەم.

لێمپرسی:

– ئەم کووخە موڵکی تۆیە؟

وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ، لە سەر زەوی منە. باوکم مەڕی بە خێو دەکرد. ئەم کووخەی بۆ شوانی مەڕەکان کردبوو.

پێمگوت:

– سوپاست دەکەم. چاکت کردووە ئەم داڵدەیەت بە خەزوورم داوە.

– نازانم چ بڵێم؟ ئەو خەڵکە چۆن لێ دەگەڕێن پیرەمێردێ لەم تەمەنە بە تەنیا بگەڕێن؟

ئاوها بە توندی وەڵامی سوپاسەکەی منی دایەوە.

– هیچ خەبەرمان لێ نەبوو....

ئاوها وەڵامم دایەوەو بێدەنگ بووم. دڵنیابووم ناتوانم بۆ ئەو پیاوە قسە لە ڕووە باس بکەم چۆن ئەو پیرەمێردە توانیویەتی سەفەر بکا بۆ وڵاتێکی نائاشناو لەوێ دامەزراوە؟ دڵنیابووم ناتوانم (چین)، یان

(پەکین)ی پێ بناسێنم. ئەگەر هەوڵی شتی وا بدەم وەکوو ئەوە وایە باسی هەسارەیەکی دووری بۆ بکەم. ئیتر پێمگوت:

– تازە، کە دۆزیمانەوە، لەگەڵ خۆمان دەیبەینەوە.

لەپڕ بە بیرم هاتەوە پێویستە خۆمانی پێ بناسێنم، گوتم:

– من ژنی (جیرالد ماك لیود)م. ئەمەیش (رینی) کوڕمە.

وەڵامی دامەوە:

– منیش (سام بلین)م.

لە (رینی) وردبووەوە. ڕەنگە وای بە خەیاڵدا هاتبێ دیمەنی (رینی) لەوە ناکا کوڕی من بێ. بۆی هەیە ئەمە وای لێکردبێ بیر بکاتەوە ئەنجا لێمان بپرسێ کێین. پرسی:

– ئێوە خەڵکی کوێن؟

وەڵامم دایەوە:

– ماڵمان لە (ڤیرمۆنت)ە.

– ئەدی مێردەکەت لە کوێیە؟

لە وەڵامدانەوەی دوو دڵ بووم. پێم وابوو بۆ من وا ئاسانترە وەڵامی بدەمەوە بڵێم (جیرالد) مردووە، نەك پێی بڵێم لە کوێیە؟و لەوێ چ دەکا؟ خۆ ئەگەر بڵێم (جیرالد) وای پێ باشە لە چینی کۆمۆنیزمدا بمێنێتەوە، یەکسەر گومان لە هەموومان دەکا. جا وەڵامم دایەوە:

– لە دەرەوەیە.

(سام بلین) پاڵی بە دەرگاوە داو لێمان ورد بووەوە. ئینجا دەمی قسەی کردە (بابا)و گوتی:

– پیرەمێردی دۆستو هاوڕێ، ئەم خانمو کوڕە دەناسی؟

بابا بە شێنەیی سەری لەقاندو گوتی:

- ئەم ژنە، خێزانی کوڕەکەمەو ئەم منداڵەیش کوڕی (جیرالد)ی کوڕمە.
- دەتەوێ لەگەڵیان بچی؟
- بێ شك، دەمەوێ لەگەڵیان بچم.
- ئەگەر لێرە دەمێنیتەوە، من خزمەتت دەکەم.
- نەخێر، لەگەڵیان دەچم.

ئەمە هەموو وەڵامی (بابا) بوو.

- باشە.

کابرای باڵابەرزی ئەمریکی هێشتا هەر دڕدۆنگ بوو.

- مادەم وات دەوێ، کەیفی خۆتە.

ویستم کۆتایی بە مەسەلەکە بێنم، گوتم:

- وا بزانم ئەگەر پەلە بکەین، بە شەمەندەفەری دوای نیوەڕۆ ڕادەگەین.

کابرا گوتی:

- مادەم وایە دەچم ترومبێلەکەم دێنم. شتی ئەوەندە زۆری نییە، پێچانەوەی شتەکانی زۆری ناوێ.
- ئەی ئێوە کوا کەل‌و پەلەکانتان.

(رینی) وەڵامی دایەوە:

- لە ئیستگە جێمان هێشتووە.
- پازدە دەقیقەم پێ دەچێ‌و دێمەوە.

(سام بلین) وایگوت‌و خێرا ڕۆیشت.

هەستم کرد (رینی) غەمبارەو داڵغەی ڕۆیشتووە. لە باپیری وردبووەوە، دەیەویست دەرگای دڵی خۆی بۆ بکاتەوە.

لێمپرسی:

- مێشکت بە چییەوە خەریکە!

لە وەڵامدا پرسیاری لێکردم:

- بەم کەوا چینییە بیبەینە ناو شەمەندەفەر؟

باپیری تەماشای کەوای خۆی کردو گوتی:

- کەوایەکی جوانە. لە (پەکین) کڕیومە. حەریرەکە وەکوو خۆیەتی هیچ نەگۆڕاوە. نەرمو گەرمە.

- دایکە!

(رینی) بەم هاوارە هانای بەبەر من هێنا.

بۆ ئەوەی چارەیەکی هەڵوێستەکە بکەم، گوتم:

- (بابا)، کەواکەش دەبەین، بەڵام وا چاکە پاڵتۆکەت لەبەر بکەی. ئەمریکی لە شتی وا ڕانەهاتوون.

وامگوت بۆ ئەوەی چارەیەکی هەڵوێستەکە بکەم. پیرەمێرد هیچ نارەزایی دەرنەبڕی. پەردەیەك دادرابووەوە وەکوو دۆلابی جلوبەرگی لێ هاتبوو، (رینی) لە پشت ئەو پەردەیە گەڕا، قاتێکی بۆری دەرهێنا باپیری کاتێ لە (پەکین) ڕۆیشت، لەبەری بوو، لەگەڵ ئەو پاڵتۆ ڕەشەی (جیرالد) بۆ باوکی لە (ترزی) ئینگلیزیو لە گەڕەکی کۆنی سەفارەتەکان کڕیبووی: هەردووکیان کەم لەبەرکرابوون. مانای وایە (بابا) تەنیا کەوای چینی لەبەرکردووە. (بابا) زۆر بە وردی کەواکەی لەناو جانتای جلەکانی دانا. ئینجا لێگەڕا (رینی) قاتە بۆرەکەی لەبەر بکاو یارمەتیمان دا پاڵتۆکەی بکاتە بەر. کڵاوێکی ڕەشیشمان بۆ دۆزییەوەو لە سەرمان نا. کە جلی کردە بەرو لە بەینی ئێمە وەستا، زۆر جوان بوو، هێمنو لەسەرەخۆ، ئێمەیش زیاتر پێمان هەڵگوت. بابا پیاوێك بوو بە هیچ تێك نەدەچوو. نەرمو گوێڕایەڵ بوو. ئەوە چی بەسەر هاتووە؟ ئایا شێت بووە؟ نەمتوانی وەڵام بدەمەوە. دڵنیا نەبووم

هیچ لەبارەی خۆیەوە بزانێ. زۆر بە سادەیی خۆی شل کردبوو، چمان دەوێ وای لەگەڵ بکەین.

لە دەنگە دەنگو لە هەستانی تۆزو خۆڵی دەرەوە، زانیمان (سام بلین)ەو هاتۆتەوە. من لە پێچانی جانتاکان بوومەوە. (رینی) باپیرەی بۆ لای ترومبێلەکە برد. کە (سام بلین) چاوی پێکەوتن، بە لاقی درێژی خۆی لە ترومبێلەکە فڕێ دایە خوارێو دوای نیو خولەك هەموومان لەناو ترومبێلەکە بووین. ترومبێلەکە بە ڕێ کەوتو تۆزی لە دوو هەستا. ترومبێلەکە لە ڕادەبەدەر گەورە بوو. دیمەنێکی ناشیرینی هەبوو. هەموو شوێنێکی ناشیرین بوو، ڕەنگی سوور بوو. تەنیا ئەوە بوو بۆ نەفەران زۆر فەراح بوو. وەکو نوێن وابوو.

من لە پێشەوە دانیشتم (رینی)و بابا لەسەر کورسی پشتەوە دانیشتن.

گوتم:

– قەت ترومبێلی وام نەدیوە.

(سام بلین) وەلامی دامەوە گوتی:

– بە پێی داوای خۆم دروستکراوە.

پێی لە بەنزین ناو منیش بێدەنگ بووم. من لەو جۆرە خێراییە ڕانەهاتبووم. ڕەنگە هۆی ئەوە بێ چەند ساڵ بوو تەنیا سواری عارەبانەی دەست، یان گالیسکەی ئێستر دەبووم. بۆیە لە خێرایی کەم ڕاهاتبووم. بە وەختەوە گەیشتینە ئیستگە. کاتمان بە دەستەوە مابوو بۆ سواربوونی شەمەندەفەر. (رینی)و (سام) بن هەنگڵی بابایان گرت بۆ ئەوەی لە پلیکانەی ئیستگەکە سەرکەوێ. ئەوسا (سام بلین) بۆ ماڵاوایی دەستی گوشیم. بازووی ڕاتەکاندمو گوتی:

- خوداحافیز خانمەکەم. حەز دەکەم جاروبار نامەم بۆ بنووسی بۆ ئەوەی ئاگاداری پیرەمێرد بم.

بەڵێنم پێدا داواکەی بێنمە دیو ئارەزووی جێبەجێ بکەم.

شەمەندەفەر بە ڕێ کەوت. کومیسەرەکە دەستی گرتم‌و دەرگای فارگۆنەکەی پێوەدا. لە ژووری تایبەتی خۆمان دانیشتین. دوای کەمێ هەستم کرد دەستم دێشێ. ئەو دەستەی (سام بلین) بە توندی گوشیو ڕایتەکاند.

× × ×

# (٩)

(مات) باخچەی ئامادە کربووو زەوییەکەی کێڵابوو. ئەمساڵ بۆ تاقی کردنەوە گاگۆزو دانەوێڵەی لەم بابەتەم چاند. پێم وایە دانەوێڵەو ڕووەکی تر زۆر باش لەگەڵ وەرزی کورتی کشتوکاڵی ئەم چیایانە دەگونجێ. سەد ساڵە خەڵك زەوی لەناو چەقە بەردان دەردێننن و دانەوێڵەی لێ دەچێنن. بەڵام ئەو زەوییانە وەکوو خۆیان لێ دێتەوە، ڕەق و بەردەڵان و بێ ڕووەك. وەکوو لە ڕاپۆرتەکاندا هاتووە گوایە (هەژدە هەزار) کەس لەم ناوچەیە لە بناری چیای (ستراتۆن) کۆبوونەتەوەو گوێیان داوەتە گوتاری (دانییل وێبستەر). باوەڕ ناکەم ئەو زەمانەی، ئەگەر (دانییل وێبستەر)یش لە گۆڕەکەی بێتە دەرەوە، (هەژدە سەد) کەس کۆببێتەوە... خەڵکەکە لەم ناوچەیە ڕۆیشتن و دوای ئەوان کوڕەکان و کوڕی کوڕەکانیشیان ڕۆیشتن، چوون بۆ ئەوەی لە شوێنێکی تری بێگانەو دوور لە نیشتیمانی خۆیان، ژیانێکی تر بژین. زۆر دوور ڕۆیشتن بۆ ئەوەی نیشتمانی تر بدۆزنەوەو تێیدا ئاکنجی بن. دەق وەکوو من کە بەم دواییە، گەڕامەوە نیشتمانی خۆم و کردمەوە بە داڵدەو ماڵم لێ دانا.

بۆم یەك لابۆتەوە تازە قەت جارێکی تر ناگەڕێمەوە ماڵەکەی (پەکین)م. دەبێ وا دابنێم هەر نییە! هەر چەندە هەمیشە لەبەر چاومە، وەك ئەوەی سەد ساڵ بێ لەبەردەمم بێ. دیواری حەوشەی دەبینم، دەرگای حەوشەی دەبینم تەختە بەرمیلێکی ڕەقی لە دارەکەی دراوە. خۆشەویستەکەمم لەبەر چاوە بەم دەرگایەدا هاتوچۆ دەکا. شوێنی خۆم لە ماڵەکە دەبینم بۆ هەتاهەتایە چۆڵ بووە. هیچ نەماوە بەوێم ببەستێتەوە. گەڕاومەتەوە خاکی باوکو باپیرانی خۆم.

لە دڵی خۆمدا گوتم ئایا پێویست دەکا نامەکەی (جیرالد) بۆ باوکی بخوێنمەوە؟ بۆ ئەوەی بە هۆی نامەکەوە پەیوەندی منو (جیرالد) بزانێ؟ هەر زوو ئەم بیرەم خستە لاوە. بیری ئاشکرا کردنی نهێنی خۆم بۆ یەکێکی تر. هەر هیچ نەبێ ئەمڕۆ نابێ شتی وا بکەم. ئەمڕۆ یادی ڕۆژی زەماوەندمانە. ئەمڕۆ پازدەی ئایارە. ئەو ڕۆژەیە کە مارەییمان بڕی. حەزم کرد ئەمڕۆ لەسەر زەوی ببەمە سەر. تۆوی داوێڵەو ڕووەکەکەم لە شوێنی خۆی وەشاندو کارەکانی ترم بۆ (مات) جێهێشت: وەکوو دۆشینی مانگاکانو شتی تر. من بێ وەستان ئیشم دەکردو بیرەوەریش بێوەستان لە مێشکدا دەهاتو دەچوو.

بیست ساڵ پێش ئێستاو لە ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆدا، لەم هۆڵە گەورەیەدا زەماوەندم لەگەڵ (جیرالد) کرد. تەنیا دایکمو برای براژنی ئامادەبوون. نازانم خاڵمو ژنەکەی چییان بەسەر هات. چونکە من هەر لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ جیرالد سەفەرم کرد بۆ (چین)، کەوتمە ناو دەریاو تەوژمی ژیان. هەستم دەکرد وەکوو هەموو خەڵکەکە لە نیشتیمانی خۆمدام، بەڵام بۆچی شتەکە وای لێهات، نازانم؟ خەڵك هەبوو بە سەردان دەهاتنە پەکین، ئیتر لەوێ نیشتەجێ دەبوونو لەوێ دەژیان.

(جیرالد)، لەو ڕۆژگارەدا هەموو شتێکی بۆ باس دەکردم بەڵام من هیچ لە قسەکانی نەدەگەیشتم. بۆی باس دەکردم کە بە شەقامەکانی (پەکین)دا، دەڕۆین، خەڵك چیمان دەرهەق دەڵێن. لەبەر ئەوەی لە قسەکانییەوە نەمدەدی ئەمەی بەلاوە شتێکی سەیر بێ، منیش بە لامەوە سەیر نەبوو.

ئینجا لە دڵی خۆمدا دەمگوت هەموو شتێ گۆڕاوە. تەنانەت ئەم شارە جاویدانەیش هەمووی گۆڕاوە. ئەم شارە لە خەوی دوورو درێژی بە خەبەر هاتووەو کەوتۆتە جموجولو چالاکیو خەڵکەکەی کەوتوونەتە جۆشو خرۆش.

لە دڵی خۆمدا دەگوت: هەر چەندە زۆر خۆشیان دەوێم، لەوانەیە نەیانەوێ لە گەڵیاندا بم. نەمدەتوانی بڕوا بە خۆم بێنم (سومیێر)ی دراوسێو دەستە خوشکم لە ناخی دڵەوە خۆشی ناوێم. نەمدەتوانی یادی نەکەمەوە کاتی بە یەکەوە منداڵەکانمان پەروەردە دەکرد. قسەو پێکەنینی خۆمانم لە بیر نەدەچوو. کە باسمان دەکرد لە بازاڕ چیمان دەکردو هێلکەو ماسیمان بە چەند دەکڕی. نا... نا.... ناتوانم شتی وا بڕوا بکەم. ناتوانم بڕوا بکەم خانمی (لی) خۆشی ناوێم کە ڕایدەکێشامو لە تەنیشت خۆی دادەنامو دەستی دەگرتمو بە نەرمی دەستی پێدا دەهێنا. ئەمانەو هی تریش دەستە خوشکم بوون. من ئێستایش خۆشم دەوێنو هیچ گومانم نییە ئەوانیش منیان خۆش دەوێ، یان دەڵێن خۆشمان دەوێی. وەکوو (جیرالد) کە لە نامەکەیدا نووسیویەتی: (خۆشم دەوێی. هەمیشە خۆشم دەوێی.... بەڵام.....

- ئاخ، لەم (بەڵام)ە!! خۆشەویستی دڵسۆزانە چۆن (بەڵام)ی تێدا دەبێ؟! قەت وەڵامی ئەم پرسیارەم دەست ناکەوێ، بە تایبەتی دوای ئەوەی هەموو هۆیەکی قسەکردنی نێوانمان پچڕا.

کە هاتمەوە، شیوی ئێوارە لێ بنێم، دیم بابا لە شانشینی سەر مدبەق دانیشتووە، خۆی داوەتە بەر زەردەپەڕی ئێوارە. بابا ڕەوشتی وابوو هەموو ڕۆژێ کەوا چینییەکەی دادەکەند ئینجا دادەنیشت کتێبی دخوێنێتەوە. چەند کتێبێکی چینی کەمی هەبوو، دەیخوێندنەوە. کەم قسەی بۆ دەکردین.

ئەم پیرەمێردە بیر لەچی دەکاتەوە؟ نازانم. دختۆر (بروس سبولدن)ی دختۆری گەڕەك دەیگوت کاتێ (بابا) بە تەنیا لە کووخەکەی (لتل سپرینگز) ژیاوە، بێشك تووشی تاسانێك هاتووە.

ئاخۆ دەبێ شتی وا ڕووی دابێ و کەس نەیزانیبێ!

(بروس سبولدن) پیاوێکی باش و دختۆرێکی نایابە. پیاوێکی باڵابەرزە، دەموچاوێکی هێمنی هەیە هەر لەخۆی دێ. مرۆڤ متمانەی پێدەکا. کەسێتییەکی بەهێزی هەیە. لەوە زیاتر چی؟! بە ڕاستی، دەرفەتم نەبوو لەوە زیاتری لە بارەوە بزانم، چونکە نە خۆم و نە کوڕەکەم نەخۆش نەکەوتبووین و پێویستمان پێ نەبوو.

دختۆر بە سەنگینی وەڵامی دامەوە گوتی:

- شتی وا بە ڕاستی ڕوو دەداو هیچیش ناکرێ. ئەوەندە هەیە تۆ دەبێ بەردەوام چاوت لێی بێ.

دختۆر پەلەی نەبوو، بەڵام حەزی نەدەکرد بچێتە ناو گفتوگۆی درێژدادڕەوە. من داوام کردبوو بێ تەماشای پیرەمێرد بکا چونکە نەمدەزانی حاڵی چۆنە، بە تایبەتی دوای ئەوەی هێنامە لای خۆم، ئیتر

ئەو پیاوە نەمابوو کە وەکوو باوکی (جیرالد) دەمناسی. پیاوێکی ئەقڵ گرانو خاوەن ڕۆشنبیرییەکی گەورەو زیرەك!! کاتێ لە (پەکین) بوو ئەقڵی پیاوێکی زانای ڕۆشنفکری هەبوو. من هەم لێی دەترسامو هەم پێی موعجەب بووم. کە لەگەڵ (جیرالد) بە یەکەوە دەژیاین. هەستم دەکرد هەموو شتێ دەزانێ. گوێم دەدایە قسەی. گوێم لە لافاوێك زانیاری فراوانو ئاگاداری فرەی سروشتی دەبوو. بێبوغراییو زێدەڕۆیی قسەی دەکرد. چین بەهرەی پێگەیاند بوو و مشتو ماڵی دا بووو گەیاندبوویە ئەم پایە بەرزە، هەر کەسێکی خۆی بە باوەشی (چین) دا بدا، چین دەیگریتە خۆیو پێیدەگەیەنێ.

شەوێ لەو شەوانەی ماڵمان لە (پەکین) بوو، بە (جیرالد)م گوت:

- (جیرالد)، چۆن دەتوانم خۆم لای باوکت خۆشەویست بکەم.

- ئازیز گیان، خۆت بە شتی واوە ماندوو مەکە. ئەو تۆی خۆش دەوێ چونکە، یەکەم: هەموو کەسێکی بە شێوازی تایبەتی خۆی خۆش دەوێ. دووەم: هەوەسی بە تۆ دێ چونکە لە دیمەنو ڕەفتار وەکوو ئەو سادەی. ئیتر هەر یەکەتان ئەوەی دی وەکوو خۆی قبووڵ دەکا.

(بابا)، لە سروشتی پاكو بێگەردو لە شێوازی مامەڵەکردنی، وەکوو خۆی بوو. باشترین نموونە بوو کە (رینی)، بێئەوەی تێبینی لەسەر هەبێ، پەیڕەوی بکا. (بابا)، بێئەوەی یەك قسە بکا نەوەی خۆی بەو شێوە نموونەییە دەدی کە ڕۆژی یەکەم چووە قوتابخانەی ئەمریکی. تا من دانەنیشتبام، (بابا) لەسەر مێزی خواردن دانەدەنیشت. کە دەیەویست بچێ نەختێ بە ناو زەویو زاردا بگەڕێ، هەمیشە سوور بوو ئاگادارم بکاتەوە، کە دەگەڕایەوەش سوور بوو پێم بڵێ گەڕاومەتەوە.

مەراقی بوو بە کاوەخۆ لە ژێر سێبەری دەرەختەکانی ناو باخدا بسووڕێتەوە کە چلێیان شۆڕ ببووەوە، دەتگوت داهاتوونەتەوە بۆ ئەوەی بیلاوێننەوەو میهرەبانیی بۆ بنوێنن.

زۆر جار باپیر هەر شتێکی جوانی دەدی بۆی باس دەکردم. ئەمە دەبوو بە بابەتی گفتوگۆمان. بە درێژایی ڕۆژ بە تەنیا دادەنیشتین. (رینی)، لەبەرئەوەی خەریکی یاری (بێس بۆڵ) بوو، درەنگ لە قوتابخانە دەهاتەوە. (بابا) لەگەڵ من لە مدبەق دادەنیشتو قسەی لەگەڵ دەکردم، بەڵام قسەی وەکوو کاتی خۆی نەبوو. وەنەبێ قسەی مندالآنە بێ، نا. مەبەستم ئەوە نییە، بەڵام گۆڕا بوو. وردیی جارانی نەمابوو. ئەقڵی داکەوتبوو. مەشرەب خۆش بوو. گلەیی لە هیچ شتێ نەدەکرد. هەستت نەدەکرد تاسەی هیچ شتێکی کۆن بکا. لە دانیشتنییەوە دیار بوو ژیانی ڕابردووەو ڕۆیشتووەو بەسەرچووەو خۆیشی بە ژیانی ئێستای ڕازییە. هەستم دەکرد نازانێ لە کوێ دەژی. هەندێ جار لە بیری نەدەما من چی ئەوم. جاروبار بە کپ‌و بێدەنگی سەرنجی وردی لە (رینی) دەدا. لەوانەبوو لە دڵی خۆیدا بڵێ: تۆ بڵێی ئەمە (جیرالد) بێ؟! یان کوڕی (جیرالد)ە؟ لەوانەبوو لەوەیش دوورتر بڕوا و لە دڵی خۆیدا بپرسێ ئاخۆ ئەم کوڕە دەناسێ؟ ئاخۆ دەزانێ کێیە؟

نەخێر، زۆر ناخۆشە لە نامەکەی (پەکین)، نامەی (جیرالد)، ئاگاداری بکەمەوە..... وا بزانم بۆم ناکرێ ناوەرۆکەکەی تێبگەیەنم‌و بۆی باس بکەم نامەکە چی تێدایە.

ئێوارێ، کاتێ لە شێو خواردن بووینەوە، ڕێگای (رینی)مان دا لەگەڵ برادەرەکانی بچێتە سینەما. شەممە بوو. ئەگەر ڕاپۆرتی باشم

لەبارەی (رینی)یەوە بۆ هاتبا، ڕۆژانی شەممە ڕێم دەدا بچێتە سینەما. ئەم حەفتەیەش وا بوو، ڕاپۆرتی باشی لەسەر هاتبوو.

منو (بابا) لەبەر چرا دانیشتین. ئەو لەسەر کورسی گەورەی خۆی دانیشتو من لە تەك مێزەکە خەریکی داودرومان بووم. بلووزێکی خوری سوورم بۆ (رینی) دەچنی. وەکوو ڕەوشتی هەمیشەیی خۆم، (جیرالد)یشمان بە خەیاڵ لەگەڵدابوو. ئەوەتا یادی ڕۆژی زەماوەندمان هاتووەو (ئەو) هیچ نامەی بۆ نەناردووم. لەوەتی لە یەك دوور کەوتووینەتەوە قەت شتی وا نەبووە. هەموو جارێ هەوڵی دەدا، بە هەر ڕێگەیەك بێ، نامەیەکم لە (هۆنگ کۆنگ) بۆ بنێرێو هەوڵی دەدا لە شەوی ئەو یادەدا بە دەستم بگاو بە مەوە خۆشەویستی خۆیم بۆ تازە بکاتەوە. هەموو نامەکانم لەناو سندووقی نامەدا پاراستووەو لە هەموو بۆنەیەکدا دەریان دێنمو دەیانخوێنمەوە. بڕوام زۆر قایمە لێك دوورکەوتنەوەمان زۆر ناخایەنێ. نازانم ئەمشەو زات دەکەم وەکوو هەموو جارێ نامەکان بخوێنمەوە؟ یان نا؟

(بابا) نەیکردبووە عادەت دەست پێشخەر بێ لە قسەکردندا. تەنیا کە من سەری قسەم دەکردەوە، ئەوسا قسەی دەکرد. بە کپو ئارامی دادەنیشتو بە دوو چاوی بە سەبرو هەدار تەماشای دەکردم. ئەمشەو بەرگەی ئەو تەماشاکردنەیم نەگرت، بۆیە دەستم بە قسەکردو گوتم:

- (بابا)، پێم بڵێ لە بیرتە کەی دایکی (جیرالد)ت هێنا؟

هیچ سەری لە پرسیارەکەم سوڕ نەما. دەتگوت کاتێ ئەم پرسیارەم لێکرد، ئەویش مێشکی بە مەوە خەریك بوو. وەڵامی دامەوە:

- زۆر چاکم لە بیرە. ناوی (ئای - لان) بوو. نازناوی (هان) بوو. باشترین ژنو باشترین هاوسەر بوو.

- چۆن زەماوەندت لەگەڵ کرد؟ لە چ هەل‌و مەرجێکدا؟

بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەم بداتەوە، ماوەیەکی زۆر لە فکرڕا چوو. چاوی پووت‌و ئاڵۆزکاوو بە داڵغە بوو، گوتی:

- وام لە بیر نەماوە. ئەوسا ڕاوێژکارێکی ئیمپراتۆری بچکۆڵە بووم. (هان یو - لان)ی هاوڕێم پێشنیاری بۆ کردم زەماوەندی لەگەڵ بکەم. وایدەزانی بە دەست تەنیاییەوە دەتلێمەوە. خوشکێکی لە خۆی بچووکتری هەبوو. ناوی (ئای - لان) بوو.

- ئایا بە ڕاستی بە دەست تەنیاییەوە دەتلایتەوە؟

نەختێ بیری کردەوە ئینجا وەڵامی دامەوە:

- وابزانم وا بوو ئەگەرنا ژنم نەدەهێنا.

- پێشتریش خۆشەویستیت کردبوو؟

بەر لەوەی وەڵامم بداتەوە، دووبارە دوو دڵیی دایگرت. لەسەر کورسی باوکم دانیشتبوو. هەردوو ئانیشکی خستبووە سەر ئەژنۆکانی‌و چاوەکانی بە شڵەژاوی دەبریسکانەوە، تیشکی چرا لە کەوای سووری چینی دەدا. بریسکەی قژی سپی، نیشانەی پیریی دەگەیاند. لێی وردبوومەوە. دەتگوت وێنەیەکی هونەرمەندانەیە! چاوی دەگێڕا، دەیەویست ڕابردوو بە بیر خۆی بێنێتەوە. پێمگوت:

- گوێ مەدەرێ، ڕابردوو زۆر لێمان دوور کەوتۆتەوە.

- وا مەزانە حەز دەکەم وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە. هەر ئەوەندەیە دەمەوێ بە بیر خۆمی بێنمەوە. وا بزانم ڕاستە، خۆشەویستیم کردووە. لە ناخی دڵەوە هەست دەکەم تامی خۆشەویستیم چەشتووە. بەڵام لەگەڵ (ئای - لان) نا. خۆشەویستیم لەگەڵ یەکێکی تر کردووە. ئەوەیە دەمەوێ شتێکم لێ بیر بکەوێتەوە.

- ئەویش چینی بوو؟

ئەم پرسیارەم لێکرد، دەشمزانی چینی نەبوو.

- نا، چینی نەبوو!

- ئەی چی بوو؟

- هیچم بە بیر نەماوە.

- ناوەکەیشی؟

- ناوەکەیشم بە بیر نەماوە.

خوایە، ئەوە چ قسەیەکە دەیبیستم!! ئایا، قەت شتی وا دەبێ؟! دەشێ خۆشەویستی بکەین و پاشان یادی ئەو خۆشەویستییەمان لە بیر بچێتەوە؟! ئایا لە بیرکردنی خۆشەویستی دەگاتە ئەو رادەیەی ناوی ئەو کەسەیشمان لە بیر بچێتەوە کە خۆشمان ویستووە؟ ئایا دەبێ ئێمەیش وامان بە سەر بێ؟ ئایا دەشێ پاش سالآنێکی زۆر، (جیرالد) لە (پەکین)، ناوی منی لە بیر بچێتەوە؟!

دیم (بابا) هەوڵ دەدا لاپەڕەکانی ڕابردوو لە مێشکی خۆی هەڵبداتەوە. دووبارە دەستی بە قسە کردەوە:

- وا بزانم بۆیە هەستم بە تەنیایی دەکرد، ئەوەی ناوەکەیم لە بیر نەماوە، خۆشەویستی لەگەڵ نەکردم. بەڵێ ئێستایش لە بیرمە کچێکم خۆش دەویست بەڵام ئەو منی خۆش نەدەویست. لەوانەیە داوایشم کردبێ شووم پێ بکا، ئێستا لە بیرم نەماوە، بەڵام دەزانم کاتێ (بون - لان) مەسەلەی خوشکی خۆی لەگەڵ باس کردم، هەستم بە بۆشاییەکی دەروونی دەکرد. وام بە چاك زانی ئەو خانمە چینییە بێنم بۆ ئەوەی لە ژیانی خۆم و کاروبارم لەگەڵ چینییەکان یارمەتیم بدا.

لە دورمان کردن وەستام چونکە تووشی سەرسامی کردم کە ناوی خۆشەویستەکەی لە بیر نەمابوو. دەستم بە دورمان کردەوەو پێمگوت:

- شتێکی سەیرە خانمێکی چینی بێ مێرد بمێنێتەوە.

ئەم جارە بێدوودڵی وەڵامی دامەوە:

- بە دەزگیران کرابوو. دەزگیرانەکەی مردبوو. وا بزانم بە کولێرا مردبوو. کە مرد کچەکە تەمەنی پازدە ساڵ بوو، (یو - رەن)ی برای پێی گوتم. ئەوەم لا مسۆگەرە. تەمەنی بیستو پێنج ساڵ بوو کە من هێنام. من ئەوسا تەمەنم سی (۳۰) ساڵ بوو.

- بە ڕاستی جێی سەرسوڕمانە، ژنێکی وا شوو بە پیاوێکی بێگانە بکا. وا نییە؟ ئەو دەرفەتەم قۆزتەوە کە توانیم دەرگای مێشکی بکەمەوەو بچمە ناو بیرەوەرییەکانی بۆ ئەوەی ئارەزووی دڵم بێنمە دیو زۆر شت لە بارەی دایکی (جیرالد)ەوە بزانم.

کاتی خۆی قەت گوێم لێ نەببوو (جیرالد) باسی دایکی بکا. تەنانەت لە ڕۆژانی هەوەڵی زەماوەندیشماندا. قەت ڕێکیش نەکەوت لە (پەکین)، وێنەیەکی لە ماڵە گەورەکەمان ببینم. (جیرالد) تاقەتی باس کردنی نەبوو. خۆشی دەویست بەڵام خۆشەویستییەکەی تێکەڵ بە جۆرە ئازارێك بوو. بەڵام ئایا بۆچی خۆشەویستییەکەی تێکەڵ بە ئازار بوو؟ نەمدەزانی!

ئەو شەوە لە (ڤیرمۆنت) شەوێکی کشومات بوو. یەکێ بوو لەو شەوە خۆشانەی هەر چەندە بێ تریفەی مانگیشن، بە نەرمو هێمنی دێنو تێدەپەڕن. شەوی ئایار لە دۆڵەکەماندا، هەوای، هەندێ جار ساردو برێ جار فێنکە. ئەو شەوە، شەوێکی فێنکی ئایار بوو. پەنجەرەم داخستبوو، لەبەر ئەوەنا هەوای ساردبوو، بەڵکو بۆ ئەوەم

بوو پەروانە نەیەنە ژوورەوە خۆیان بە تیشکی چرا دابدەن. بە کپ و بێدەنگیی دانیشتبووین. ژیان لە دەورووبەرمان ڕاوەستابوو. هەستم دەکرد لەگەڵ (بابا) هیچ پەردەمان لە نێواندا نییە. لەوانەیە ئەویش ئەو حەلە هەستی وا بووبێ، ئەگەرنا بەو جۆرە قسەی بۆ نەدەکردم. قسەکانی لە دڵێکی کراوەوە دەهاتە دەرێ. وشەکانی زۆر بە ساکاری، هەندێ جار بە ئینگلیزیو هەندێ جار بە چینی، دەردەبڕی، دەتگوت دڵی منداڵێکەو وشەکانی هەڵدەداتە سەر زمانی. ئای شتێکی چەند سەیرو لە هەمان کاتدا چەند جوان بوو لەم ژوورەدا گوێت لە ژیانی کۆنی (پەکین)بێ سیحری لێ دەتکێ!! ئاخوا ئەگەر دایکم گوێی لێ بوایە ڕای چ دەبوو؟ ئایا ئەگەر باوکم لێرە بوایە چۆن گوێی ڕادەگرت؟ نە دایکمو نە باوکم هیچێکیان هیچ لەو قسانە نەدەگەیشتن کە گوێیان لێ دەبوو. بەڵام من ئەوەی دەمبیست تێی دەگەیشتم. شادومان بووم کە فێری زمانی چینی ببووم. سوودم لەو ماوە دوورو درێژە وەرگرتبوو کە خەریکی فێربوونی زمانی چینی بوومو ئەو لاپەڕانەم دەور دەکردەوە کە (مستەر جین) پێی گوتبووم. (جیرالد) (مستەر جین)ی بۆ هەڵبژاردبووم بۆ ئەوەی فێری زمانی چینیم بکا.

ئەگەر وام نەکردایە نەمدەتوانی چێژ لەو چیرۆکە وەربگرم کە ئەوەتا لێرەدا دەینووسمەوە. باپیرە ئەو کاتە ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕامەوە کە لەسەر کورسییە بۆرەکەی دانیشتبوو و هەر دوو دەستی زەردی نابووە ناو یەك. هەندێ جار سەرنجی لە من دەداو هەندێ جار لە پەنجەرەوە سەرنجی لە دەرەوە دەدا. هەر هێندە یادەوریی زیندوو بووەوە، وشەی لە دەم هەڵڕژاو دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە کرد، دیم بوو بە کەسێکی تر. ئەو پیاوە ڕۆشنبیرە نەما کە ئەدەبو ناسکی

لێ دەچۆڕایەوە: ئەدەبی ڤێرجینیاو ناسکیی چین، کە وەکوو باوکی (جیرالد) ناسیبووم. نا...ئێستا تەنیا پیاوێکی بە ساڵاچوو بوو یادی ساڵانی هەرەتی گەنجێتی خۆی دەکردەوە.

دەرکەوت بە پێی داب و دەستووری دێرینی بوودایی ژنەکەی مارە کردبوو. ئەگەرچی بنەماڵەکە لە سەر ڕێبازی کۆنفۆسیۆش بوو کە پڕ بوو لە گومان، بەڵام بۆ مەسەلەی وەکوو زەماوەندو منداڵبوون و مردن دەگەڕانەوە سەر دەستووری بوودایی.

– ئایا دایك و باوکی کچە ڕازی بوون کچەکەیان شوو بە پیاوێکی ئەمریکی بکا؟

ئەم پرسیارەم لە (بابا) کردو گوێم لێ گرت هەژدەر هەژدەر قسەی دەکرد. کچەکە دایك و باوکی مردبوون. (هان یو – رەن)ی براگەورەی سەرۆکی خێزانەکەیان بوو. سەرەتا خوشکی بە قسەی برای نەهاتە ڕایێ. خۆی بە بێوەژن دەزانی و زەماوەندکردنی بە شتێکی پێچەوانەی ئەو باوەڕو پاکییە دەزانی کە بڕوای پێ هەبوو. ئەوەندە بڕوای بە دەستووری ئایین و ڕەوشتی خۆیان پتەو بوو، بیری دەکردەوە وەکوو زۆر بێوەژنی تری چینی ببێ بە ڕاهیبەیەکی بوودایی، بەڵام گومانی لە خواو لە ڕۆژی پەسلان ڕێگای شتی وای نەدا. تاقەتی ژیانێکی ئاینی نەبوو کە بڕوای بە داب و دەستوورەکەی نەبێ. بەم جۆرە وای بە چاك زانی لە ماڵە باوانی بمێنێتەوەو لە خوێندن بەردەوام بێ! ئیتر ژیانی ئەوەندە جیاواز نەبوو لەگەڵ ژیانی ڕاهیبەکان.

– ئایا کچێکی جوان بوو؟

بەر لەوەی وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە، دیتم ڕاڕایە، ئاخیری گوتی:

- جوان نەبوو. هەر چەندە هەندێ جا وای دەنواند کە جوان بێ!
- کەی وای دەنواند؟

ترسام بەم پرسیارە سنوورم بەزاندبێ، چونکە بۆی هەیە مەبەستی لە کاتی جوانی کچەکە، کاتی خۆشەویستی کردن بێ.

بەڵام پرسیارەکەم هیچ نارەزایی لای (بابا) نەورووژاند. بە هێمنی وەڵامی دامەوە:

- کاتێ جوان بوو کە بە دەنگی بەرز ئەو شیعرە کۆنانەی دەخوێندەوە کە حەزی لێ دەکردن. گەورەترین چێژی لێ وەردەگرت. بە دەم گۆرانی گوتنەوە عوودێکی باشی لێ دەدا. دەنگی خۆش و غەمگین بوو. هەندێ ئێوارە، کە عوودی لێ دەدا، فرمێسکی لە چاو دەهات. نەمدەزانی بۆچی دەگری؟

- ئایا بە لە دایکبوونی (جیرالد) شادو بەختەوەر بوو؟

لێرەدا، دیم (بابا) پەردەیەکی نیگەرانی بە سەر دەموچاودا کشاو گوتی:

- نازانم ئاخۆ بەمە دەڵێن شادومانی و بەختەوەری؟ یان نا. بەڵام بە راستی حاڵەتی تەواو گۆڕا. لە دوای لە دایکبوونی (جیرالد)، ئیتر شیعری نەدەخوێندەوەو بە یەکجاریش وازی لە عوودلێدان هێنا. وای لێهاتبوو بایەخی بە هەموو شتێ دەدا کە پەیوەندی بە شۆڕشەوە هەبێ کەچی پێشتر هیچ گوێی بە کاروباری سیاسی نەدەدا. پێش لە دایکبوونی (جیرالد)، نەمدی جارێ لە جاران، رۆژنامەیەك بخوێنێتەوە، کەچی پاشان، مەراقی بوو بە خوێندنەوەی کتێبی نوێ و گۆڤاری جۆراوجۆر، تا وای لێ هات زۆر شەیدای (سن یات سن) بوو. لە بیرمە زۆر جار لەسەر ئەمە لێمان دەبوو بە شەڕەشەق.

– نایەتە بەرچاوم تۆ هیچ شەڕێك بکەی!

لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو، وەك ئەوەی گوێی لێ نەبووبێ من چیم گوت، یان گوێی لێ بووبێ‌و خۆی لە گێلی دابێ:

– من (سن یات – سن)م خۆش نەدەویست‌و متمانەم پێ‌نەبوو. ئەوسا ڕاوێژکاری عەرش بووم. ڕەنگە بزانی ئەمە یانی چی؟ سستەمی فەرمانڕەوایی کۆنم بە لاوە باشتر بوو. جگە لەوەیش لە قوتابخانەی کۆن خوێندبووی، تەنیا چووبووە قوتابخانەی نێردەکان.

کە دیم (بابا) قسەی وا سەنگین دەکا، سەرم سوڕما. پێشتر چۆن دەمناسی ئاوها لایەنێکی کەسێتیم لەبەردەم خۆمدا بینی. ئەو شتەی بە دەستمەوە بوو دامنا بۆ ئەوەی بە چاکی گوێی لێ بگرم چ دەڵێ:

– بیروباوەڕمان جیا بوو. ئەو بیروڕای کۆنە پەرستانە بوو. بڕوای بە هەموو شتێکی کۆن هەبوو. لەپڕ گۆڕاو بوو بە ژنێکی جیا لەو ژنەی زەماوەندم لەگەڵ کردبوو. ئەو ژنە وەختی خۆی، بە پێی ڕەوشتی ژنی چینی، هەرگیز لەماڵەوە دەرنەدەچوو، پاش ئەوەی منداڵەکەی فەراژی بوو، دەستی بە چوونە دەرەوە کرد. دەچووە ئێرەو ئەوێ... کە لێم دەپرسی: دەچیتە دەرەوە چ دەکەی؟ وەڵامی دەدامەوە دەچمە کۆبوونەوە. دەمزانی دەچێ گوێ لە (سن یات – سن) دەگرێ. ئەمە یەکێ بوو لەوانەی لە پڕێ دەبن بە کوڕێ‌و دەردەکەون. کوڕە جوتیارێکی باشوور بوو.

بە ئاشکرا ڕای خۆم لەم بارەیە پێ گوت، دوای ئەوە دەستی پێکرد هێرشی کردە سەرم.

(بابا)، لێرەدا لەرەی دەنگی زرنگایەوەو نەیتوانی چیدی قسە بکا.

– چۆن هێرشی دەکردە سەرت؟و بە چی تاوانباری دەکردیت؟

کە تەماشای دەکردم، گریانم بۆ دەهات. لێوەلەرزەی پێکەوتبوو، لێوی خوارەوەی تەتەڵەی دەکرد. گوتی:

– دەیگوت گوایە من دژی بەرپابوونی شۆڕشم چونکە بێگانەم لە وڵات.

گەیشتە ئەو ڕادەیە پێیگوتم: تۆ دەتەوێ ئیمپڕاتۆر لە سەر عەرش بمێنێ چونکە بەرژەوەندیت لەوە دایە. دەتەوێ مووچەکەت نەبڕێ.

گوتم: ئامادەم هەر ئێستا ئیستیقالە بدەم.

وەڵامی دامەوە گوتی: ئەمە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ چونکە تۆ لە کاری خۆت بەردەوام دەبیو بە دوای بەرژەوەندی خەڵکدا ڕادەکەی. گوتی: منو تۆ قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕەچەڵەکمان ناگاتە یەك، من دڵسۆزی ڕەچەڵەکی خۆمم.

ئەو ژنە کاتی خۆی ناسكو خۆش مەشرەب بوو، لە پڕ گۆڕاو کەوتە لاملیو کەللە ڕەقیو سەرسەختی لەگەڵما، بگرە گەیشتە ئەو ڕادەیە تاوانباری کردم گوایە هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆشم نەویستووە.

کەواتە هۆی گۆڕانەکەی ئەمە بووە. ئەوە تێگەیشتم! ئێمەی ژن باش لە یەك دەگەین. ئەو ژنە یەکێکی خۆش دەویستو دەیزانی ئەوەی خۆشی دەوێ، ئەمی خۆش ناوێ، بۆیە لەماڵەوە دڵی تەنگ دەبوو و دەچووە دەرەوە، دەگەڕا شوێنێ بدۆزێتەوە دڵی پێ بکرێتەوە. زاتم نەکرد پیرەمێرد لەمە ئاگادار بکەمەوە کە ئاگاداری نەبوو، یان بیری نەدەهاتەوە.

– ئایا بە هۆی (جیرالد) وای لێ هاتبوو؟

سەری باداو گوتی:

– نازانم!

- بەڵام من دەمزانی وایە. کە کوڕی خۆی بینییوە، دڵی لە خەو هوشیار بۆتەوە. کوڕەکەی لە باوکێکی پێست سپی بوو. ژنە نەیدەزانی داخۆ ئەو کوڕە چی لێ دێو چارەنووسی بە چی دەگا. دەیشیزانی ئەگەر کوڕەکەی بۆی ڕێك بکەوێ بچێتە خاکی باوكو باپیرانی، مانای ئەوەیە لە هەموو خۆشەویستییەك بێبەش دەبێ. کوڕەکەی دەبێ لە وڵاتی ئەودا بێ. پێویستە کوڕەکەی لای خۆی گل بداتەوەو ئەمەیش بەوە دێتە دی کە هەوڵ بدا نیشتمانێکی نوێ بۆ کوڕەکەی دروست بکا.

ئاخ! هیچ گومانم نییە چی لە دڵمدایە بێ ڕازاندنەوەو بێکەمو کورتی، وەکوو خۆی بێ تفتو تاڵی دەری دەبڕم. ئەگەر ئەو لە جێگای من بوایە، قەت قسەی وای نەدەکرد. ڕەنگە شتی وای هەر بە خەیاڵیشدا نەهاتایە. وابزانم وا تێدەگەبشت، ئەوەی دەیکا، لە پێناوی هاوڵاتییەکانی دەکا. ڕەنگە کەوتبێتە ژێر کاریگەری ئەو بیرو باوەڕە کۆنانەی دەیبیستەوە سووکایەتی بە گەلەکەی دەکرێو بێگانە هێرش دەکاتە سەر وڵاتەکەی. بەڵام دەزانم ئەم هەموو بیروباوەڕانە شتی بریقەدارو خاپینۆکن. کە شتێ دەکەین، لە دڵی خۆمانەوە دەزانین بۆچی دەیکەین. ئەمە هەقی هەر وڵاتێکە کە خەڵکی تێدابێ، ژنو پیاوی تێدابێ!

ئەو ژنە دەیەویست کوڕەکەی لەوێ، لای خۆی گل بداتەوە. ئێستا لەبەر چاومە چ جۆرە تەونە جاڵجاڵۆکەیەکی لە دەوری (جیرالد) چنیوە!

باپیر لە قسەکردن وەستا. لێمپرسی:

- چیتر، بابا؟

ئاخێکی هەڵکێشا. منیش گەڕامەوە سەر دورمانو هەستم کرد زەینی لە من دوور کەوتۆتەوەو گەڕاوەتەوە قووڵایی ناخی خۆی، بەڵام

هیواو ئارەزووم پەیدا کرد شتی لەوە زیاتری لێ ببیسم، کە تا ئێستا لێم بیستبوو. هەوڵێکی ترم دا، بێ ئەوەی لێ بگەڕێم لە مەبەستم بگا، گوتم:

– (جیرالد) تەمەنی چەند بوو کە دایکی مرد؟

لەپڕ لە داڵغەکەی هاتەوەو بێ دوو دڵی وەڵامی دامەوە. ئەوەندە لە وەڵامەکەی سەرسام بووم، ئەوەی بە دەستمەوە بوو لە دەستم بەربووەوە، گوتی:

– نەمرد! کوژرا!!

– چ؟ چ؟!

چاومان بڕییە چاوی یەکتر. بریسکەیەکی ترسناکم لە چاوەکاندا دی: خەفەت نەبوو، هەراسانیش نەبوو! تۆقان بوو، لە چاوی دەبریسکایەوە:

– پێشتر ئاگادارم کردەوە.

ئەمەی گوت و لە تەوقی سەرییەوە تا بنی پێی لەرزی. ئەژنۆی لە ژێر کەوای ئارمووشی تەنك دەهەژایەوە.

– پێمگوت: ئەگەر سوور بی لەسەر ئەم کارەت، من ناتوانم ڕزگارت بکەم.

ئاخیری بوو بە شۆڕشگێڕ. شۆڕشگێڕێکی توندو تیژ. تێدەگەی؟ تەنیا هاوڵاتییەکی شۆڕشگێڕی ئاسایی نەبوو، تێگەیشتی؟ ببوو بە یەکێ لە (وان).

– قەت نەبێ، (بابا)؟!

– با، با! وای لێهات بوو بە دەستە خوشکی ژنی (سن یات – سن). چەند ساڵێکی دوورو درێژ بە یەکەوە بوون. ماوەیەك لە ماڵی خۆمان

بوو.... ئاخێری من بەم بارو دۆخە ڕازی نەبووم. لە خۆمو لە (جیرالد) دەترسام شتێکمان بە سەر بێ! پێمگوت: ئەگەر هەر دەبێ کۆبوونەوە لەگەڵ خائینان بکەی – ئەم وشەیەم بە کارهێناو پێمگوت: ئەگەر هەر کۆبوونەوە لەگەڵ خائینان دەکەی، ئای لان، ئەمە نابێ لە ماڵی من، یان لەبەر چاوی کوڕەکەی من بێ.

وشەی دواوەی گرتو بە ڕووی دادامەوە وەك ئەوەی بە هەموو هێزی بازووی خۆیەوە خەنجەرم لێ بدا، گوتی:

– کوڕی تۆ!!

بە زمانی چینی وشەکەم هاتە بەر گوێ. وەك ئەوەی ئێستا لەگەڵ ئێمە لەم ژوورەدا بێ. گوێم لە دەنگی بوو ماوەی هەزاران میلی تەی دەکردو ساڵانێکی زۆری دەبڕیو دەهات دەمگەیشتێ، وەك ئەوەی خۆی لێرە بێو لەو پیاوە نزیکتر بێ کە لەبەردەمم دانیشتووە.

– ئێی (بابا)، دەی بەردەوام بە.

– ئینجا ماڵی جێهێشت. ڕۆیشتو جارێکی تر نەمدیتەوە.

– کەواتە هێشتا نەمردبوو؟

– نا، هێشتا مابوو. چووم براکەیم دی کە برادەری خۆم بوو. بە یەکەوە چووین بە دوایدا گەڕاین. ئەو برایەی بە دڵو بە گیان لەگەڵ مندا بوو. هەڵبەت تێدەگەی! داوای بوردنی لێ کردم کە کاتی خۆی داوای لێ کردم خوشکەکەی بێنم. ئیتر حاشای لێکردو لە هەموو شتێ بێ بەشی کرد. تەنانەت بڕیاری دا ناوەکەیشی لە لاپەڕەی تۆماری خێزانەکەیان بسڕێتەوە. دواجار دۆزییەوە، بەڵام بە منی نەگوت لە کوێیە. پێیگوتم وا چاکە هەر نەزانی لە کوێیە. زانیم مەبەستی چییە. چوو بووە ناو (ئەوان). لە باشووری وڵات بە گەڵیان کەوتبوو. ئەوان خەریك بوون

لەویّ خۆیان بۆ شۆڕش ئامادە دەکرد. پەیوەندی لەگەڵ ژنی (سن یات – سن)، لە دوو خوشکی لە یەك دایك‌و باوك، باشتر بوو.

– دوای ئەوە، (جیرالد)یش نەیدیتەوە؟

بێگومان کاتێ (بابا) قسەی دەکرد، من بیرم لە (جیرالد) دەکردەوە. دەمهێنایە بەرچاوم لەم ماڵە گەورەیە، گەورە بووەو پێگەیشتووە. لەگەڵ باوکی بە تەنیا بووە. خەونی بە دایکییەوە دیوە. چ منداڵێك هەیە خەون بە دایکییەوە نەبینێ؟!

من کە لە کۆلیج دەرچووم، ماوەی ساڵێك، لە داڵدەیەکی هەتیوان، لە نیۆیۆرك، دەرزم گوتەوە. داڵدەکە تایبەتی بوو بە منداڵی زۆڵ کە دایکیان فڕێیان دابوون‌و کەس‌وکاریان حاشایان لێ کردبوون. بە ڕۆژ بەزم‌و یارییان دەکرد، بەڵام کە شەو دادەهات، دەیانکردە قیژە‌و گریان‌و هات‌و هاوار. ژوورەکەی من لە تەنیشت هۆڵی نووستنی منداڵەکان بوو. لە کاتی نووستندا، من لێپرسراویان نەبووم، هی تر سەرپەرشتیان دەکردن، بەڵام ناو بە ناو لەبەر دەنگی هاوارو قیژەیان بە خەبەر دەهاتم.

کە یەکێ هاواری دەکردو دەیگوت: دایکە! ئەو منداڵانە ژمارەیان بیست کەس دەبوو. هەر بیستیان یەك لە دوای یەك، وەکوو ئەو هاواریان دەکرد دەیانگوت: دایکە!!. ئینجا هەموو بە یەکەوە هاواریان دەکرد: دایکە! دایکە! ئەو قیژە‌و هاوارە زۆر بە توندی بێدەنگیی شەوی شەق دەکردو دەگەیشتە ژووری منداڵەکانی ترو ئەوانیش دەستیان پێ دەکرد. ئاخیری وای لێ دەهات هەموو شوێنەکە لەبەر قیژە‌و هاواری منداڵان دەلەرزییەوە. قیژە‌و هاواریان دڵی هەلا هەلا دەکرد. ئەو منداڵانە هاواری دایکیان دەکرد کە هیچیان لە بارەوە بە بیر

نەمابوو، یان هەر نەیاندی بوون. کێ هەیە بتوانێ دەردو ئازاری ئەم منداڵانە کەم کاتەوە؟! کێ هەیە بتوانێ بەرگەی ئەم هەموو دەردو خەفەتە بگرێ؟! هەر لەبەر ئەوەیش، وازم لەو کارە هێناو خۆم لەو کەش‌و هەوا ناخۆش‌و جەرگبڕە دوور خستەوە. بەڵام هەرگیز نەمتوانی ئەم منداڵە گریاوانە لە خەیاڵی خۆم ببەمە دەرەوە، یان قیژەو هاواریان لە بیر بکەم کە خەونیان بە دایکیانەوە دەدی‌و هیچیان لە بارەوە نەدەزانی....

(جیرالد)م دەهاتە بەرچاو وەکوو یەکێ لەو منداڵانە بۆ دایکی دەگری‌و دەقیژینێ. ئاخیری (بابا) وەڵامی پرسیارەکەی دامەوەو گوتی:

– (جیرالد) دایکی دەدی. ئەم هەڵوێستەی دایکی دروست‌و بەجێ بوو. نەیدەویست، لەبەر ئەوەی پەیوەندیمان بەوە گەیشت‌و لەماڵی من ڕۆیشت، بە دزی کوڕەکە ببینێ. بە هۆی برایەوە داوای لێکردم (جیرالد) ناو بە ناو بچێتە لایەوە بۆ ئەوەی چاوی پێ بکەوێ.

– تۆ ڕازی بووی؟!

– یەکەم جار، نەء! نەمدەویست کوڕەکەم مێشکی پیس ببێ. (هان یو – رەن)م ئاگادار کردەوەو بە ئاشکرا پێمگوت نامەوێ مێشکی منداڵەکەم پیس بکا. بە برای گوت‌و بەڵێنیشی دا هیچ بیروباوەڕی خۆی نەخاتە مێشکییەوەو بۆ منی لێ بگەڕێ بە پێی ئارەزووی خۆم پەروەردەی بکەم. ئیتر بەم جۆرە ڕێگام دا کوڕەکە ببینێ. دەهاتە (پەکین) بۆ ئەوەی چاوی پێ بکەوێ‌و لە ماڵی باپیرەی یەکتریان دەبینی.

– ئایا ئەم یەکتر بینینە تەنیا بۆ چەند سەعاتێك بوو؟ یان چەند ڕۆژێك بەردەوام دەبوو؟

- هەندێ جار چەند سەعاتێك‌و هەندێ جار چەند ڕۆژێك درێژەی دەکێشا. پەیوەندی بەوەوە هەبوو چەندی کات بە دەستەوە بوو، چونکە ئەو پەیوەندی بە(وان)ەوە هەبوو. ئەوانیش هەمیشە لە گەڵیا بوون.

ئاخ! بێشك (جیرالد) هەستی بەوە کردووەو تێگەیشتووە. (جیرالد) هەستی بەرامبەر خەڵکی دەورووبەری زۆر ناسکە. ئەو هەست ناسکییە گەیشتبووە ڕادەیەك پێش ئەوەی زەماوەند بکەین، بڕوای نەدەکرد من خۆشم دەوێ. بۆیە ناچاربووم دوای زەماوەندکردنمان، ناو بە ناو، بۆی بسەلمێنم هەر تەنیا ئەوم خۆش دەوێ‌و بەس. هەندێ جار غیرەم پێشان دەدا، وەکوو ئەو جارەی زستانی ڕابردوو لە ئاهەنگی سەما کردن، لە سەفارەت داوەت کرابووین، پێمگوت:

- (جیرالد)، جگە لە من سەما لەگەڵ کەس نەکەی! تێگەیشتی؟

دەم‌وچاوی سوور هەڵگەڕا و گوتی:

- خۆت گێل مەکە!

نەیدەزانی من قەتا وقەت هەستم بە غیرە نەکردووە. من متمانەم پێ هەبوو، چونکە متمانەم بە خۆم هەبوو. بە لامەوە گرنگ نەبوو، ئاهەنگی سەماکردن، لە هەچ سەفارەتێك بێ‌و کەم‌و زۆر جمەی بێ لە کچی جوان‌و ژنی بیانی ناسك‌و نازدار. دووبارەی دەکەمەوە، من هەرگیز هەستم بە غیرە نەکردووە. بەڵام هەستم دەکرد ئەو پیاوە تەنیا هی منە‌و بەس! هیچ ترسی ئەو کچە چینییانەم نەبوو کە بە کراسی حەریری شۆڕو بە بەژنی باریك‌و ناسك جوانییان لێ دەچکا و نازیان لەسەر عەرد دەکرد. ئێستا کە باسی ئەو مەسەلەیە دەکەم لە خۆم ڕازیم، لە بیرمە هیچ ترسی ئەوانەم نەبوو. هەر چەندە پێم وایە ئەو لە ناخی دڵەوە

ئەمەی پێخۆش بوو. هەندێ جار دەمبینی بە هەموو سەنگینی‌و داناییەوە هەڵوێستی ئاسایی بوو، ئازادی خۆی وەردەگرت.

باپیرە لە قسەکانی بەردەوام بوو، گوتی:

- ئەوەم بە دڵ نەبوو کە هەستم دەکرد منداڵەکە حەز دەکا لە ماڵی دایکی بمێنێتەوە. بە خۆی نەدەهاتەوە ماڵێ بۆ لای من. لەوە دەچوو لە دەریایەك شیرنەمەنی‌و لافاوێك نازی خزمەتکاران نقووم بووبێ. خۆت دەزانی ئەمە چۆن دەکەوێتەوە.

بە ڕاستی زانیم ئەمە یانی چی؟ بنەماڵە چینییە گەورەو دێرینەکان منداڵە نێرینەکانی خۆیان دەپەرست. بە ڕەمزی ژیانی جاویدانیان دەزانین. هەموو بایەخ‌و خۆشەویستی‌و هەموو سۆزو میهرەبانیی خۆیان پێدەبەخشین. ئەو منداڵانە، بە دەم ڕۆژگارەوە لەناو دەریای بێسنووری خۆشەویستیدا بزر دەبوون. نەدەبوون بە خاوەن کەسێتی خۆیان. تەنیا ئەو منداڵانەی بەهێزو لێوەشاوە بوون لەو دەوروبەرە جەنجاڵ‌و هەراوەدا دەردەکەوتن. کچەکەم، کە هەر زوو جوانەمەرگ بوو، ئەگەر کوڕ بوایە، شتێکی وای لێ ڕەچاو دەکرا. بەڵام کچ بوو، ناوی (رو-ئان) بوو. ئەو کچە جۆرێکی تر بوو، وەکوو ئەو منداڵانە نەبوو کە دەمدیتن. بەرهەمی یەکەمین خۆشەویستیمان بوو. کاتێ ئەو کچە لە دایك بوو، (جیرالد)م بە هەموو مانای وشەی چینییەوە بە چینی بینی. کە لە نەخۆشخانە هاتە ژوورەکەم‌و دیتی لە باوەشمدایە، دەم‌وچاوی تێکچوو.

ئای چەند سەیرە بنیادەم بیرەوەری پووچ‌و وردە شتی بێ مانا کاوێژ بکاتەوە!!

- سەروەرەکەم، ها ئەمە کچەکەت!

وام بە (جیرالد) گوت. (جیرالد) هاتە پێش و لێی وردبووەوە. ئای ئەو کاتە چەند شادو بە کەیف و بەختەوەر بووم! بە هەموو مانایەکەوە ژیانم خۆش دەویست. مێردەکەم و (پەکین) و (چین)م خۆش دەویست!

لە تەك چوارپاکەم دانیشت و لە کچەکە وردبووە. پەردەیەکی غەمی بە سەر دەم و چاوەوە بوو. هەستم کرد هەوڵ دەدا سیمای دەم و چاوی لە من بشارێتەوە کە ناڕەحەتی دڵ و دەروونی پیشان دەدا.

گوتی:

– جورمێکی تا بڵێی بچووکی هەیە!

لە قسەکەی تووڕە بووم. پێمگوت:

– بەپێچەوانەوە، (جیرالد). کێشی نزیکەی چوار کیلۆیە، زیرەکیشە!

– زیرەکە!؟

بە ورتە وایگوت و چاوی بڕییە دەم و چاوی خەوتووی و لێی وردبووەوە.

– بەڵێ....

ڕەوشتم وا بوو، بە زۆری بۆم دادەهێنا و پیلەکەم لەگەڵ نەدەکرد. کەچی لەپڕ بۆم دەرکەوت لەبارەی کچەکەمەوە لەگەڵیا وا نیم. ئەو کچە دەبێ جوان و بەهێزو زیرەك بێ. بە ڕاستیش هەر وا بوو. تا لە تەمەنی پێنج ساڵیدا مردیش، هەروا مایەوە. ئێستا با واز لە یادی مردنی بێنین. نابێ لە ڕۆژی زەماوەندمان و ڕێك لە شەوێکی وەکوو ئەمشەودا یادی مردنی بکەینەوە.

– (بابا)، دیارە ماندووی!

وامگوت و ئەوەی بە دەستمەوە بوو، پێچامەوە.

– ئێستا بڕۆ بخەوە جارێکی تر ئەم باسە تەواو دەکەین.

- هەندێ قسەم ماوە، تەواوم نەکردووە.

بە سووربوونەوە وایگوت. لە سەر کورسییەکەی نەجوولایەوە. ناچاربووم چاوەڕێم کرد. گوتی:

- بۆم نەگێڕایتەوە دایکی (جیرالد) چۆن کوژرا.

ڕاستە، هێشتا بە وردیی ئەم باسەی بۆ نەکردبووم. پێم وایە بە شێوەیەکی دڕندانە کوشتوویانە. ئەمەم لە چاوی (بابا)دا بینی کە لە پەنچەرەوە چاوی بڕیبووە تاریکایی شەو، لە هێڵی سپی دەوری لووتی و لە لێوەکانییەوە دیار بوو کە توند بە یەکەوە قڕساندبوونی، گوتی:

- گوللەبارانیان کرد.

دیتم لەگەڵ ئەم قسەیەدا موچڕکی پێدا دەهات. لەوە زیاتر خۆم پێنەگیرا، گوتم:

- (بابا)، باسی هیچم بۆ مەکە! نابێ بیر لە شتی وا بکەیتەوە.

وەك ئەوەی من هیچ نارەزاییم پێشان نەدابێ، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- ساڵی ١٩٣٠، پۆلیسی نهێنی سەر بە حکوومەتی میللی، لە شاری (نانکین) دەستگیریان کرد. بە تەنیا دەژیا. لە کاروان جێمابووو لەگەڵ (سەن)ی دەستە خوشکی نەچووبوو. نازانم هۆی چی بوو لەو شارە مابووەوەو لەگەڵ کۆچڕەوە گەورەکە نەڕۆیشتبوو. ڕەنگە وەکوو سیخوڕو زماندز مابێتەوە. بە ڕاستی هۆی ڕاستەقینەی مانەوەی نازانم! ئەوەندە دەزانم بەیانییەکی زۆر ساردی ڕۆژێ لە ڕۆژانی سەرەتای بەهار، لەناو نوێن ڕایانکێشایە دەرێ. بەیانی نەدابوو. هەر بە جلی

نووستن پەلکێشیان کردو تا بورجی (درام) بە پێ بردیان. لەوێ ڕایان گرت. پشتیان دایە دیوارو چاویان بەستەوەو گوللەبارانیان کرد.

حەزم نەدەکرد زیاتر پرسیاری لیّ بکەم، بەلاّم هەستم کرد ناچارم:

– (بابا)، ئەو هەموو وردەکارییەت لە کویّ زانی؟

– کارەکەرێکی لەگەڵدا بوو، پیرەژنێکی پیر بوو. ئەو کارەکەرە هاتە لام‌و پێی ڕاگەیاندم خانمەکەی داوای لیّ کردووە بە هەر جۆریّ بیّ، بمبینیّ.

لێرەدا، بابا دەنگی نووسا. هەردووکمان بێدەنگ بووین. شوێنەکە کش‌ومات بوو. کە هیچی پیّ نەما بۆم بگێڕێتەوە، هەموو لەشی گرژ بوو، بچووك بووەوەو چاوەکانی داخست.

– (بابا)، هەستە بڕۆین. زۆر ماندووی!

دەستم گرت‌و بردمەوە ژووری خۆی. لای دانیشتم تا خەوێکی قووڵی لێکەوت. حەزم دەکرد پرسیاری یەك شتی لیّ بکەم. حەزم دەکرد لێی بپرسم ئایا (جیرالد) لەو هەموو وردەکارییەی مردنی دایکی ئاگادار کرابووەوە؟! وا بزانم ئاگاداربووە. پێویستی نەدەکرد ئەم پرسیارە لە پیرەمێرد بکەم، یان هەر بیری لیّ بکەمەوە، چونکە چینی لەناو خۆیانەوە دەنگ‌و باس دەگێڕنەوەو هیچ شتیّ ناشارنەوە. جا کیّ دەتوانیّ نهێنی وا بشارێتەوە؟ دامان نا کارەکەرە بەساڵاچووەکە باسی هیچی نەکرد، یان (بابا) بۆ کوڕەکەی باس نەکرد، بیّ شك لەگەڵ ئەوەشدا، (جیرالد) هەر بە مەسەلەکەی دەزانیّ!

*   *   *

# (١٠)

دوێنێ وەڵامی ئەو پرسیارەم وەرگرت کە لە مێژبوو لە دڵمدا بوو، بەڵام نەمدەکرد. پۆستەچی گۆڤارێکی بۆ هێنام پوولی چینی لێ درابوو. سێ پوولی لێ درابوو. پێشتر شتی وام لەناو پوولی کۆمۆنیستەکان نەدی بوو: یەکەمیان ڕەنگی پرتەقاڵی بوو، دووەمیان قورمزی بوو، سێیەمیان شین بوو. هەر پوولێك وێنەی گەنجێکی لەسەر بوو. یەکەم وێنەی سەربازێك‌و دووەم وێنەی کرێکارێکی میکانیك‌و سێیەم وێنەی جوتیارێك. ئەو کاغەزەی گۆڤارەکەی لێ پێچرابوو هیچی لەسەر نەبوو. تەنیا ئەوەندەی لەسەر نووسرابوو: (ژمارە ٣٠٥، پۆب، پەکین، چین). دڵنیا بووم (جیرالد) ناردوویەتی. چونکە کاتێ بەرگەکەم کردەوە، دیم ژمارەکە بە بۆنەی ڕێزلێنانی شەهیدێکی شۆڕش دەرچووبوو و شەهیدەکە ژنێك بوو لە ١٥ی مایسی ١٩٣٠ لە ناوچەی (نانکین) گوللەباران کرابوو. ناوی (هاید ئای – لان) بوو. ئەو ژنە دایکی (جیرالد) بوو. وێنەی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی گۆڤارەکە درابوو. چوومە بەر پەنجەرەو لێی وردبوومەوە بۆ ئەوەی بە وردی بیبینم. دەم‌وچاوێکی ئارامی هەبوو. سیمای نیشانەی کەسێتییەکی بەهێزی پێوە دیاربوو. دەم‌و چاوی وردو بچووك بوو. دوو چاوی گەش‌و گەورەی هەبوو.

تەبەشی پان بوو. قژی لەسەر هەنیەی لادابوو و لە دواوە بەستبووی. هەستم کرد لێوی ناسکی گەرمایی گەنجێتی تێدایەو توندو تیژی دەنوێنێ. سیماو ڕووخساری (جیرالد)م لە سیمای ئەو ڕووخسارەدا بینی.

بەم جۆرە لەو شتە دڵنیا بووم کە دەمەویست پرسیاری لە بارەوە بکەم. بۆم دەرکەوت (جیرالد) بە هەموو شتێکی زانیوە. گومانم نەما کە پیرەژنە کارەکەرەکە نامەی دایکی پێگەیاندووەو ڕەنگە دایکە مەبەستی بووبێ کوڕەکەی بزانێ ئەم چۆن مردووەو لە پێناوی چ بیرو باوەڕێکدا تووشی ئەو چارەنووسە هاتووە.

(جیرالد) هەموو شتێکی دەزانی و هەرگیز لە مێشکی دەرنەدەچوو. ئەوە بوو کاتی خۆی، ڕۆژی ١٥ی مایسی دانا بۆ مارەبڕینمان. ئەوسا نەمدەزانی بۆچی ئەو ڕۆژەی داناوە، بەڵام ئێستا ئەوە زانیم.... (جیرالد) ناتوانێ هیچم بۆ بنووسێ بەڵام ئەوەتا بە هۆی ئەم گۆڤارەوە توانیویەتی چیرۆکی دایکی و تەواوی ژیانیم بۆ ڕەوانە بکا. ئەم چیرۆکە، چیرۆکی ژیانی دایکی نەبوو وەکوو دایکێک و هاوسەرێک، بەڵکو چیرۆکی ژیانی دایکی بوو وەکوو شۆڕشگێڕێک کە دوای ئەوەی ئەم لە دایک بوو...

گۆڤارەکە هیچ شتێکی لە بارەی (جیرالد)ەوە باس نەکردبوو، بەڵام (جیرالد) دەیەویست منیش چیرۆکی دایکی بزانم، دەیەویست منیش لە هەموو شتێ بگەم. ئاخ! خۆشەویستەکەم، تا پێم بکرێ هەر هەوڵ دەدەم و هەوڵ دەدەم.

* * *

# (١١)

ڕۆژ بە ڕۆژ ناخۆشتر دەبێ ئاوها وەکوو ژنێکی بێ پیاو بژیم. ئێستا هەست بە دڵتەنگی دەکەم. ئیتر ئەو ژنە نیم کە بە دڵناسکیی ناسرابووم. ئەو خۆشەویستییەم نەماوە کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەمەزەرد دەبووەوە. دەترسم لە سۆنگەی ئەم نالەبارییەوە شتێکم بەسەر بێ. سەرم سوڕماوە تێناگەم ئەو ژنانەی مێردیان هەبووەو مێردیان مردووە، چۆن وەزگ نادەن. من ناتوانم خۆم وەکوو ئەو ژنانە دابنێم چونکە من مێردەکەم نەمردووە، هێشتا زیندووەو زەقەی چاوی دێ. ماوەو لەولا دەژی.

نەمکردبوو بە عادەت بە بەردەوامی ئینجیل بخوێنمەوە، کەچی ئێستا هەست بە ئاتاجو ئارەزوویەکی زۆر دەکەم بۆ خۆراکێکی ڕۆحی. ئەمەیش لە هەموو شتێکدا دەبینم کە ڕۆحی مرۆڤ نووسیبێتی.

ئەم بەیانییە ڕۆژێ نییە لە ڕۆژانی پەسلانو زیندووبوونەوە. بەرەبەیانی هەستانەوەی مەسیحیش نییە. بەیانی ڕۆژێکە لە ڕۆژەکانی هاوینی سەرەتای حوزەیرانو سەرشارە لە دیاردەکانی ژیانو هەستو

سۆز. گوڵەکانی باخچە پشکووتوون‌و درەخت بەریان داوەو گیای سەوز زەوی داپۆشیوە. هەست دەکەم خوێنێکی گەرمم لە دەمارەکاندا دەگەڕێ، ڕۆحم هەڵدەبەزێتەوەو هاوار دەکاو داوای یارمەتی لە یەکێ دەکا. هەر ڕامکرد بۆ لای ئەو ئینجیلەی باوکم بۆی جێهێشتبووم. کردمەوە بۆ ئەوەی بیخوێنمەوە، تووشی ئەم وشانە هاتم:

(..... ئاخ! پیرۆز بێ ئەم گیا کەڵەیە کە کارێکی سەختی بۆ دابین کردووم!)

خێری پێوەیە! هەموو خێرێکی بۆ من پێوەیە! ڕووم کردە گەوڕی ڕەشەوڵاغان. مانگای سیسیلم، کە خەڵاتم پێوەرگرتبوو، گوێرەکەیەکی بچووکی ببوو. بێچووەکەو دایکیشی تەندروستیان باش بوو. هەستم کرد سیسیلی هەر بە پاڵ کەوتوویی مایەوە، وەکوو جاران هەڵنەستا بێتە پێشوازیم. ڕەنگە ئەویش بزانێ من هەقی پێ دەدەم سەبارەت بە هەڵوێستی ئێستای کە ئەنجامەکەی لەبەرچاومە. لە کاتی وادا، باشترین کارەکەر چ دەکا، ئەویش هەمان شتی کرد. هەموو دەوس‌و نیشانەیەکی کارەکەی خۆی سڕییەوە. منیش، ئەو ئالیکەی (مات) بۆ ئەم جۆرە حاڵەتانە ئامادەی کردبوو، لە بەر دەمم دانا. بە تامەزرۆیی پڕی پێدا نەکرد، دەتگوت بۆ خاتری دڵی من دەیخوا.

بە دڵێکی فەڕاح‌و خۆشەوە لە ناو گەوڕ چوومە دەرەوە. پەشۆکام وەك ئەوەی مرۆڤ بە دەم تەوژمی ژیانەوە بپەشۆکێ. مرۆڤ هەست‌و سۆزی دڵی هەر چۆن بێ، ژیان هەر دەڕوا. چوومە ناو باخچەودەستم بە کاری ڕۆژانەی خۆم کرد.

بە درێژایی ڕۆژ خەریکی ئیش بووم، تەنیا ماوەیەکی کەم نەبێ لە کاتی نیوەڕۆ، کە فراوینم بۆ خۆم‌و بۆ (بابا) ئامادە دەدکرد. (رینی) تا

ئێوارێ نایەتەوە. (مات)یش لەم ئاوو هەوایەدا لە شانشینی دەرەوە خواردن دەخوا.

(رینی) پایزی دادێ دەچێتە کۆلیج، نازانم ئەمە چۆن دەکەوێتەوە. لە ئێستاوە لەوە دەترسم کە ئەو رۆیشت من بە تەنیا دەمێنمەوە. بەلام پێویست ناکا زۆر قسەی لەسەر بکەم. من لێرە، بۆ خۆم لەگەڵ (بابا)، خەریکی ژیانی خۆم دەبم. (بابا) باشترین هۆگرو هاودەممە. باشترین برادەرمە.

ئاخ... خۆ من ئەوەندەش پیر نەبوویم. ئەمشەو، کاتێ مانگ گەیشتە تاقی ئاسمان، خەوم لێ نەکەوت. ئەمڕۆ ئێوارێ کە (رینی) چووە دەرەوە، باشترین دەستە بەرگی کردە بەرو تەواو خۆی ڕێك و پێك کرد. وا بزانم ئاشقی کچێك بووە. بەلام ئایا حەز لە کێ دەکا؟ جارێ نازانم. دەبێ چاوەڕێ بکەم تا پێ دەکەوم.

(بابا) زوو چوو خەوت. وەکو خۆی دەڵێ دەبێ پێش سەعات هەشت و نیو لەناو جێ بێ. لەبەر ئەوەی شەو هێشتا تەواو ڕانەکشابوو، گەڕامەوە بۆ شانشینی بەر تەسکی بەرامبەر مانگ و لەسەر لاتەختە درێژەکە ڕاکشام. هەر چەندە شەوێکی مانگی حوزەیران بوو، بەلام دونیا سارد بوو. کۆڵوانەی سپیم لە خۆم لوول داو خۆم دا بە دەست یادەوەرییەوە. خەیاڵ بردمییەوە بۆ خۆشەویستەکەم. بڕیارم داوە تا لە ژیاندام لێ نەگەڕێم خۆشەویستیم بمرێ. بۆیە بە خەون و خەیاڵ ئەو خۆشەویستییەم زاخاو دەدەمەوەو ئەویش ژیانم پێ دەبەخشێ. ئەگەر خۆشەویستییەکەمان بمرێ، ئیتر خەوو خیاڵیش ماناو شوێنی نامێنێ، بەلام من هێشتا بێوەژن نیم، بە هەموو مانای

وشەی بێوەژن، چونکە ئەو کەسەی خۆشم دەوێ هێشتا لە ژیاندا ماوەو نەمردووە.

بە خەیاڵ کیشوەرو دەریاکانم بڕی. چوومە ئەو شارەی خۆشەویستەکەمی تێدایە، بە ڕۆح بە شەقامەکاندا سووڕامەوە. لە دەرگا چوومە ژوورەوە. چوومە ژوورەکەی ئەو. ئای لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی لێك جیابووینەتەوە چەند جار وام کردووە! ئەو ماوەیە لە ئێنج ساڵ تێناپەڕێ. باوەڕ ناکەم لێك دابڕانمان هەتاهەتایێ بەردەوام بێ، بۆی هەیە لەپڕ بڕیار بدا بێتەوە لام..... ئەگەر وا بکا، بە پرسیاران شەکەتی ناکەم.... لێی ناپرسم: بۆچی وات کرد؟ چۆن توانیت وا بکەی؟ هەر ئەوەندە دەکەم باوەشی بۆ دەکەمەوەو لە ئامێزی دەگرم. ئەگەر بشێ ئەو تەمەنەی ماومانە بە یەکەوە بژین، هەرگیز ئەو پرسیارەی لێ ناکەم کە دڵم دەگوشێ. ئەوەندەم سەرو زیادە کە هاتۆتەوە لام.

ئەوەتا مانگ بە سەر سەرمانەوە دەڕوانێ. شەوێکە لە شەوانی هاوین. لە (پەکین)، لە حەوشەی لای ڕۆژهەڵاتی ماڵەوە دانیشتووین:

خانووەکەمان کاتی خۆی هی میرێکی بنەماڵەی (مانشۆ) بوو. لە میرە گەورەکان نەبوو. میرێك بوو پایەی لە خوارەوە بوو. تەمەنی بچووك بوو. خانووەکەی ئەوەندە گەورە نەبوو پێی بگوترێ کۆشك. بەڵام ئەوانەی تێیدا دەژیان خۆشیان دەویست، هونەریان لە جوان کردنو ڕازاندنەوەی دەنواند. دەروازەی گەورەی بەینی حەوشەکان لەسەر شێوەی مانگ دروست کرابووو دەوراندەوری کەرپووچ بوو. حەوشەی لای ڕۆژهەڵات حەوزێکی گوڵی لۆتسی تێدابوو. ماڵبەندێکی قامیش دیوارەکانی داپۆشی بوو. حەوشێکی کپو ئارام بوو. کەوتبووە لای

پشتەوەی شەقامی گەڕەك‌و بە لای پشتەوەدا دەکرایەوە. ئەو حەوشەیە ڕاستەوخۆ ژووری نووستنی دەچووەوە سەر. چوارپایەکی چینی گەورە لەبن دیواری ژووری نووستن داندرابوو. سەرەتا ڕام لە چوارپاکە نەبوو! کە تازە بووك بووم ناڕەزایم بەرامبەر دەردەبڕی. چوارپایەکی داری ڕەق‌و تەق بوو. دۆشەکێکی ڕیشاڵی دارخورمای لەسەر ڕاخرابوو. تەنیا لێوارە قەنەفلّییەکانم بە دڵ بوون کە بە بزماری زیوین کوترابوون. (جیرالد) پێم پێدەکەنی گوایە من لە ژیانی چینییدا، نەخش‌و جوانیم دەوێ، نەك زبری‌و ڕەقی. منیش پێمدەگوت کە بتوانین لەسەر دۆشەکی ماقووڵانەترو خۆشتر بخەوین، بۆچی لەسەر دارو ڕیشاڵی دارخورما ڕابکشێین. ئایا ئەمە هیچ هەڵەو کەم‌و کورتیی تێدایە؟

وەڵامی دەدامەوە: هەڵەو کەم‌و کورتی تێدا نییە، بەڵام خۆتەفرەدانە، کە دەبێ لەم دوو شتە یەکێ هەڵبژێرین: چوارپای چینی، یان چوارپای ئەمریکی.

من لەگەڵ ئەو ڕایەی دانەبووم. کە دوو شتمان لەبەردەم بێ، بۆچی باشەکە هەڵنەبژێرین. بەم جۆرە کاتێ چووە (تیانستین) بۆ ئەوەی پێویستییەکانی ئەو ساڵەی کۆلێج بکڕێ، هاتەوە چوارپایەکی ئەمریکی هێنابوو. هەر یەکەمان هەوڵمان دەدا بەوەی دی بسەلمێنین ئەو چوارپایەی پەسندی دەکا، لەوەی دی باشترە. من بەرگریم لە چوارپای نەرمی ئەمریکی دەکردو ئەو لە چوارپاو دۆشەکی زبری چینی. ئای ئەو ڕۆژانە چەند خۆش بوون‌و چەند بەو شتە پێدەکەنین!!

بە بیرم نایێ (ئەو)، لە من بەولاوە لەگەڵ هیچ کەسێ وا پێکەنیبێ. ئەو هەرگیز نە لەگەڵ قوتابییەکانی‌و نە لەگەڵ (رینی)و نە لەگەڵ باوکی پێنەدەکەنی. لەگەڵ من نەبێ، لەگەڵ کەس پێنەدەکەنی. حەزی لە

پێکەنین نەبوو. لەم ڕووەوە چینییەکی تەواو نەبوو، بە هەموو مانای وشە چینی نەبوو، چونکە برادەرە چینییەکانی بە هەموو شتێك و لەگەڵ هەموو شتێك پێدەکەنین. کەچی (جیرالد) ئەدگارێکی گران و سەنگین و پڕ نهێنی هەبوو. زۆربەی کات بێدەنگ بوو. هەر چیم گوتبا و هەرچیم کردبا، نەمدەتوانی بە دەنگی بێنم. بە گاڵتەو حەنەکی من نەبایە بێدەنگی خۆی نەدەشکاند. من بە شێوەی تایبەتی خۆم گاڵتەو سوحبەتم لەگەڵ دەکرد، دەمزانی بە مەوە هەست و سۆزی دادەگیرسێ و سۆزو خۆشەویستی و گەرمی لێ دەبارێ.

کاتێ بە خەیاڵ گەیشتمە ئێرە، لە شانشین دانیشتبووم دەستم بۆ درێژ کرد بوو. بەڵام ئەو لێمەوە دووربوو، لەو دیو دەریاکان بوو.

*   *   *

# (١٢)

نیوە شەو بوو کە (رینی) هاتەوە. دیتی لە شانشین دانیشتووم، پێیگوتم:

- دادە، هیوادارم چاوەڕێی منت نەکردبێ!

کوڕەکەم بە تەواوی گۆڕابوو، ببوو بە ئەمریکییەکی سرف. ئەوەتا شێوەی بانگ کردنی منی گۆڕاوە. باوکی سووربوو کوڕەکەم پێم بڵێ (دایە)، یان (دایکە)، نەك (ئۆدە)، یان (دادە)! بە هیچ جۆرێ بە ڕووم هەڵنەهێنا حەز ناکەم بەو جۆرە بانگم بکا. کەڵکی چی هەیە؟ کەڵکی چییە دەست بە تارمایی باوکییەوە بگرم لە کاتێکدا کە باوکی بە گۆشتو خوێن لێمانەوە دوورە!

وەڵامم دایەوە:

- نا، دانیشتبووم، بیرەوەرییەکانی خۆمم دەور دەکردەوە. بیرم لە باوکت دەکردەوە. داخۆ ئەمشەو چ دەکا؟ لەوانەیە ئیش بکا.

زۆرم باس کرد، (رینی) هیچ وەڵامی نەدامەوە. هەر ئەوەندەی کرد بۆ خۆدەرخستن جگەرەیەکی داگیرساند. من دەمزانی جگەرە دەکێشێ.

ئەویش دەیزانی من بە جگەرەکێشانی دەزانم. بەڵام ئەمە یەکەم جار بوو لەبەردەمی مندا جگەرە بکێشێ.

- کوا، جگەرەیەکم بدەرێ!

بە سەر سامی چاوی بڕییە دەمو چاوم. پاکەتە جگەرەکەی دامێو گوتی:

- نەمدەزانی تۆ جگەرە دەخۆی!

جگەرەکەی بۆ داگیرساندم.

- ڕاستی، من جگەرەخۆر نیم.

بەم جۆرە وەڵامم دایەوە.

- بەڵام دەبینم تۆ زۆر بە چێژو تاسووقەوە جگەرە دەکێشی، بۆچی بەشداری ئەو زەوقەت لەگەڵدا نەکەم؟

کە گوێی لە قسەکەم بوو، پەشۆکا، وەك ئەوەی چێژی لە جگەرەکە وەرنەگرتبێ. من پێم وایە گەنج پێویستی بەوەیە هەست بکا گژنێی شتێ دەکا. یان حەز دەکا شتێ بکا جێگای ناڕەزایی بێ.... بەڵام کە دەبینین ئێستا هەرچی بکەن، ڕێیان پێ دەدرێ، لام وایە خۆیان ئەمەیان پێناخۆشەو حەزی لێ ناکەن، چونکە لەگەڵ هەستی ناوەوەیان ناگونجێ کە دەیانەوێ هەست بە کەسێتی خۆیان بکەن. بە هەرحاڵ، ئەوە بوو (ڕینی) خێرا جگەرەکەی کوژاندەوە، بەڵام من لە کێشانی جگەرەکەی خۆم بەردەوام بووم.... ئینجا پێمگوت:

- لەگەڵ جگەرەکێشان هەست بە هیچ ناکەم، وامدەزانی شتێکی ترە!

- بۆ ئەوەی بزانی چۆنە، دەبێ دووکەڵەکەی قووت بدەیتەوە.

- کە وەختم بوو، وا دەکەم!

مانگ لە تاقی ئاسمان بوو. ئاخڵەیەکی سپی، لە سەر ڕووی ئاسمانێکی زەردی کەم ئەستێرە، دەوری دابوو. (رینی) خۆی فڕێ دایە سەر کورسییەكو سەری بەردایەوە سەر شانی‌و هەنسکێکی هەڵکێشا. لەپڕ لێیپرسیم:

– کە تۆ شووت کرد، تەمەنت چەند بوو؟

– تەمەنم بیست‌و سێ ساڵ بوو، ساڵێك بوو لە کۆلیج دەرچوو بووم.

– تەمەنێکی درەنگە بۆ شوو کردن.

– وابزانم ساڵێك پێشتر دەزگیران بووین.

– بۆچی پێش ئەوە زەماوەندتان نەکرد؟

ئایا ماقووڵە مرۆڤ هەموو شتی تایبەتی خۆی بە منداڵەکەی بڵێ؟! ئەگەر شتی وا ببێ، ئەنجام بە چی دەگا؟ لەبەر تریفەی مانگ لە (رینی) وردبوومەوە، لە تەنیشتەوە لە دەم‌و چاوی وردبوومەوە. (رینی) ئیتر منداڵ نییە. ئەمساڵ بەژنی سێ گرێ‌و نیو زیادی کردووە. بەژنی نزیکەی بەژنی (جیرالد) دەبێ. ئێسکی ڕوومەتی بەهێزبووە‌و سەرو سیمای بە چاکی دەرکەوتووە. ئەمە هەمووی نیشانەی پیاوەتییە‌و بەڵگەی ئەوەیە پێڕا گەیشتووە.

– باوکت دەترسا من چینم بەلاوە خۆش نەبێ! سەرەڕای ئەمەیش، دەیەویست دڵنیا بێ من هەموو شتێکی چینیم لەو خۆش دەوێ. بۆیە تا لەم هەموو شتە دڵنیا نەبوو، نەهاتە پێش داخوازیم بکا. ئەمەیش ماوەیەکی زۆری برد. باوکت پیاوێکی هەڵەشە نەبوو، بە وردی لە شتی دەکۆڵییەوە!

کوڕەکەم زۆری بیر لە قسەکەم کردەوە، ئینجا لێیپرسیم:

– چ شتێکی چینی تێدایە؟

– نازانی؟

پرسیارەکەی زەبرێك بوو لێیدام، بۆیە نەمزانی چۆن ئەو شتەی پێ بڵێم کە دەیەویست بیزانێ.

– نا، بە ڕوونی نایەتەوە بەرچاوم!

– (رینی)، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ کە جێمان هێشت، تۆ تەمەنت دوازدە ساڵ بوو!

– دەزانم. ئەوەش دەزانم دەبوایە هەموو شتێکم لە بیر بێ. نازانم هۆی چییە لە بیرم نەماوە!

بەڵام من هۆیەکەیم دەزانی. ئەو نایەوێ باوکی بێتەوە بیر، بەڵام ناتوانم ڕەپ و ڕاست وای پێبڵێم. ئەگەر وای پێبڵێم وەکوو ئەوە وایە، بە شتێ تاوانباری بکەم. پێویست ناکا تووشی ئەو هەڵوێستەی بکەم. وا چاکە ئەو دەرفەتە بقۆزمەوەو یادەوەری ببزوێنم.

– بێ شك تۆ دەزانی چۆن بوو!

– بە دیمەنییەوە دیارە چینییە.

(رینی) بە جۆرێ وایگوت وەك ئەوەی حەز نەکا بە ئاشکرا وا بڵێ.

ئینجا بە دوای قسەکەیدا چووم و گوتم:

– کەواتە لە بیرتە! بەڵێ، ئەگەر لەناو چینییەکان بێ، دیمەنی لە چینی دەکا، ئەگەرنا ئەمریکییە.

– ئەگەر لێرەش بوایە، دیمەنی هەر لە چینی دەکرد.

– جا ئەمە چی تیا بەستەیە؟ چینی میللەتێکی قۆزن. بە تایبەتی خەڵکی باکوور. باپیرانیشت خەڵکی باکوور بوون. بە ڕاست، ئایا هیچت لە بارەی (هان یو – ڕەن)ی خاڵۆی گەورەت لە بیر نەماوە؟

– نا.

ڕەنگە هەقی بێ کە لە بیری نەماوە. چونکە ئێمە (هان یو – رەن)مان زۆر نەدەدی. یەکێ بوو لەوانەی هاوکاری یابانەکانی دەکرد. کە (پەکین) ئازاد کرا، ئەو بزر بوو. ڕەنگە (رینی) زۆر شت لەم بارەیەوە بزانێ. ئینجا پێمگوت:

– تکایە خاڵۆی گەورەت بە خائین دامەنێ! چونکە من لەو باوەڕەدام بڕوای وابوو ئەوەی دەیکا شتێکی چاکە. لەوانەیە ئەویش دەستی لە کاولکاری (پەکین)دا هەبێ. ئەو ساتانەی جەنگم دێتە بەرچاو کە دوژمن دەگاتە بەر دەروازەی شارو زۆر هاوڵاتی وا بە چاك دەزانن بە هۆی سۆزی نیشتیمانپەروەریو بۆ پاراستنی شوێنەوارە نەمرەکانی وڵاتی خۆیان، خۆیان بە دەستەوە بدەن. چین چەند جارێك بە هۆی ئەم جۆرە هاوڵاتییانەوە نەجاتی بووە. تۆ بیر لە پەلاماری مەغۆلەکانو داگیرکردنەکانی (مانشۆ) بکەوە. ئەگەر چاو بەو مێژووەدا بخشێنینەوە، دەبینین پیاوی وەکوو (هان یو – رەن)یش خۆیان بە دەستەوە داوە. بەڵام داگیرکەر هاتنو ڕۆیشتنو چین هەروەکوو خۆی مایەوە. لە بیرت بێ، (پەکین) دەبێ هەمیشە هەر بمێنێو ڕزگار ببێ.

(رینی) هیچ ڕەتی نەدامەوە. هەر ئەوەندە بوو گوێی لێ گرتم وەکوو چۆن منداڵ بە کڕو بێدەنگیی گوێ لە گەوران دەگرێ. بە تەواویش نازانین داخۆ تا چ ڕادەیەك لەو شتانە دەگەن کە بۆیان باس دەکەین. ئەمە ساڵانی دواتر لە هەڵسوکەوتیاندا ڕەنگ دەداتەوە.

ئەوسا بیرم لە داپیرەی (رینی) کردەوە، لە دایکی (جیرالد). بیرم کردەوە ئاخۆ بەسەرهاتەکەی بۆ (رینی) باس بکەم؟ یان نا؟ بەڵام وازم لەم بیرە هێنا، چونکە هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە. بڕیارم دا وێنەی ئەو

گۆڤارەی بە بۆنەی یادی شەهیدبوونی دەرچووە، بۆ کاتێکی لەبارو شیاو هەڵبگرم.

(رینی)، بە دەم سەیرکردنی مانگەوە، لێیپرسیم:

- ئەی باوکم لە ناخی دڵەوە چۆن بوو؟ ئایا زیاتر مەیلی چینی هەبوو؟ یان مەیلی ئەمریکا؟

بەو پەڕی دڵسۆزی وەڵامم دایەوە:

- زەحمەتە بتوانم وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە. من خۆم ئەم پرسیارەم لە خۆم کردووە. وا بزانم کە چینی بێ، بە هەموو مانای وشەوە چینییەو سوورە وا دەربکەوێ، هەندێ حاڵاتی وایش هەیە وەکوو ئەمریکییەکی سرف دەکەوێتە بەرچاو.

- وەکوو؟

(رینی) وەکوو زانایەك بیر دەکاتەوە. چۆن دەتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەی بدەمەوە؟ چۆن دەتوانم باسی ساتەکانی نێوان خۆمو (جیرالد)ی بۆ بکەم. من هەر تەنیا خۆم دەتوانم هەست بە شتی وا بکەم. لەو ساتانەدا، (جیرالد) وەکوو ڕاستەقینەی خۆی دەردەکەوت، توند خووڕەوشتی خۆی دەگرتو ڕێی نەدەدا هیچ شتێ لە یەکمان دوور بکاتەوە. وەڵامم دایەوە.

- ئەگەر شتەکە پەیوەندی بە ماڵو خێزانەوە هەبێ، چینییەکی زێدەڕەوە. باوکی چینی چۆن مامەڵە لەگەڵ کوڕەکەی دەکا، ئەویش سوورە ئاوها مامەڵە لەگەڵ تۆدا بکا. مامەڵەیەکی وا، خۆشەویستی سەختو سەنگین تێکەڵ بە نەرمو ناسکیی ببێ. لێ ناگەڕێ لە بیر بکەی کە تۆ تەنیا کوڕی ئەو نیت، بەڵکو نەوەی چەندەها پشتی کە

پێش تۆ هاتوون و وات لێ دەکا لەو جۆرە کەش و هەوایەدا بژی، ئەی لای تۆیش وا نییە؟

(رینی)، بە ناچاری گوتی:

– با.

ئینجا دوای نەختێ گوتی:

– بەڵام من جگە لەوان ئەژدادی تریشم هەن. باوک و باپیرانی تۆ! دووریش نییە بەوان بچم!

– دوور نییە!

لە دڵی خۆمدا دەمزانی هێشتا وای لێ نەهاتووە بە تەواوی لەم جۆرە شتانە بگا، بەڵام ئایا چیمان لە دەست دێ؟ چیمان پێدەکرێ جگە لەوەی چاوەڕێ بکەین!

ئینجا لە قسەکەی بەردەوام بوو، گوتی:

– دایکە، ئایا تۆ پێت وایە ئەم دووڕەگییە دەوری هەبێ کە کچێ، هەر کچێ بێ، بە من رازی نەبێ!؟

– کچی ئەمریکی؟

– هەڵبەت.

دیارە مەسەلەکە مەسەلەی هەڵبەتە. گوتم:

– بێ گومان، نا. بەڵام بۆی هەیە هەموو کچێکی چینی بە ڕەگی ئەمریکی تۆ رازی نەبێ.

– باوەڕ ناکەم بکەومە داوی ئەشقی هیچ کچێکی چینی.

– هیچ شتێ بە دوور مەزانە! کچی چینی زۆر جوانن! زۆربەیان جوانن.

– من جارێکی تر ناچمەوە چین.

- دوور نییە ڕۆژێ بێو بچی بۆ ئەوەی باوکت ببینی. ئەگەر وا دابنێین باوکت نەهاتە ئێرە.

- ئایا تۆ پێت وایە بێتە ئێرە؟

ئێستا کاتێکی لەبارە بۆ ئەوەی لە نامەکەی ناو چەکمەزەی تایبەتی خۆم ئاگاداری بکەمەوە. چ زوو، چ دەرەنگ، هەر دەبێ ئاگاداری بکەمەوە. بەڵام دەترسم، چونکە هێشتا منداڵەو تێ ناگا. دوور نییە سوێی بێتەوە بۆ ئەو کەسەی نامەکەی ناردووە.

- هیوادارم ڕۆژێ بێو بێتەوە. با بەو ئاواتە بین. (رینی)، ئایا کچەکە کێیە؟ بۆیە وامگوت چونکە دڵنیابووم مەسەلەکە پەیوەندی بە کچێکەوە هەیە. قسە هەر بە دەوری ئەم بابەتەدا دەسووڕاو دەسووڕایەوە. لەپڕ هەستم بە شەکەتی کرد. (رینی) هەر واقی وڕما، لە سەرسامییان قیت بووەوەو گوتی:

- دایکە، ئەوە کوو زانیت؟

- ئەی چۆن، هەڵبەت دەزانم.

وامگوتو پێکەنیم.

- لەوە زیاتریش دەزانم کە تۆ بۆی چووی.

ڕاکشایەوەو چاوی بڕییەوە مانگ.

- مەسەلەکە ئەوە ناهێنێ ئێستا پێت بڵێم. هێشتا وەختی نەهاتووە. ماڵیان لە خانووی خەت سوورو سپی سەری کۆڵانێیە. گەشتیارن.

ڕاستی، بیستبووم ئەو خانووەی (رینی) دەڵێ، ماڵە گەشتیارێکی تێدایە، بەڵام دەرفەتم نەبوو سەردانیان بکەم. هەندێ جار، سەرباری بارودۆخی خۆم، سەردانی گەشتیارەکانم دەکرد. تازە بوو بە ئەرکی سەرشانم دەبێ سەردانی ئەمانەیش بکەم.

- ناوی چییە؟
- ئەللیگرا.
- ناوێکی زۆر تایبەتییە.
- ناوێکی خۆشە، وا نییە؟
- ڕەنگە!
- نازناویشی (وودن)ە.
- باوکی چ کارەیە؟
- بازرگانە لە (نیۆیۆرك). ئەو زۆر نایەتە ئێرە. ئەللیگراو دایکی لێرە دەژین.
- چۆن ناسیاویت لەگەڵ پەیدا کرد؟
- ڕۆژێ، بەرامبەر پرژەی ئاوی (مور)، بە ڕێگادا دەڕۆیشت. منیش بە ڕێکەوت ڕێم کەوتە ئەوێ. لێیپرسیم ماڵمان لە کوێیە؟
- ئەگەر بە ڕاستی ڕات لێیە، دەبێ بیهێنی بۆ ئەوەی بیبینم.

بەو پەڕی وریایی‌و پارێزکاریی دڵ‌و دەروونییەوە وامگوت. کوڕەکەم ئێستا لەبەردەم دووڕیانێکی ترسناکدایە. هێشتا منداڵێکی بچووك بوو، لە باوەشم بوو، چاوەڕێی ئەم کاتەی ئێستام لێ دەکرد.. ئێستا ئەوەتا ئەشقبازیی لەگەڵ ئەو کچە دەکا. من لەوە زیاتر هیچی لە بارەوە نازانم. داخۆ دەبێ ئەو کچە، چتۆ کچ بێ!

ئاخیری پێمگوت:

- دونیا خەریکە سارد دادێ، با بچینە ژوورەوەو دەرگاکان داخەین.

* * *

## (١٣)

هیوادارم ئەم دۆستاتییەی زوو پەرەنەسێنێو نەبێ بە شتێکی تر.
ئەمڕۆ، (رینی)، (ئەللیگرا)ی بە سەردان هێنایەوە ماڵێ. بۆم دەرکەوت، هەموو ڕۆژێ یەکتر دەبینن. شتی وا لە دۆڵەکەمان کارێکی زەحمەت نییە. هاوینەو ڕۆژگار درێژە. خۆر زوو هەڵدێو درەنگ ئاوا دەبێ. (رینی) لەگەڵ (مات) ئیشێکی سەخت لە پاك کردنەوەی درەختو شەکر گرتنەوە لە دار ئەسفندیانو گەڵاڵە کردنی شەراب، دەکا. منیش ئیش‌وکاری ماڵو باخچەو کۆگا دەکەم.

کە ڕۆژ ئاوا دەبێ، پێش ئەوەی بخەوین، چەند سەعاتێ بێ‌ئیشین. (رینی) دەچێتە دەرەوە. لێی ناپرسم دەچێتە کوێ؟ و کەی دێتەوە؟ لەو تەمەنەدا، دەیەوێ ئازادی خۆی وەربگرێ.

ئەمڕۆ، دوای شێو خواردن، جێی هێشتینو ڕۆیشت. دیم بە پەلە ڕۆیشت. ڕووی لە ماڵی برادەرەکەی بوو. سەعاتێکی نەبرد هاتەوە کچەی دۆستو برادەری لەگەڵدا بوو.

– دایکە، ئەمەیە (ئەللیگرا وودن)!

ئەو کاتە من لە ژووری دانیشتن، دانیشتبووم هەندێ جلم پینە دەکرد. (بابا)یش لەوێ بوو، لەسەر کورسی تارو نەرمی خۆی

دانیشتبوو. پێڵاوی حەریری چینی لە پێ و ڕۆبی سووری لەبەر بوو. بە ڕۆژ، لە قژو ڕدێن شووشتن یارمەتیم دەدا. قژی سەرو مووی ردێنی وەکوو بەفر سپی ببوو.

– چۆنی (ئەللیگرا)؟

کاتێ هاتە ژوورەوە، هەر بە دانیشتوویی، بێ ئەوەی لەسەر کورسییەکەم ببزووم، بەم جۆرە بە خێرهاتنم کرد. ئەوەندە بوو بە پێی ڕەوشتی خۆم، چاویلکەکەمم لە چاو کردەوە، چونکە چینی پێیان جوان نییە، بە چاویلکەوە چاك‌و چۆنی لەگەڵ کەس بکەن: چ برادەرو چ نەناسیاو!

کچەکە بە شێوەیەکی ناسك‌و جوان، چاك‌و چۆنی لەگەڵ کردم. دەستی ناسکۆڵەی بۆ درێژ کردم:

– خانمی (ماك لیود) چۆنی؟

منیش چاوم بڕییە (بابا)و، گوتم:

– ئەمەیش باپیری (رینی)یە.

باپیر، شتەکەی بە هەند وەرنەگرت. لە باتی ئەوەی چاك‌و چۆنی لەگەڵ (ئەللیگرا) بکا، بە زمانێکی چینی ڕوون لێیپرسیم:

– ئەم کچە کێیە؟

(رینی)، لە شەرمان دەم‌وچاوی سوور هەڵگەڕا. زۆر جار دەیگوت چی زمانی چینیم دەزانی هەموویم لە بیر چۆتەوە. بەڵام لە کاتی پێویستدا، بە بیری دەهاتەوەو دەیزانی، وەکوو ئێستا بۆم دەرکەوت. ئینجا بە تیزەوە، بە ئینگلیزی گوتی:

– باپیر، ئەمە (ئەللیگرا وودن)ی برادەرمە! دایکم حەزی کرد چاوی پێ‌بکەوێ.

باپیر، سەرنجێکی خێرای لە نەوەکەی دا. ئینجا بێئەوەی تەماشای لای ئەو بکا، بێئەوەی هیچ قسەی لەگەڵ بکا، سەری باداو بە چینی گوتی:

– ئەمە دەبوایە ئێستا لەماڵەوە، لای دایكو باوکی بێ!

پێکەنیمو گوتم:

– (ئەللیگرا)، گوێ مەدەرێ! ماوەیەکی زۆر لە چین ژیاوە. لە بیری کردووە کە ئەمریکییە.

(ئەللیگرا) چاوە شینەکانی زەق کردەوەو گوتی:

– لە (چین)؟ (رینی) باسی شتی وای بۆ نەکردووم.

دیارە (رینی) هەموو شتێکی بۆ باس نەکردووە، جا دەبێ ئاگام لە قسەکانم بێ، دەبێ بزانم باسی چ دەکەم. ئینجا بە شادی گوتم:

– بەڵێ، هەموومان ماوەیەك لەوێ ژیاوین. باوکی (رینی) ئێستایش لەوێیە. (رینی) خۆیشی لە (پەکین) لە دایك بووە.

– بە ڕاست؟

– بەڵێ، بە ڕاست!

– ئەی (چین) وڵاتێکی کۆمۆنیست نییە؟

– با حاڵی حازر کۆمۆنیستە!

– ئەی باوکی (رینی) چۆن دەتوانێ.......

– بەڕێوبەری کۆلیجێکی گرنگە. بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ لەگەڵ قوتابییەکانیدا بێ.

– تێگەیشتم.

بەڵام زانیم تێنەگەیشتووە. چاوە شینەکانی زەق کردەوەو لە (رینی) وردبووەوە. دەمی قسەم لە (رینی) کردو گوتم:

- هەندێ چلوورەمان بۆ بێنە! لەناو شەختەبەندی سارنجدایە.
- ئەللیگرا، با بڕۆین!

دەستی گرتو چوونە دەرەوە.

ئەمە سەرەتا بوو. نازانم کۆتاییەکەی چۆن دەبێ. ئێمە لەناودۆڵێکی بچووکدا دەژین. یەك تاکە وشە بەسسە بۆ ئەوەی بلێسەی پڕوپاگەندە بتەنێتەوە. یەك وشەو بەس، وەکوو وشەی (کۆمۆنیست)، یان هەر وشەیەکی تری وەکوو وشەی (چین)ت لە دەم بێتە دەرەوە...

ئەو شەوە، کە (رینی) هاتەوە، هاواری کرد. گوتی:

- چ پێویستی دەکرد تۆ بە یەك جار هەموو شتێکی پێ بلێی!؟
- هەموو شتێکم پێنەگوتووە.

(بابا) چووبووە ناو جێ. من هەر دانیشتبووم، دەمزانی بێتەوە گلەییم لێ دەکاو سەرکۆنەم دەکا.

- پێیگوتم: ئێستا زانیم تۆ بۆچی دیمەنێکی سەیرت هەیە!

(رینی) وایگوتو بە دەم قسەکردنەوە، لە خەفەتان، گەرووی گیرا. ئەو کاتە زۆرم حەز کرد هەستم باوەشی پێدا بکەمو توند بە خۆمییەوە بگوشم، بەڵام دەمزانی ڕازی نابێ باوەشی پێدا بکەم. پێم وایە، وا چاکە، لەگەڵ یەك ڕاست بین. ڕاستیی بە یەك بڵێین، هەموو ڕاستییەك. پێمگوت:

- ڕاستەقینەی خۆت چۆنە، دەبێ ئاوها وەکوو خۆی وەری بگری. تۆ ڕەگێکی چینیت تێدایە. چارەکێکیی خوێنی دەمارەکانت چینییە. لەوانەیە، بە مەیلو ئارەزوو، لەوەیش زیاتر بێ. تۆ ئەمەت بەلاوە چییە؟ من تەنیا یەك شت دەزانمو لەوە زیاتر نازانم. تۆ دەبێ مل بۆ ڕاستی خۆت دابنەوێنیو نکووڵی لە هیچ شتێکی خۆت نەکەی، هەر چەندە

کەمو بێنرخیش بێ، ئەگەرنا هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان، لە ژیانتدا بەختەوەر نابی! تۆ بتەوەیْو نەتەوێ نەوەی ڕەچەڵەکێکی خانەدانی، بەڵام ئەو ڕەچەڵەکە، لە دوو ڕەگەوە هاتووە: هەر ڕەگێکی لە لایەکی ئەم دونیایەوە چەکەرەی کردووە.

هیچ تەماشام نەکرد. ماچێکم لە ناوچەوانی کردو ڕۆیشتم. کچی وەکوو (ئەللیگرا) لەم دونیایەدا، ئاوقووفی کوڕی من نین. پێویستە کوڕەکەم ئەمە بزانێو کە زانیو ئازارو تاسانی نەما، ئەوسا کچێکی ئاوقەرانی خۆی دەدۆزێتەوە. هەردووك لێك دەوەشێنەوەو بۆ یەك دەبن: ئەم بۆ ئەوو ئەو بۆ ئەم! کچەکە چ چینی بێو چ ئەمریکی، گرنگ نییە.... ئەمە جارێ لە پشت پەردەی غەیبدایە.

* * *

# (١٤)

هەموو جارێ بیر دەکەمەوە چ بوو وای لێکردم (جیرالد) بەو پیاوە ببینم کە خۆم دەمەوێ؟ ئەوەندەی ئێستا دەتوانم بە خۆمدا بچمەوە، بیرم دەکەوێتەوە، من کچێکی ئاسایی بووم. ژیانی دەوری منداڵیم هیچ شتێکی نائاسایی تێدا نەبوو لە کچانی ترم جودا بکاتەوە. تەنانەت دایکیشم کاریگەرییەکی وای لە سەرم نەبوو. دایکم سۆزی زۆر کەم بوو. لەو کلێسەیەی هاتوچۆمان دەکرد شتێ لە تاقی کردنەوەی ژیان فێر بووم کە خەڵك تووشی هەراسانیی دەکا. باوکم یەکێ بوو لەو کەسانەی باوەڕییان بە هیچ نییە. حەزی نەدەکرد باسی بیروڕای تایبەتی خۆی بکا.

ئەو ڕۆژەم باش لە بیرە. بەهار بوو. من لە پۆلی کۆتایی خوێندن بووم لە (برادکلین). بە پەلەپرووزێ بۆ دەرزی فەلسەفە دەچووم. وەکوو قوتابییەکی زیرەك لە خوێندن، یەك کۆمەڵە کتێبم لە بن هەنگڵ بوو. ئەو سەردەمە شەرممان بە شتی وانەبوو. وەکوو ئەم زەمانەی ئێستا نەبوو کە کوڕی گەنج هەوەسیان بەم جۆرە کچە جدییە نایە. ئەمەم لەوەوە زانی (ئەللیگرا) ئەو ڕۆژە بە ئەنقەس نازی دەکردو خۆی لە گێلی دەدا. ڕاستی، نازانم... نازانم داخۆ ئەم جۆرە دەورگێڕانەی هیچ ڕاستی تێدا

هەبوو؟ یان نا؟ بەڵام من خۆم کاتێ کچە قوتابی بووم، قەت بە خەیاڵمدا نەدەهات ئاوها دەور بگێڕم.

گوتم بە پەلە پڕووزێ بۆ وانەکەم دەچووم، چونکە لە وادەی خۆی دواکەوتبووم. جوانیی‌و خۆشی ئەو ڕۆژە هەست‌و هۆشی لە لا نەهێشتووم. شەیدای ئەو هەوا گەرم‌و خۆشە بووم. بەڵام هەوڵم دا بەمە خۆم لە تیۆرەکانی (کانت)و ئاسۆو بیروڕاکانی بێ بەش نەکەم. دەق لەو ساتەدا، ئەو ساتەی چارەنووس داینا بوو، (جیرالد)م بینی. ئەویش بە ئەدگاری دڵکێشی خۆیەوە لە سەر پلیکانە ڕایدەکرد. لەو هۆڵە هاتبوو دەرێ کە من بۆی دەچووم. تا ماوم لە بیر ناکەم، ئەگەر لە پیرییان سۆمای چاویشم دابێ، چۆن تیشکی خۆر لەسەر قژی ڕەشی دەبریسکایەوەو چۆن چاوی ئاورینگی دەهاویشت. پێستەی لەشی لووس‌و ڕەنگی دەتگوت عاجە. هەموو گیانی سەرشار بوو لە بزۆزی‌و چالاکی.

هەندێ چینی لەشیان سیحرێکی تێدایە تایبەتە بە خۆیان، لە پێستەی لەشیان دەردەکەوێ و ڕەنگی خوێن جوانترو سافتری دەکا. (رینی)یش ئەو جۆرە پێستەی لەشی لە باوکی بۆ ماوەتەوە، بۆیە (ئەللیگرا) کاتی سەمای لەگەڵ دەکرد، ڕوومەتی لە ڕوومەتی دەخشاند. شەوی شەممەی ڕابردوو ئەمەم بە چاوی خۆم لە بنکەی کۆمەڵە بچووکەکەمان لێ دی. من خۆیشم کاتی خۆی حەزم دەکرد، ڕوومەت لە سەر ڕوومەت، سەما لەگەڵ (جیرالد) بکەم.

ئەو ڕۆژە، کە لەسەر پلیکانە لێك ڕاست هاتین، هیچ قسەمان لەگەڵ یەك نەکرد. تەنیا بە وردی سەیری یەکترمان کرد. من لەو کاتەدا بۆ هەتا هەتایێ بڕیاری خۆمم دا. بڕیارم دا بزانم ئەو پیاوە کێیە؟ ناوی

چییە؟ بڕیارم دا دەبێ ئەم پیاوە بۆ من بێ‌و دەبێ ئەویش بزانێ من ئەم بڕیارەم داوە.

ئەمە بە ڕۆژێك‌و حەفتەیەك نەهاتە دی، یەك مانگی ڕەبەقی خایاند. هەمیشە تەماشام دەکردو چێژم لە قۆزییەکەی وەردەگرت. بۆم دەرکەوت هیچ پیاوی وا قۆزم نەدیوە. هەر زوو بیانوویەکم دۆزییەوە بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەم.

خۆم دانووساند کاتێ لە هۆڵەکە چووە دەرەوە، منیش چوومە دەرەوە. زۆر بە شەرم‌و حەیا بوو!! خۆم تێ‌هەڵنەقورتاند. لە ڕاڕەوەکەدا شان بە شانی ڕۆیشتم بۆ ئەوەی لێم بزر نەبێ. ڕۆیشتین تا گەیشتینە دەرگای دەرەوەی بیناکەو لەوێوە بۆ سەر جادە. وردە وردە بەم جۆرە لەگەڵیا جوولامەوە، تا ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئەوەم کرد بە بیانوو کە بێگانەیەو داوام لێکرد بێتە دیدەنی دایکم چونکە وەکوو دەمدی، کە بە خۆیشم گوت، هیچ برادەری نەبوو.

من سەرەتای خۆشەویستیم بەم جۆرە دەستی پێکرد. بەڵام هەستم دەکرد ئەو تا پێی بکرێ ڕێ نادا من لە هەستی ڕاستەقینەی بگەم بەو جۆرەی خۆم دەمەویست. ماوەیەکی زۆر پێکەوە هەژاینەوە: دوو مانگ، سێ مانك، چوار مانگ‌و... تا کاتێ هات پێی گوتم دوودڵ‌و دڕدۆنگە.

لە خەنی خۆشییان پێکەنیم‌و گوتم:

– بڵێ، چت هەیە، بڵێ!

– نازانم، داخۆ بە برادەرایەتی من ڕازی دەبی، یا نا!؟

لێوی وشکی تەڕ کرد. گوتم:

– بۆ ڕازی نابم؟!

دوای ئەوەی زەماوەندمان کرد، لیم پرسی: ئەو ڕۆژە بۆچی دوودڵ بووی؟ ئەو حەلە لە قەراخ ڕووباری (چارلز)، لەسەر لاتەختێك دانیشتبووین. خۆر لە تاقی ئاسمان بوو، چی کتێبمان پێ بوو هەموومان فڕێ دابووە بەر پێمان.

ئەو حەلە ببووین بە ژن و مێرد. لە ژووری نووستنی خۆمانەوە، کە بەسەر حەوشەی ڕۆژهەڵاتی خانووەکەی (پەکین)دا دەیڕوانی، شەوبێرییەکی خۆشمان کردبوو و خۆمان بۆ نووستن ئامادە دەکرد. بە دوودڵی وەڵامی دامەوە:

– ڕاستی، وەکوو خۆت دەزانی هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات کچێکی ئەمریکیم خۆش بوێ.

– ئەی ئێستا خۆشت ناوێ؟ ئەگەر منت نەهێنابا، کێت دەهێنا؟

دانی بە خۆیدا گرت و بە سەنگینی گوتی:

– هەمیشە بە تەما بووم زەماوەند لەگەڵ کچێکی چینی بکەم. خاڵم پێیگوتبووم دایکم وای ویستووە.

لە مێژ بوو وای پێ دەگوتم. بەڵام من پێم وا بوو دایکی ژنێکی مردووەو هیچی تر. قسەو ڕاسپاردەکانی هیچ بایەخیان نییە. ئەو شەوە خەریك بوو ئەمە لە بیر بکەم، تا ئەوە بوو (ئەللیگرا) هات و ئەو بیرەوەریانەی لە لا بزواندم و خەیاڵی بە ئاگا هێنام.

هەموو جارێ، ناو بە ناو، سەیری وێنەی دایکی (جیراڵد)م دەکرد. هەموو جارێ کە لە جێی خۆی دامدەنایەوە، دەمگوت جارێکی تر دەری ناهێنم تا ئەو ڕۆژە دێ پێشانی (رینی) دەدەم. بەڵام وێنەکە هەرگیز لەبەر چاوم لانەدەکەوت! تا دووبارە تەماشام نەکردایە، دڵم ئۆقرەی نەدەگرت. ئەو شەوەیش تەماشام کرد. لە ناو چەکمەزەی مێزی

تایبەتی خۆم دەرم هێنا. لەبەردەمی خۆمم داناو لێی ورد بوومەوە. دەموچاوی هەر وەکوو خۆی هێمنەو نەگۆڕاوە. دەموچاوی سارد نییە. ئەو ساردییەی دیارە وەکوو پەردە بەسەریدا کشاوە، تەنیا ڕووبەندێکی ڕووکەشە. لە درزی ئەو ڕووبەندەوە سەرنجێك دەبینی لە چاوی هەموو ژنێکی چینیدا دەبریسکێتەوەو هێزو گەرمی لێ دەپرژێ. ئەگەر بە ڕێکەت، تووشی یەکتر بباین، لەوانە بوو ببین بە دەستە خوشك. ئەوە ناڵێم ئەگەر ئەو دوژمنداریی کردبام، بەڵام من خۆم هەرگیز دوژمنداریی ئەوم نەدەکرد. وام نەدەکرد بە دیمەنی ئەو ژنە چینییە تەفرە بخۆم. ئەو کچانەی وەکوو جوانترین گوڵ بوون تەفرەیان دەدام.

ژنی چینی، کەسێتییان لە کەسێتیی ژنی هەموو دونیا بەهێزترە. شتێکی سەیریان هەیە، ئەویش ئەوەیە بێ زەڕو بێوەی دیارن. بەڵام ژنی وەکوو خۆیان ڕەقو سەرسەخت نییە. بە کەسێتی بەهێزی خۆیانەوە بە سەر کەسێتی پیاوەکانیاندا زاڵ دەبن. باشە، ئەم هێزەیان لە کوێ بوو؟ ئەمە ئەو هێزەیە کە چەند سەدەیەکی دوورو درێژە بۆیان کۆبۆتەوە. ئەمە ئەو هێزەیە لای ناپەسندەکان کۆ دەبێتەوە. کاتی خۆی تەنیا نێرینە لە کاتی لە دایکبووندا، بە گەرمی پێشوازیان لێ دەکرا. هەر تەنیا نێرینە ئەو پەڕی بایەخییان پێ دەدراو چاوەدێری دەکرانو نازیان هەڵدەگیرا. مێینەکان نەوە دوای نەوە ئەمەیان قبووڵ دەکرد. بەبێ دەنگی ئەم جیاوازییەی نێوان نێرومێیان قبووڵ دەکرد. لێرەدا، ژن دەستی پێکرد.... دەستی پێ کرد فێر ببێ بۆ یەکەم جار بیر لە خۆی بکاتەوە. نهێنی خۆی بپارێزێو ئەو هەقەی پێینەدراوە بە خورتی وەری بگرێ. ناچار بوو خۆی کزۆڵە بکا بۆ ئەوەی ئازار نەخواو ئاینو ئۆین بکا بە قەڵغانێكو خۆی لە پەنا بشارێتەوە تا بە مەبەستی خۆی

دەگا. هەموو ئامانجی تەنیا دابین کردنی ئاسایش‌و بێغەمی‌و شادومانی بوو. ئەمە بەش بە حاڵی ژنی ئاسایی وا بوو، خۆ ئەگەر ژنەکە ژنێکی گەورەو مەزنی وەکوو دایکی (جیرالد) بوایە، ئەوسا هیچ شتی لە قوربانی دان گەورەترو مەزنتر دەست نەدەکەوت.

وێنەکەم لە جێی خۆی، لەناو چەکمەزەکە دانایەوەو توند چەکمەزەکەم داخست. بەلاّم وێنەکە هەمیشە لەبەر چاوم بوو، هەرگیز لێم جیا نەدەبووەوە. بەردەوام نیگەرانی دەکردم.

ئەمڕۆ، شەممە بوو. من‌و (بابا) لە کاتی ناشتا کردندا تەنیا بووین. (رینی) چووبووە ڕاوەماسی. خۆی گوتی دەچمە ڕاوە ماسی، جا نازانم!! بەروەست خۆم نەهاتم چوومەوە سەر باسی ژنەکە:

– (بابا) ڕەنگە لە بیرت بێ، باسی دایکی (جیرالد)مان دەکرد!

لەو کاتەدا، (بابا) وەکوو چینییان، برنجی بە پەلووچکە دار دەخوارد. ڕەوشتی وا بوو ئەگەر برنج لەسەر سفرە بوایە، برنجەکەی دەخواردو بە پەلووچکەداریش دەیخوارد. منیش زۆر جار برنجم لێ دەنا چونکە دەمزانی حەزی لێ دەکاو ئەگەر برنج لەگەڵ خواردنی تر لەسەر سفرە بێ، لە برنجەکە زیاتر ناخوا.

– بەڵێ، باسی ئەومان دەکرد. دەمەوێ زیاتر باسی بکەم.

پەلووچکەدارەکەی لەسەر مێز داناو گوتی:

– دەتەوێ زیاتر چ شتێکی لەبارەوە بزانی؟

– وێنەیەکم لایە. لە سەرەوە، لە ژووری خۆمە!

ڕەنگی زەرهەڵگەڕاو گوتی:

– لە کوێت بوو؟ چۆنت پەیدا کرد؟

– لە گۆڤارێك بلاّوکرابووەوە.

- نەمتوانی پێی بڵێم (جیرالد) بۆی ناردووم.

خێرا چووم هێنام‌و لە بەردەمم دانا. چاویلکەی کردە چاوو بە وردی تەماشای کرد. ئینجا بە شێنەیی گوتی:

- بەڵێ. بەڵێ، خۆیەتی! بەڵام وەکوو خۆی نەماوە کە من دیبووم.

- خۆی چۆن بوو؟

برۆ سپییەکانی هێنایەوە یەك‌و بیری کردەوە. پێی وابوو کاتێ ڕۆژی زەماوەند، ڕوو پۆشی لە ڕوو لادا، لەمە جوانتر بوو. ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو. پێمگوت:

- ئینجا؟

- ئینجا لە جوانییەکەی دڵنیا نەبووم. دەیتوانی ڕووی بە نامۆ پێشان بدا.

- بۆچی وای دەکرد؟

- ئەو پرسیارەم لێ نەکرد. میانەمان وانەبوو پرسیاری وای لێ بکەم.

نەمتوانی قسەکە ببڕمەوە، پێمگوت:

- بەڵام ئێوە کوڕێکتان لە بەیندا هەبوو!

ڕوومەتی سوور هەڵگەڕاو گوتی:

- ڕاستە! نا. ئاخ، نا..... بەڵام خۆت دەبینی.....

- (بابا) من هیچ نابینم.

- هەر منداڵێ، هەرچی هەبێ، پەیوەندی بە شتی واوە نییە، ئەم ژنەیش – خۆت دەزانی. مەبەستم ئەوەیە.... باشە، سەرەڕای منداڵیش شتی وا ڕوودەدا.

- ڕەنگە ئەمە بەلای پیاوەوە وابێ، نەك بەلای ژنەوە.

- ڕاستە!

ئینجا بەردەوام بوو:

– هەر چۆنێ بێ، لە دایکبوونی (جیرالد) سنووری بۆ هەموو شتێك دانا.

– ئایا خۆت ئارەزووت وا لەسەر بوو؟

– نەخێر! .... ئەمە لەسەر ئارەزووی ئەو بوو!

– تۆ هەموو شتێکت لە بیرە.

– زۆر شتم لە بیرکردووە.....

کە وای گوت. بیروبۆچوونی لەبەرچاوم ڕوون نەبوو! ئینجا دەستی دایەوە دارۆچکەکەو سەر لەنوێ دەستی بە برنج خواردن کردەوە. هەموو شتێکی لە بیرە. بەڵام ئێستا هیچ شتێکی ئەو بیرەوەرییە هەستو سۆزی نابزوێنێ. بیر دەکەمەوە داخۆ قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو ژنە چینییە ئەم پیاوەی خۆش ویستووە، کە زانیویەتی ئەو ئەو پیاوە ئەمی خۆش ناوێو قەناعەتی بەو بۆچوونەی خۆی هێناوە.... لە ڕێی ئەو منداڵەوە کە سوور بووە بیگرێتە باوەشو لای خۆی گلی بداتەوە. دەبێ کەس هەبێ ئەم هەموو شتەم بۆ ڕوون بکاتەوە!!؟ ئەو منداڵە (جیرالد)بوو.

* * *

# (١٥)

ئەمشەو مانگ پڕە، چواردەشەوە. چیاکان لە ژێر تریفەی مانگەشەودا ڕاکشاون. سێبەری دۆڵەکان ڕەش‌و تارییە. شانشینی لای ڕۆژئاوای ماڵەوەمان بە سەر ئەم دۆڵە دوورو دێژەدا دەڕوانێ. ڕێگامان وەکوو ماری زیو لەبەرچاو ڕاکشاوە. لە دوورەوە، لەو سەری ڕێگاکە، دوو تارمایی دەبینم دەجوولێنەوە، قۆڵیان لە قۆڵی یەکتر هەڵکێشاوە بێشك ئەمە تارمایی (رینی)و (ئەللیگرا)یە.

ئەم دوو دڵە، لە بەدبەختی خۆیان بوو، لە بەهارێ تووشی یەك هاتن. ئاسان نییە خۆشەویستی کەسانی وەکوو ئەمانە لە زستان دەست پێ بکا. زستان بۆ ئەوانەی زەماوەندییان کردووە بریتییە لە خۆشەویستی ناو چوار دیوار. کە لە دەرەوە بەفر دەبارێ‌و لە ژوورەوە شەوێکی گەرم بەسەر دەبەن.

بەفرێکی چڕو ئەستوور لە (پەکین) دەبارێ، لە قوفڵ لێدان توندتر دەرگای ماڵەکان دادەخا. چینی حەز لە جوانی بەفر دەکەن‌و زۆر ڕێزی

لێ دەنێن. نیگارکێشەکانیان، لەگەڵ ڕەنگی کولووکی قەنەفڵیی خۆخو بەری سووری فراولەی سەر قامیشی هیندی، جەخت دەکەن سپێتی بەفریش لە تابلۆکانیان نیشان بدەن. لەگەڵ ئەوەشدا حەز ناکەن بە پێ لە سەر بەفر بڕۆن چونکە پێڵاویان قەدیفەیەو بەرگەی ڕۆیشتنی سەر بەفر ناگرێ. بۆیە لەو شەوە بەفرانەدا کەس نەدەهاتە سەردانمان. دەرگەوانیش حەزی نەدەکرد لە ژووری خۆی بێتە دەرەوە کە لە تەك دەرگای گەورەی حەوشە بوو.

بەم جۆرە دڵنیابووین کەس هێمنیو ئارامیمان لێ تێك نادا. خەڵووزمان لە سۆبەی بەرمیل دەکردو مۆمەکانمان دەکوژاندەوەو لەبەر گڕی لەرزانی ئاگری سۆبە دادەنیشتین. ئەو ساتانە ساتی خۆشەویستی بوونو لەبارترین ساتیش بوون.... ئەو ساتانە، بە درێژایی شەو، بە خۆشەویستیو دڵنیایی بێوێنەوە درێژ دەبوونەوە.

زستانی (ڤێرمۆنت)یش هەروایە. بەفر لەناو چوار دیواری ماڵەوە بەندم دەکا. بەڵام من بەندی خۆشەویستی نیم. ئەوەتا بە تەنیا لەتەك سۆبە دانیشتوومو (رینی) لە ژوورەکەی خۆی دانیشتووە، دەرزەکانی دەور دەکاتەوە.

هاوین هاتو من هەر بە دەست تەنیاییەوە ئازارم دەخوارد. (رینی) دەچوو پیاسەی لەگەڵ (ئەلیگرا) دەکردو من تەنیاییم سەختر دەبوو. ئەوەتا هاتن گەیشتنە ئەو سەری ڕێگاکە. لەبەر تریفەی مانگ تێپەڕینو کەوتنە بەر سێبەری دار ئەسفەندیانو ئیتر لەبەر چاوم بزر بوون!!.

ئەمە یەکەم ئێوارەیان نەبوو دەچوونە پیاسە. لەگەڵ گۆڕانی مانگی نوێ بارودۆخیان گۆڕا بوو. ئەمەم بە گۆڕانی بارودۆخی(رینی) زانی. بە پێچەوانەی ڕەوشتی خۆی، کپو بێدەنگ ببوو. دەهاتو دەچوو، بێ

ئەوەی یەك قسەی لە دەم بێتە دەرەوە. ئەگەر هەستی کردبا من تەماشای دەکەم، تەماشای نەدەکردم. دەتگوت هەستی کردووە دەمەوێ پرسیاری هۆی گۆڕانی بارودۆخ و خوو و ڕەوشتی لێ بکەم. سەری وەردەسووڕاند وەك ئەوەی نەیەوێ وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە.

دوێ شەو، کە هاتەوە، چیدی خۆم پێنەگیرا. توخوا ئەگەر (رینی) بڕوا من کێم دەمێنێ؟ تا پاش نیوەشەو لە شانشین مامەوەو شەونخوونیم کرد. دونیا ساردبوو، ناچاربووم کۆڵوانە سوورەکەمم لە خۆم لوول دا. ئاخیری دیم (رینی) لە تەلانی گردی ئەو بەرەوە، دەرکەوت و بەرەو ماڵ هاتەوە. وەکوو پیاوێکی کەڵەگەت و بەهێز دەکەوتە بەچاوم. بێ شك شتێ هەیە وای لێ کردووە پێش وەخت ببێ بەو پیاوە. کە لێم نزیك کەوتەوەو منی بینی، نەهاتە لای شانشین، یەکسەر ڕووی کردە دەرگای مدبەق.

– (رینی).....

کە گوێی لە دەنگم بوو، دەستی لەسەر کلیلی دەرگا ڕەق بوو و راوەستا.

– بەڵێ.

– تکایە تا ئێرە وەرە!

بەبێ ئارەزووی خۆی، بە شێنەیی و ئارامی هات. پێی گوتم:

– شەونخوونییەکی زۆرت کێشاوە....

– چاوەڕێی تۆم دەکرد.

بە دەنگێکی تەواو پیاوانە پێی گوتم:

– نەدەبوایە چاوەڕێم بکەی. نە ئەمشەوو نە هیچ شەوی تریش.

– تا نەزانم لە کوێی، خەوم لێ ناکەوێ.

- لیّ ڕادێی و بێئەوەی بزانی لە کویێم، خەوت لیّ دەکەویّ.

بە ساردی وای گوت. بەم قسەیەی تووڕە بووم چونکە دەمزانی کەوا دەڵێ بە ڕاستییەتی. منیش کە زۆر تووڕە دەبم، خۆم پیّ ناگیریّ، چی لە دڵمدایە هەڵیدەڕێژم.

- دەزانم تۆ هەموو ئێواران لەگەڵ (ئەللیگرا) دەچیتە دەرەوە. ڕاستیت پیّ بڵێم من ڕام ڕام لەو کچە نییە.

ئەمە یەکەم جار بوو بە ڕوونو ئاشکرا گوتم ڕام لەو کچە نییە کە (رینی) خۆشی دەویست. ئایا تا چ ڕادەیەك لەو خۆشەویستییەدا نقووم ببوو؟ نازانم ڕای لەبارەی خۆشەویستییەوە چییە؟ ئەگەر (جیرالد) لێرە بوایە - کە هەق وابوو لێرە بێ بۆ ئەوەی لە پەروەردەی کوڕەکەمان یارمەتیم بدا - بە یەکەوە گفتوگۆمان لەسەر مەسەلەکە دەکردو داوای یارمەتیو شیرەتو ئامۆژگاریم لیّ دەکرد. بەڵام ئاخۆ ئەو ڕازی دەبوو لەم بارەیەوە قسە لەگەڵ (رینی) بکا؟

(خاتوو لاندیس)ی ژنە دراوسێمان، کە ئەزموونێکی زۆری هەیە، ڕای وایە باوك ناتوانیّ لەم بارەیەوە قسە لەگەڵ منداڵەکانی بکا. باسی دەکرد مێردەکەی هەرگیز ئەم جۆرە باسانە لەگەڵ منداڵەکانی ناکاتەوە: (ئەوەتا هەموو منداڵەکانمان گەورەبوونو پێگەیشتنو زەماوەندیان کرد، باوکیان لەم بارەیەوە هیچ قسەی بۆ نەکردن.)

ژنە دراوسێکەمان خۆیشی نەیدەتوانی لەم بارەیەوە قسە بۆ منداڵەکانی بکا. دوای ئەوەی بە ئاشکرا وای پێگوتم، لێمپرسی؟

- باشە هۆی چییە.

ڕاستەوخۆ وەڵامی دامەوە:

- چونکە ئەگەر وا بکەم، هەست دەکەم هەموو شتێکی خۆمم بۆ منداڵەکانم باس کردەوە. ئەمەیش نابێ. چونکە منداڵ نابێ هەموو شتێکی دایبابیان بزانن.

منداڵەکانی ژنە دراوسێکەمان زەوماوەندیان لەگەڵ ژنی خاتوون و بەرێزی ئەو ناوچەیە کردووە. ڕەنگە قسەکانی لەگەڵ بارودۆخی ناوماڵی خۆیانەوە بگونجێ، بەلام بۆ من وا نەبوو. من تەواو تامی خۆشەویستیم چەشتبوو، تا تلپی بنی بادەکەم هەڵقوڕاند بوو. هیوادارم کوڕەکەیشم ئەو شادیو بەختەوەرییەی بە نسیب ببێ کە بۆ من ڕەخسا.

ئاخیری پێمگوت:

- دانیشە، (رینی)، ڕاستە وەختەکە درەنگە بەلام قسەیەکم هەیە دەمەوێ پێت بڵێمو نابێ دوا بکەوێ.

(رینی) لە سەر مێردرەوی شانشینەکە دانیشت. پشتی دایە مانگو ڕووی کردە من. ئەو دەم چاوی کەوتە بەر سێبەرو من دەمو چاوم کەوتە بەر ڕووناکی. لە قسەکەم بەردەوام بووم:

مەسەلەکە مەسەلەی ئەللیگرا نییە، ئەویش وەکوو هەموو کچێکی تر جوانو نازدارو ساکارە. ڕەنگە ئەویش بتوانێ جۆرە پیاوێك، پیاوی خۆی، بەختەوەر بکا. ئەو جۆرە پیاوەی ئەو بەختەوەری دەکا، خواستو داواکاری ئەوەندە زۆر نییە. ئەو جۆرە پیاوە شەیدای سادەییو ساکارییە. بەلای منەوە، ئەو جۆرە پیاوانە زۆربەیان هاتوچۆی یانەکان دەکەن. لەم یانەوە دەچنە ئەو یانە. تووشی هەر کەسێ بن بە گەرمو گوڕی بە دەمییەوە دەچن. دۆستایەتیو هاوڕێیەتی زۆر کەس دەکەن. هیچ ناخوێننەوە. کاتی خۆیان بە گوێدانە مۆسیقای

خۆش بەسەر دەبەن‌و شەوی شەممە، تەماشای فلیمی کاوبۆی دەکەن‌و چێژێکی تا بڵێی خۆشی لێ وەردەگرن.
کچی وەکوو ئیللیگرا بۆ ئەو جۆرە پیاوانە باشن!! ئەو جۆرە پیاوە بەختەوە دەکەن‌و خۆشیان لەگەڵ ئەوان بەختەوەر دەبن. هەردوولا لێك دەوەشێنەوە. چونکە هەردوو لا دڵیان بچووکەو لەئەندازەی خۆی زیاتر ناگرێ. جا ئەوەی پێکی دەگۆڕنەوە، وەکوو دوو فنجانی یەك قەبارە، دڵی هەردووکیان پڕ دەکا!! بەڵام تۆ (رینی)، ئەو ئەندازە کەمەی خۆشەویستی بەشت ناکا کە تەنیا پڕ بە فنجانێك دەبێ‌و بەس!!. تۆ پێویستت بە یەك لافاوی خۆشەویستی بەرامبەرت هەیە! تۆ پێویستت بە خۆشەویستییەکی نەمرو بەردەوام هەیە! کوڕم، تۆ دەبێ بۆ خۆت بە دوای ژنێکی پڕ سۆزدا بگەڕێی. ژنێکی وابێ خۆشەویستی دڵی هەرگیز وشك نەکا. ئەگەر تۆ بتوانی شتێکی وا بکەی، بڕوات هەبێ، هەر چەندە شەو درەنگ بێیتەوە، من لە چاوەڕوانی تۆدا خەو لە خۆم حەرام ناکەم، چونکە ئەو حەلە دڵم ئۆقرە دەگرێ‌و کەلەکەم دەکەوێتە عەردی.
- تۆ ئیللیگرا وەکوو ڕاستەقینەی خۆی ناناسی.
- دایك، ئەو کچە دەناسێ کە کوڕەکەی حەزی لێ دەکا.

پێشتر قەت بەم جۆرە قسەم نەکردبوو. ئەم جۆرە قسەیەم هەر بە خەیاڵیشدا نەدەهات. تەنیا ئەو کاتە بیرم لە قسەکانم دەکردەوە. ئەوەی گوتم شتێکی ڕاست‌و دروست بوو بەش بە حاڵی نەوەکانی میللەتەکەم.
- ئیللیگرا دەڵێ گوایە تۆ غیرەی دەکەی؟
- کوڕم، بۆیە وا دەڵێ چونکە لە دڵی خۆیدا دەزانێ شایەنی کوڕێکی وەکوو تۆ نییە. دەشزانێ من ئەمە دەزانم.

ئەم قسە ناخۆشانە تا لێواری هەڵدێریان بردین. بڕیارم دا لە ترۆپکەکەی پاشەکشە بکەم چونکە نەمدەویست قسەی وا لە کوڕەکەم ببیستم کە هەردوکمان بە یەکەوە هەڵدێرێ. حەزیشم نەدەکرد گوێم لێ بێ بڵێ: حەز دەکەم لە کنت بڕۆم چونکە تۆ تێم ناگەی. لە دوورەوە، هانام وەبەر ڕۆحی (جیرالد) برد. هەوڵم دا دان بە خۆمدا بگرم:

– من بۆیە لە دڵەوە حەز دەکەم، تۆ یەکێکی وات خۆش بوێ بتوانێ تۆ چۆن ئەوت خۆش دەوێ، ئەویش ئاوها تۆی خۆش بوێ. ئەوەتا من و باوکت، کە نموونەی ئەوپەڕی بەختەوەرین، بەو جۆرە بووین. یەکەم جار کە چاوم پێکەوت، زانیم چارەنووس خۆشەویستی ئەو پیاوەی بۆ داناوم! پێش ئەو قەت کەسی ترم خۆش نەویستبوو. ئەویش هەروا. پێش من قەت کەسی تری خۆش نەویستبوو. ڕەنگە تۆ پێت وابێ ئەمە لەگەڵ بۆچوونی گەنجی ئێستا ناگونجێ. من ئەمە باش دەزانم!!

گوێم لێ دەبێ دەڵێن مرۆڤ دەبێ بە زۆر تاقیکردنەوەی خۆشەویستیدا بڕوا تا دەگاتە دوا قۆناغ. ڕەنگە ئەمە بەش بە حاڵی خاوەن دڵی سادە ڕاست بێ، بەڵام بەش بە حاڵی خاوەن سۆزی قووڵ و پتەو ڕاست نییە. من و باوکت لەم جۆرەی دواوە بووین. ئەو کاتە خۆشەویستیمان گەیشتە پۆپە کە تێگەیشتین، ئەوەی هەر یەکەمان لە وجوودی خۆمانەوە بە بەرامبەرەکەمانی دەبەخشین تا ئێستا بە هیچ کەسی ترمان نەبەخشیوە. خۆشەویستی لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ ئێمە مانان شتێکی نوێ بوو. دڵنیات دەکەم ئەمە بوو خۆشەویستییکەمانی جوان و پتەوو تەواو کردبوو.

ئەو کاتە، زۆر لە خۆم ڕازی بووم کە ئەو نامەیەم نیشان نەداوە کە ئێستا لە ژووری سەرەوە، لە شوێنی خۆی داندراوە! من لە دڵی خۆمدا

دەمزانی، سەرەڕای ناوەڕۆکی نامەکەیش، (جیرالد) ئێستایش هەر خۆشی دەوێم. (رینی) لە شتی وا نەدەگەیشت!! ئایا ئەو قەت قەناعەتی وەکوو قەناعەتی من دەبێ؟ ماوەیەکی زۆری دەوێ تا لە شتی وا دەگاو هەستی پێ دەکا. تا نیوەکەی تری خۆیشی نەدۆزێتەوە، هەرگیز ناتوانێ لە هیچ شتێ بگا.

بەو پەڕی توندی پێیگوتم:

– بە ڕاستی شتی سەیرە کە باوکم نامەت بۆ نانووسێ!!

وەڵامم دایەوە:

– سەیری چییە؟ ئەو دەزانێ من دڵنیام خۆشی دەوێم. زۆر باشیش دەزانێ من ئەوم خۆش دەوێ، ئێستاو لەمەودوایش هەر لەسەر ئەو خۆشەویستییەی دەمێنمەوە. هۆی خۆی هەیە کە نامەم بۆ نانووسێ. ئەو هۆیەش کەمو زۆر پەیوەندی بە منو بە تۆوە نییە. ئەو هۆیە، لەم دونیایەدا، زۆر کەسی وەکوو ئێمە مانانی لێك جیا کردۆتەوە. نابێ لێ بگەڕێین ئەو هۆیە دەست لە خۆشەویستیمان گیر بکاو کارمان لێ بکا. پێویستە سەبرو هەدارمان هەبێو دڵسۆز بین بەرامبەر خۆشەویستییەکەمان، تا ڕۆژێ دێو شتەکە واژی دەبێتەوەو بۆ هەموو کەس ئاشکرا دەبێ.

خۆم ڕادەهێنا بۆ ئەوەی قەناعەت بەو قسانە بێنم کە بۆ (رینی)م دەکرد، بەڵام دڵنیا نەبووم (رینی) لە مانای قسەکانم دەگا. گەنج، کەم لە شت دەگەن. ئێستا بیر دەکەمەوە، ئایا کاتێ کە من خۆم لە تەمەنی گەنجیدا بووم، دەمتوانی تێبگەم (جیرالد) خۆشەویستی ڕاستەقینەی منە؟ ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار چاوم پێکەوت، هەستم هیچ حیکمەتی

تێدا نەبوو. چونکە ئەو کاتە خۆم هیچ حیکمەتم تێدا نەبوو، تەنانەت ئێستایش باوەڕ ناکەم خاوەنی حیکمەتێکی وا بم.

(رینی) لە پڕ هەستاو ڕووی کردە منو داهاتەوە سەرمو ڕوومەتی ماچ کردم:

- دایکە، نیگەران مەبە. بۆچوونەکەت بەرامبەر ئیللیگرا ڕاست نییە. ئیللیگرا باشترین کچە. بە هەر حاڵ، نە من باوکمو نە ئەویش تۆیە. هەر کەسە ئەو ژیانە دەژی کە خۆی حەزی لێ دەکاو بۆی دەسازێ.

هیچ قسەم لە سەر قسەکانی نەبوو. وەڵامم نەدایەوە. دیم ڕۆیشتو سەرکەوت بۆ نهۆمی سەرەوە. دوای ئەوە، تا ماوەیەك ناو بە ناو ئەم وشانەی لە مێشکمدا دەزرینگایەوە. راستە (رینی) کەسێکەو باوکی کەسێکی ترە! ئەویش هەقی خۆیەتی لە ژیاندا ئەو ڕێگایە بگرێتە بەر کە لەگەڵ خۆی دەگونجێ. کە ئەو چرای ژووری خۆی کوژاندەوە، منیش چوومە سەرەوە بۆ ژووری خۆم. راکشامو خەوێکی خۆشم لێکەوت.

لە خەودا دیم لە ماڵەکەی خۆمانم لە پەکین. بە دوای (جیرالد)دا گەڕام بەڵام نەمدۆزییەوە. ڕۆیشتو نەهاتەوە. بە ترسەوە لە خەو ڕاپەڕیم. بۆم دەرکەوت لە ماڵەکەی خۆم دەرنەچوویم، لە ڤیرمۆنت.... هەستم بە بۆشاییەکی گەورە کرد لە دەورووبەری خۆم.

* * *

# (١٦)

ئەمشەو، (رینی)م بینی لە سێبەرەکە هاتە بەر ڕووناکی. هەردوو بازووی لە ئیلليگرا وەرهێنابوو. کات زۆر درەنگ بوو. لە عەوان‌و بەدکاران نەدەترسان چونکە خەڵك‌و عالەمی دۆڵەکەمان زوو دەخەوتن.

(رینی) کوڕم، بەو بەژن‌و باڵا بەرزەیەوە وەستا بوو، هەردوو بازووی لەو کچە ناسکۆڵە وەرهێنابوو. ئەویش ڕووی بۆ رینی هەڵبڕی بوو. ماچێکی دوورو درێژو پڕ تاسەو ئەشق‌و ئەوینیان لە یەك کردو ملی ئەو ڕێگایەیان گرت کە کەوتبووە بەر تریفەی مانگ‌و بەرەو لای ماڵی ئێمە دەهات. کە گەیشتنە بەر دەرگای حەوشە، لەبەر چاوم بزربوون. دوای چارەکە سەعاتیك، دیم (رینی) بە تەنیا هاتەوە. دەستی لە گیرفانی نابوو. منیش وەکوو هەموو جارێ بە تەنیا لە شانشینەکە دانیشتبووم.

کە گەیشتەوە ماڵێ، بڕیارم دا وا پێشان بدەم دڵم ڕەحەت نییەو نیگەرانیم نەڕەویتەوەو بۆچوونم بەرامبەر ئیلليگرا لەگەڵ شەوی پێشوو نەگۆڕاوە. کە دیتی لەسەر لاتەختە درێژەکە دانیشتووم، سڵاوی کردو گوتی:

- شەو باش، دایکە!

- شەوباش، کوڕم!

ئینجا گوێم لە دەنگی پێی بوو، لە پلیکانەی دواوە، لە مدبەقەوە سەرکەوت بۆ ژووری خۆی. باوکم ئەو پلیکانەی لەوێ کردبوو بۆ ئەوەی خزمەتکارەکان هاتوچۆی پێدا بکەن‌و نەیەنەوە پلیکانەی سەرەکی‌و ماڵەوە سەخڵەت بکەن.

ئەم هاوینە، (رینی) ژووری خۆی لە تەنیشت ژووری من گواستەوەو چووە ئەو ژوورەی دەکەوێتە سەر مدبەق. ژوورێکی خۆش‌و گەورەیە، سەرشۆرکی تایبەتی خۆی تێدایە.

باوکم زۆر بە هووردە بوو. ئەم ژوورەو سەرشۆرکەکەی بۆ خۆی دروست کرد بوو، دەیگوت:

- ئەوەی تەنیا شەوی شەممە خۆی بشوا، پێویستی بە سەرشۆرکێکی تایبەتییە بە خۆی هەیە.

زانیم (رینی) بۆچی ئەو ژوورەی هەڵبژاردووە. دەیەویست لە کاتی هات‌و چوون، بەلای ژووری مندا تێنەپەڕێ. ئەمە شتێکی نهێنی نییە، شتێ نییە پێویستی بە فرت‌و فێڵ بێ. خۆی بە ئاشکرا وای گوت. خۆ ئەگەر ئیلليگرا ئەو کچە بوایە کە من بۆ کوڕەکەمم دەویست، کەم‌و زۆر ئەم هەڵس‌وکەوتانەم بەلاوە گرنگ نەبوو. بەڵام لە زێدە هەموو کەس ئیلليگرا؟!!

راستە هیچ دایکێ ناتوانێ کوڕەکەی لە خنکان ڕزگار بکا. بەڵام دەتوانێ چاوەدێری بکاو چاوەڕێ بکاو داخی لە دیار بخوا... زۆر جار بیر دەکەمەوە، ئاخۆ دەبێ (رینی) بە ڕاستی لەو قسانە گەیشتبێ کە لەبارەی خۆشەویستی پڕ سۆزەوە بۆم دەکرد؟ دڵنیام فری لێ تێنەگەیشتووە. ناچارم بەزەییم بە ئیلليگرایشدا بدێتەوە، چونکە مادەم

(رینی) ئاوها بێ، مانای وایە شتی وای لە ئیللیگرا دەوێ کە پێی هەڵناسێ. سۆزی (رینی) لە سۆزی ڕاستەقینەی ئیللیگرا زیاترەو ئیللیگرا خەفەت دەخوا کە دەبینێ هاوشانی (رینی) نییە. ئیتر بە دەم بیرکردنەوە گەیشتمە ئەو ڕایە ئەوەی پێویستی بە پاراستن بێ (ئیللیگرا)یە نەك (رینی)و من دەبێ لە (رینی) بیپارێزم. دەق وەکوو دەمەوێ کوڕی خۆم لەو بپارێزم. ئەمە ژنە، دڵی هەر ـچۆنێ بێ، نابێ تووشی ئازار ببێ. من، وەکوو ژنێك هەمیشە لایەنگری ژنم. تەنانەت ئەگەر وا بخوازێ دژی کوڕی خۆیشم بوەستم. ئەمە یەکەم جارە بەم چەشنە بیر دەکەمەوە. هەستی ئافرەت، لە ڕووی ڕەگەزەوە وەکوو ژن، زۆر لە هەستی دایك قووڵترو بەهێزترە.

ئەوەی بۆم دەرکەوت، تازە ئێستا بۆم دەرکەوت کە ئەم شتانە دەنووسم. جیگای حەپەسانو شڵەژانە. نازانم چۆن هەڵسوکەوت بکەمو چ بکەم؟ لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەم دەڵێی بارگرانییەکی گەورەم لەسەر دڵ لاکەوتووە. ئۆخژنێك هەموو گیانی داگرتووم چونکە ئیتر هەر تەنیا بیر لە (رینی) ناکەمەوە. بیرم بە شتێکی زۆر لەوە گەورەترو بەرزتر خەریکە. بیر لە پەیوەندی گشتی نێوان ژنو پیاو دەکەمەوە.

ئەوەی منو (جیرالد)ی بە یەك گەیاند تەنیا دەرفەتو چارەنووس بوو. ئەگەر ئەوە نەبوایە کە باوکم برە پارەیەکی بۆ خوێندنی من تەرخان کردو (کۆلیجی رادکلیف)ی دەست نیشان کرد لێی بخوێنم، چونکە هیچ کوڕی نەبوو ڕەوانەی زانکۆی هارڤاردی بکا، من تووشی (جیرالد) نەدەهاتم، وەکوو (رینی) یەکێکی ترم بە هاوبەشی ژیانی خۆم هەڵدەبژارد. ئەو تەمەنە، هی ئەوەیە مرۆڤ، هەرچی چارەنووس بێنێتە

ڕێگای، وەری دەگرێ. باوکم چۆن منی ڕزگار کرد، پێویستە منیش ئاوها (رینی) ڕزگار بکەم. بەڵام من دەبێ بیر لە ڕزگار کردنی (ئیللیگرا)یش بکەمەوە.

کات زۆر لە نیوەشەوە تێپەڕیوە. هەست دەکەم زۆر شەکەتم. ناتوانم بە ڕوونی بیر لەو ئەرکە نوێیانە بکەمەوە. تا بەیانی، لەگەڵ گزنگی ڕۆژێکی تازەدا.

* * *

# (١٧)

(رینی) ئەمڕۆ شادیو خۆشی لێ دەبارێ. وا زەن دەبا شتەکە لە بەینی منو ئەودا ڕوون بۆتەوەو هەڵوێستی بەرامبەر بە من دیارەو ئێستا ئازادە هەرچی بکا. بۆیە ئەمڕۆ زۆر بە چوستو چالاکی لە ژوورەکەی هاتە خوارەوە. دەمو چاوی جوانی بە شادومانی دەدرەوشایەوە، چاوی ئاورینگی خۆشەویستی دەهاویشت. هات ڕوومەتی ماچ کردمو هەوڵی دا لێوی بە لێوم نەکەوێ. ئینجا لەسەر مێز دانیشت بۆ ئەوەی ناشتا بکا.

ئەوسا بە دەنگێکی ڕوونو ئاشکرا گوتی:

- دەبێ دەست بە پاك کردنەوەی قامیشە شەکر بکەم. بەرهەمی زۆرە. ڕەنگە (مات)یش، کە لە ئیشی ناو کۆگا بووەوە، بێتە هاوکاریم. دەبێ زەوی گاگۆزو دانەوێڵەیش پەین بکەین.

وەڵامم دایەوە:

- وا بزانم وایە!

کە لە ناشتا بووەوە، بۆ ئیش کردن چووە سەر زەوی. منیش دەستم بە ئیش‌وکاری ماڵەوە کرد. (رینی)، حەزی دەکرد ئامێرێکی هیربار شۆرم بۆ بکڕێ، بەڵام من حەزم دەکرد بێ هیربارشۆر ئیشی خۆم بکەم. چونکە حەزم دەکرد پاش جەمەکان بە دەم هیربار شووشتنەوە، بە هێمنی بیر بکەمەوەو لەو دیمەنە جوانە وردببمەوە کە لە پەنجەرەی مدبەقەوە لەبەر چاوم دیاربوو. جگە لەوەیش زۆرم حەز لە هیربارەکان بوو. هەندێکم لە پەکین لەگەڵ خۆم هێنابوو، هەندێکیش لە منداڵییەوە بە کارم دەهێنان‌و دایکم بۆی جێهێشتبووم.

بە هەر حاڵ، نازانم چۆن هەندێ ژن بەردەوام گلەوگازەندە لە ئیش‌وکاری ماڵ‌و لە خزمەت کردنی مێردو بە خێوکردنی منداڵ دەکەن؟!! ئەمە هەمووی ئیشی خۆمانە! جگە لەوەیش من حەز لەو شتە نوێیانە ناکەم. ماوەیەکی زۆری دەوێ تا لێیان ڕادێین‌و هۆگریان دەبین. ئەوەی هەمانە وەکوو پارچەیەکی خۆمان‌و بەشێکی تەواوکەری ژیانی خۆمانی لێ دێ. شکان، یان بزربوونی هەر فەخفوورییەك، بەشێکی بوون‌و ژیانمان لەگەڵ خۆی دەبا. ئەمرۆ بەیانی ئەو تاقمە چینییەم بە کارهێنا کە بە ڕەنگی زەرد گەوهەربەند کراوە. لە کاتی شووشتنی قاپەکاندا، قاپێکم لە دەست خزی‌و بەربووەوە ناو حەوزو پارچەپارچە بوو. ئەوەندەم سوو لێ بووەوە، نەمتوانی بەری فرمێسکم بگرم. دڵم نەهات کەلەو پارچەکانی فڕێ بدەمە ناو تەنەکەی زبڵ، بردم لە بن پیرە دارسێوەکەی لای دەرگای حەوشە، لە ژێر زەوی ناشتم.

گەڕامەوە مدبەق، بابا چاوەڕێی دەکردم بۆ تێشت خواردن. نیشانەی پیری لێ دەرکەوتبوو، لە هەموو شتێکا وەکوو دەوری منداڵی لێ هاتبووەوە. بەروانکەکەم لە بەر سینگی بەست‌و خواردنم بە دەمییەوە

کرد، چونکە نەیدەتوانی کەوچك بە دەستەوە بگرێ. بەو پەڕی کپو هێمنی خواردنەکەی خوارد. هەمیشە لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی دەکرد. تەنیا جلی چینی لەبەر دەکردو ئەگەر قسەی بکردایە، هەر بە چینی قسەی دەکرد.

- دەچمەوە ناو جێ.

کە لە خواردن بووەوە، تەنیا ئەوەندەی گوت. پێشنیارم بۆ کرد:

- نەختێ لە شانشین دانیشە، بەربەرۆچکێکی گەرمو خۆشە.

سەری نارەزایی بادا. ویستم وەکوو منداڵ بە نەرمی لەگەڵیا بجوولێمەوە:

- بە بیرت نایێ چۆن باوکو باپیران لە پەکین، هەموو جارێ لەبن دیواری ماڵەوە دادەنیشتنو خۆیان دەدایە بەر ڕۆژێ؟! ئەوان تەنیا بۆ خواردن لەناو نوێن نەدەهاتنە دەرەوە، پاش خواردن دووبارە بگەڕێنەوە ناو نوێن. ئەوان حەزیان لە خۆرەتاوە دەکرد. ئەمڕۆیش، هەوا خۆشە، هیچ بای نایێ.

کە وامگوت، بە قسەی کردم. دەستم گرتو بردمە شانشینەکە. دانیشتو وەك ئەوەی خەوتبێ، چاوی هاویشتە سەر یەك. ڕۆیشتمو هەر لە بیرم کرد. بەرەبەری نیوەڕۆ، بیرم کەوتەوە. زۆر لە خۆم تەریق بوومەوە. هەر رامکرد بۆ لایەوە. چۆنم جێهێشتبوو، بە دەقە خۆی بوو. تەنیا گەرمای خۆرەتاو نەختێ دەموچاوی تێك دابوو. بە دوو چاوی پڕ گلەیی پێشوازی کردمو گوتی:

- ئێستا بچمەوە ناو نوێنەکەم؟

- هەڵبەت دەچین! بەڵام جارێ با بچین پیاڵە چایەكو هێلکەیەکی کوڵاوو هەندێ برنج بخۆ کە حەزی لێ دەکەی.

یەکسەر نانەکەی خوارد. چای چینی زۆر پێ خۆش بوو. بردمە ژووری نووستنی خۆی و پەنجەرەکانم داخست و لە خەوێکی قووڵ جێم هێشت.

سوودی لە تیشکی خۆرو هەوای پاك وەرگرتبوو. بەڵام خۆیشم نازانم چۆن ئەو ماوەیە، لەوێ، لە بیرم کرد؟! ئای چەند خۆپەرست بووم!! هەر بیرم لە (رینی) دەکردەوە.

هەموو جارێ بە دەم ئیش وکاری ماڵەوە بیرم دەکردەوە، ئەمە گەورەترین دەوری هەبوو بۆ لێکدانەوەو روون کردنەوەی گیروگرفتی بەردەم ئەقڵ و دەروونم. هەمیشە هەستم دەکرد باشترین کات بۆ ئەوەی مرۆڤ بیر لە گیرو گرفتەکانی بکاتەوە، ئەو دەمەیە، کە خەریکی پاك کردنەوەی ماڵ و رێکخستنی نوێنە، چونکە ئەو چالاکییەی لەش گەرمایی دروست دەکاو خوێن بە دەمارەکاندا هەڵدەکشێ بۆ ناو پێچەکانی مێشك و دەیخاتە چالاکییەوە.

گەیشتمە ئەو رایە پێویستە بچم چاوم بە دایکی ئیلیگرا بکەوێ. ناشزانم تا چ رادەیەك قسەم لێوەردەگرێ. کە چوومە لای و هاتمەوە، چیم کردو چیم گوت هەمووی بۆ (رینی) دەگێرمەوە. لەمەو دوا، من و (رینی) هیچ نهێنیمان لە نێواندا نابێ. هەقی خۆمە چۆنم دەمەوێ وا هەڵس وکەوت بکەم. مادەم (رینی) ئەم هەقەی بە خۆی داوە. منیش ئەو هەقە بە خۆم دەدەم.

* * *

# (١٨)

که دەرگای حەوشەم کردەوەو چوومە ناو حەوشە، مسز وودز لە شانشینی ماڵەوە دانیشتبوو. خانووەکە خانوویەکی سپی و جوان بوو. پەنجەرەکانی سەوز بوو. شێوازەکەی شێوازی باوی ئەو سەردەمە بوو. تەنانەت لە چیمەن و گوڵزارو ڕێچکۆڵەی بەینیشیان. مسز وودز خەریکی دورمان بوو. ئەو جۆرە دورمانەی دەکرد کە دایکم هەوڵی دەدا فێرم بکا، بەڵام من خووم نەدایێ، ئیتر ئەوەی فێریش ببووم لە بیرم چووەوە.

کاتێ گەیشتمە سەر پلیکانە، مسز وودز لەسەر کورسییەکەی هەستا. قەدەژن بوو، تەمەنی کامڵ بوو، دەم‌وچاوێکی خڕو گەشی هەبوو. قژی بە گڵوازە بوو. لەو ژنانە بوو کە بەلای هەر شانشینێکدا بڕۆین دەکەونە بەرچاومان. وەکوو زۆربەی ژنی ئەمریکی ژنێکی باش و بێ مەسوەدە بوو. دەمزانی هۆی چییە ئافرەتی چینی شەرمنە یان خۆی بە شەرمن پێشان دەدا. لە سەدا نەوەدی ئەو شەرمەی پێیەوە دیارە ڕووکەش و دەستکردە، چونکە ژنی چینی وا تێ دەگا یەکێ لە خەسیەتەکانی مێینەیی ئەوەیە خۆی بە شەرم و حەیا بنوێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەت ترسنۆک و ڕاڕا نەبووە.

- فەرموو.

مسز وودز بەم جۆرە فەرمووی لێکردم. بەڵام بارودۆخی ئاسایی نەبوو.

- من مسز جیرالد ماك لیودم. ماڵم لەو سەری ئەم ڕێگایەیە.

- (ڕینی) کوڕی تۆم دیوە. فەرموو با بچینە ژوورەوە. وا بزانم لە ژوورەوە دابنیشین باشترە. ئەمڕۆ هەوا پاك نییە. خەریك بوو پێش پێی تۆ بچمەوە ژوورەوە.

چووینە ژوورەوە. دالآنێکی تەسك بوو. مافوورێکی سووری لێ ڕاخرابوو. دالآنەکە کۆتایی بە پلیکانەیەك دەهات بۆ سەلال. لای دەستەڕاست ژوورێکی ڕێك‌وپێکی خواردن بوو، لای دەستە چەپ ژوورێکی گەورەی دانیشتن بوو. ژوورێکی خۆش‌و فەراح بوو. مێزێکی تێدابوو هەندێ گۆڤاری لە سەر بوو. هیچ کتێبم لە سەر مێزەکە نەدی. ئایا (ڕینی) دەتوانێ لە ماڵی بێ کتێب بژی؟!

- فەرموو دانیشە. فەرموو لە سەر ئەم کورسییە دانیشە. ئەمە کورسی مێردەکەمە، دانیشتنی لە هەموو کورسییەکانی دی خۆشترە.

چاوە کاڵەکانی سەرنجێکی هێمنیان تێدا بوو. سەرنجەکەم بە دڵ بوو، دڵم پێ کرایەوە، هەر دانیشتم‌و دانەنیشتم، یەکسەر سەری قسانم کردەوە:

- بێگومان خۆت ئاگاداری، ماوەیەکە (ڕینی)و (ئیلیگرا) بە یەکەوە دەچنە دەرەوە. هاتووم بزانم تۆ ڕات بەمە چییە؟ ئەمانە هێشتا منداڵن، لەو ناوە کەس لە تەمەنی ئەواندا نییە.

دەمرچاوی خڕی حاڵەتێکی سەنگینی بەسەردا هات. ژنە، زارێکی خڕو بچووك‌و دوو چاوی خڕو لووتێکی پانی مام ناوەندی‌و

ڕووخسارێکی سادەی هەبوو، زیاتر لە ڕووخساری منداڵی دەکرد. لێی وردبوومەوەو لەگەڵ (ئیللیگرا)ی کچی بەراوردم کرد. پێش ئەوەی قسە بکا من دەمزانی چ دەڵێ. گوتی:

- ڕاستە تازە هەڵدێن. مێردەکەم مێشکی بەمەوە خەریکە، منیش پێوەی خەریکم. دەمانەوێ (ئیللیگرا) هەست بکا ئازادە لە هەڵسوکەوت. هەرچەندە هێشتا لە قوتابخانەی بالآیەو هێشتا خوێندنی تەواو نەکردووە. ماڵمان لە شارۆچکەی (باسایك)ە، لە (نیوجەرسی). قوتابخانەکەی باشە. حەز ناکەین (ئیللیگرا) خوێندن تەواو نەکا.

- خوا نەکا!!

بە ترسەوە وامگوت. ئینجا گوتم:

- (رینی)یش دەبێ بچێتە کۆلێج، کۆلێجی هارڤارد. باوكو باپیریشی لەوێ دەرچووین. کە خوێندنی تەواو کرد، دەتوانێ لە هەر کوێ بیەوێ، لەوێ ژیانی بەسەر ببا: لە ئەوروپا، لە چین!؟ ئاخر باوکی چینییە!

دراوسێکەم ترسو تۆقانو حەپەسانی لە دەمو چاو دەرکەوت، گوتی:

- چین؟ کەس ناتوانێ بچێتە چین؟ شتی وا چۆن دەبێ؟!

- هەڵبەت لەم ڕۆژگارەی ئێستا کەس ناتوانێ بچێتە چین. بەلآم هیوادارم ڕۆژێ بێو بارودۆخ باش ببێو (رینی) بتوانێ بچێتە چین بۆ لای باوکی.

- باوکی (رینی) چینییە؟

مسز وودز کە ئەم قسانەی دەکرد لەرەیەکی سەیری لە دەنگیدا بوو.

- لە سەدا سەد چینی نییە، ئەگەر نا من ناوم ماك لیود نەدەبوو. باپیری (رینی) ئەمریکییەو لای خۆمانە. کەوتۆتە ناو ساڵان، تەندروستی باش نییە، قەت لە ماڵەوە دەرناچێ.

من قسەم دەکردو ئەویش چاوەڕێی زیاتری لێ دەکردم. بەردەوام بووم، گوتم:

- مێردەکەم بەرێوبەری زانکۆیەکی گەورەیە لە پەکین. ئێمە حەزمان دەکرد بێتەوە ئێرە بەڵام ئەو وای پێباش بوو لەوێ بمێنێتەوە بۆ ئەوەی ئەرکی ئەوێی جێبەجێ بکا.

- ئەدی چین وڵاتێکی کۆمۆنیست نییە؟

کە ئەم پرسیارەی کرد، هەستم کرد لەرەی دەنگی جۆرە سەرزەنشتێکی تێدایە.

- بەڵێ، بەڵام مێردی من کۆمۆنیست نییە، تۆ دەتوانی پێبکەوی. ئەو پێی وایە ئەرکی سەرشانی وا دەخوازێ جارێ لەوێ بمێنێتەوە.

ئینجا بێ دەستی خۆم ڕاستییەکی ترم لە دەم هاتە دەرەوە، گوتم:

- دایکم چینی بوو بۆیە.....

- چی بوو؟

دەنگی مسز وود پڕ بە سەرسامی و نکووڵی لە گوێمدا زرنگایەوە.

- ئەوە بۆیە (رینی)...... وامدەزانی خوێنی ڕەچەڵەکێکی هیندی لە دەمارەکاندایە.

- ئایا (رینی) ئەو شتانەی بە (ئیللیگرا) نەگوتووە؟

- نەخێر. هەرگیز! دڵنیام پێی نەگوتووە. ئیللیگرا هەموو شتێکم بۆ باس دەکا. ئەگەر پێی گوتبا، من دەمزانی.

– کەواتە شادم کە پێم گوتی. پێویستە، بەر لەوەی ئەوان خۆشەویستییەکەیان تۆخ ببێ، تۆ بە هەموو شتێ بزانی.

– بەڵێ منیش وا دەڵێم.

– بە دەمو چاوییەوە دیاربوو مێشکی بە چییەوە خەریکە. دیم خوێن بۆ دەمو چاوی هەڵکشاو قەپی لە لێوە گۆشتنەکانی گیر کرد. هەستم کرد بیری ڕۆیشتووەو بە بیری نەماوە من لەوێم. لەپڕ چاوی هەڵبڕیو سەرنجی لە سەرنجم گیر بوو.

– ئای لە خۆت بەدبەختێ! زۆری پێ سەخڵەت بووی، وا نییە؟

– چی... بە (ڕینی)؟

– بە هەموو شتێ.... شووکردنت بە پیاوێکی تا بڵێی دوور لە خۆت.... بە پیاوێکی چینی!

– مێردەکەم ئەمریکییە. باوکی لە سەفارەتی ئەمریکا، لە پەکین ناوی لە تۆماری منداڵبوون نووسیوە. هەروەها (ڕینی)ش.

– هەر چۆنێ بێ مەسەلەکە شتێکی تێدایە.

– من لە ژیانی خۆمدا، تا ئەوپەڕی بەختەوەریی بەختەوەر بوویم. بەختەوەر بوویمو چێژم لە ژیان وەرگرتووە. دەمەوێ هەموو پێویستییەکی بەختەوەریش بۆ کوڕەکەم دابین بکەمو ژیانێکی خۆشی بۆ مسۆگەر بکەم. حەز ناکەم کچێکی وا بێنێ هەست بکا قوربانی داوە کە شووی بە گەنجێك کردووە خوێنی چینی تێکەڵ بە خوێنی بووە. پێم خۆشە کچێ بێنێ، کچەکە لە دڵەوە حەز بکا شووی پێ بکاو شانازی پێوە بکا. هەست بکا بەم شووکردنە پایەی بەرز دەبێتەوە وەکوو تاکێكو وەکوو ئەمریکییەك.

هەستم کرد قەناعەتی بە قسەکەم نییە، بەڵام هەوڵی دەدا بە هەموو گیانییەوە گوێم لێ بگرێ، ئەمەیش وایکرد زیاتر خۆشم بوێ. خانمێکی سادەو دڵسۆزە، هیوادارم ببێ بە دەستە خوشکمو هەرچی ببێو هەرچی ڕوویدا، لە دەستە خوشکاتیم بەردەوام بێ. هیوادارم پەیوەندی دەستە خوشکاتیمان لە نێوان پتەو ببێ بۆ ئەوەی هەرچی ژن بۆ ژنی باس دەکا، بۆی باس بکەم، چونکە بە ڕاستی پێویستم بە ژنێکی لەو جۆرەیە کە مرۆڤ بتوانێ متمانەی پێبکا. ژنەکەی (مات) ژنێکی چاکە بەڵام نەخوێندەوارە، جگە لەوەیش هەمیشە لەگەڵ (مات) شەڕو هەرایەتی لەسەر هەندێ شتی ڕابردوو. بەڵام هیچ بۆ من باس ناکەن. خانووی خۆیان هەیە لە قۆنتار چیای بەرامبەرمان. هەموو منداڵەکانیان ڕۆیشتوونو بە تەنیا ماونەتەوە. شەڕو هەرای بەینیان قەت نابڕێتەوە. هەندێجار (مات) دێتە لام، گازاندە لە ژنەکەی دەکاو دەڵێ:

– ئای لەو ژنە!! چل ساڵە ژیانی پێتاڵ کردووم.

کە جاروبار هەندێ سەوزە بۆ خانمی (مات) دەبەم، ئەویش هەمات شتە! باسی مامەڵەی خراپی مێردەکەیم بۆ دەکا. گازاندەی لێ دەکاو دەڵێ: یەك حەفتە ریشی بەر دەداتەوە. ئەوەندەی تکای لێ دەکەم نایتاشێ. ئاخیری دەڵێ: مێردەکەم چل ساڵە ژیانی لێ تاڵ کردووم!

ئەو ژنە کەڵکی نەبوو ببێ بە دەستەخوشکی هیچ کەس، کەچی مسز وودز، بە پێچەوانەوە، دایکێکی بەختەوەرو ژنێکی بەختەوەرە. من ئەمەم بە ڕاستی لێ دی. ڕاستە دڵی بچووکەو جێگای زۆر شتی تێدا نابێتەوە. بەڵام ئەمە بە عەیب ناشێ. لە خۆشبەختی خۆیەوە مێردەکەی نایەوێ ژنەکەی ئەوەندە وردو قووڵ بێ، بەوەندە لێی ڕازییە.

دوای نەختێ، لەپڕ، پیاوەکەی لێمان بە ژووریٚ کەوت. پیاوێکی ڕەقەڵەی سەر تاوسی چاو شینی ئاسمانی بوو. بۆم دەرکەوت هاتووە ماوەی پشووی لێرە بە سەر ببا. لە شاری (باسابك)، لە نووسینگەی ژمێریارێك کار دەکا. ساڵانە دوو حەفتە هەقی پشووی هەیە. بە کەیفی خۆی چۆنی بویٚ وای بە سەر دەبا. بە زەیی خۆم بۆ دەربڕی و گوتم:

– تەنیا دوو حەفتە؟ مستەر وودز، کارەکەی خۆتت بە دڵە؟

پاش یەکتر ناسین، ئەم پرسیارەم لێکرد. ئەویش باسی شێوەو جۆری کارەکەی بۆ کردمو دڵخۆشی خۆی بە وەرگرتنی پشووی ساڵانە دەربڕی و گوتی:

– من حەز لە ئیشەکەی خۆم دەکەم بەڵام پێم خۆشە نەختێ پشوو بدەم.

– ئیشت زۆرە!!

ژنەکەی بەم جۆرە سەر زەنشتی کرد، بە ناسکی و بە شێوازێکی دۆستانە. ئەویش بە زەردەخەنە وەڵامی قسەکەی دایەوە.

ئەم ژن و مێردە، وەکوو من دیم، باشترین نموونە بوون بۆ ژن و مێردێکی هاوسەنگ و پڕبەدڵ یەکتریان خۆش دەویست. کە باسی بەختەوەرییان بۆ دەکەم، تیٚ دەگەن چ دەڵێم.

– مستەر وودز، من دراوسێیەکی ئێوەم، هاتووم بۆ مەسەلەی کوڕەکەی خۆم و کچەکەی ئێوە، چاوم پێتان بکەویٚ. بە مسز وودزم گوت ئەوانە هێشتا هەرزەکارن.

لە پڕ کابرا پەشۆکا. وەکوو هەر پیاوێکی ئەمریکی ڕەسەن کە لە حزوور ژنەکەی، یان دایکی، یان هەر خانمیٚ کە تەمەنی لە نیوە تێنەپەڕیبێ، بە باسی شتی وا دەپەشۆکیٚ کە پەیوەندی بە ژن و

پیاوەوە هەبێ. گەنجی ئەمریکی لە تەمەنی هەرزەکاریدا، لەبارەی مەسەلەی جنسییەوە، لە خۆی پاکتر نییە، تا بڵێی لە ساختەو ئاین‌و ئۆین دوورە. پیاوی ئەمریکی، بێ ئەوەی هەست پێبکەن، یان بزانن چ دەکەن، لە ئاسیاو ئەوروپا منداڵیان دەبێ. لەهەر کوێ بمێننەوە زەماوەند دەکەن‌و دووبارە دەکەونەوە گەڕان بە دونیادا.

– مسز ماك لیود پێیگوتم مێردەکەی چینییە.

مسز وودز مەبەستی خۆی هەبوو لەم قسەیە.

گوتم:

– نا، وام نەگوتووە. مێردەکەم ڕەگەزنامەی ئەمریکی هەیە. من گوتم مێردەکەم ئەمریکییە بەڵام دایکی چینی بووە. خانمێکی ڕەسەن‌و نەجیبزادە بووە. لە خانەوادەیەکی هەرە گەورەو دیاری پەکین بووە، ئێستا نەماوە.

مسز وودز بە دەنگێکی نزم گوتی:

– شتەکە پێویست بە تەفرەو ساختەیی ناکا. من ڕەچەڵەکی وا ئاڵۆزم نەدیوەو نەبیستووە.

کابرا حەپەسا بوو، هەر تاسا بوو بە قسەکانم، بەڵام ئەوەندە پیاوێکی ناسك بوو، بەسەر خۆی نەهێناو نەیویست تەریقم بکاتەوەو هەستم بریندار بکا. وای بۆچووم بەزەیی بە حاڵمدا دێتەوەو ناتوانێ هەستی خۆیم بۆ دەربڕێ. بە دەستەپاچەیی سەرنجێکی لە ژنەکەی دا. ئەمانە بە زەوقترین‌و ناسکترین ژن‌و مێرد بوون دیتبێتم. خۆشم دەویستن، هەر چەندە دەمزانی تێم ناگەن‌و نازانن مەبەستم چییە. (جیرالد) هەقی بوو بڕیاری دا لە پەکین بمێنێتەوەو لەگەڵ ئێمە نەیێ.

بە هەر حاڵ، ئەوەی بۆ من گرنگ بێ (ڕینی)یە! هەستامەوەو هەوڵم دا ئەوپەڕی شادو خۆشحاڵ بم، پێمگوتن:

- سوپاستان دەکەم. هیوادارم نیگەران نەبن. (رینی) بەم زوانە دەچێتە کولیج. گەنج زوو شتیان لە بیر دەچێتەوە. وا بزانم ئەمانە، پەیوەندی خۆشەویستییان هێشتا ئەوەندە تۆخ نەبووە! بەش بە حاڵی (ئیلیگرا)یش، کچێکی جوانەو زۆر گەنج هیوای بۆ دەخوازن.

مسز وودز قسەکەی وەرگرتمەوەو بە شانازییەوە گوتی:

- هەموو کەس خۆشی دەوێ.

ئینجا مستەر وودز گوتی:

- پار هاوینێ ڕاپرسییەکیان کرد، ئەو، زۆرینەی دەنگی وەرگرت کە لە هەموو کچەکان ساکارترەو لە هەموویشیان لە دڵی هاوڕێکانی قوتابخانەی باڵای، نزیکترە.

ئینجا مسز وودز گوتی:

- هەندێ لە برادەرەکانی دەیانەوێ خۆی بۆ شاژنی جوانی هەرێمەکەمان بپاڵێوێ، بەڵام باوکی ڕای لەسەر شتی وا نییە.

مستەر وودز گوتی:

- نەخێر. من بە شتی وا ڕازی نابم.

منیش، لای خۆمەوە، گوتم:

- مستر وودز، من لەم بارەیەوە لەگەڵ تۆدام، شتی وا پێویست ناکا.

ڕێك لەو کاتەدا، ئیلیگرا هاتە ژوورەوە. هەستم کرد تازە لە خەو هەستاوە. ڕوومەتەکانی سوور دەتگوت گوڵن. فستانێکی کورتو تەسكو بێقۆڵی لەبەر بوو. تەنیا کچی جوانو جحێڵ حەز لە فستانی وا کورتو تەسكو دەکا. دەبێ دان پێدا بنێم کچێکی جوان بوو. ئیتر هەقم

بە کوڕەکەم دا کە حەزی لەو کچە جوانە کردووە. بەڵام لە هەمان کاتدا هیوام خواست تا بناگوێ لەو خۆشەویستییە نقووم نەبووبێ.

– گوڵە جوانەکەمان، بە خێرهاتنی میوانەکەمان بکە!

مسز وودز بەم جۆرە پێشوازی لە کچەکەی کرد. ئای چەندم دڵ پێ خۆش بوو کە دیم ئەو دایكو باوکە ئەوەندە بە میهرەبانی لەگەڵ کچە تاقانەکەیان دەجوولێنەوە. (ئیللیگرا) بزەیەکی بۆ کردمو گوتی:

– هەلۆ، مسز ماك لیود.

پێمگوت:

– دەترسم (رینی)، شەوێ دی، ناچاری کردبی تا درەنگ شەونخوونی بکەی، کە هاتەوە سەرزەنشتم کرد

ئیللیگرا وەڵامی دامەوە:

– من هەر کاتێ بمەوێ دەتوانم بخەوم.

ئینجا چوو لە تەك باوکی دانیشت. باوکی بازووی تێوەرهێناو گرتییە باوەشو گوتی:

– گوڵە جوانەکەم، چۆنی؟

– باشم!

(ئیلئیگرا)، ئاوها وەڵامی دایەوەو سەری خستە سەرشانی باوکی!

– وەکوو مسز ماك لیود دەڵێ نەدەبوایە شەو تا درەنگ شەونخوونی بکەی!

ڕووی توند کردو هیچ وەڵامی نەدایەوە. ئەویش زیاتر ڕایگوشیو بە خۆیەوە قرساند.

مسز وودز بە سۆزو میهرەبانی تەماشای دەکردن. بە چرپە گوتی:

– ئای چەندم خۆش دەوێن؟

بە ڕاستی ئەو مێردو کچەی خۆی دەویستو شانازی پێوە دەکردن.

هەستم کرد حەز دەکەن زوو بڕۆم چونکە دەیانەویست بە بێی من، هەندێ قسە لەگەڵ کچەکەیان بکەن.

بە شێنەیی هەستامو ماڵاواییم کرد وەك ئەوەی لەم گفتوگۆیەدا هیچ شتێ لە بەینمان ڕووی نەدابێو وەك ئەوەی قسەمان لەبارەی ژیانو چارەنووسی دوو کەس نەکردبێ. هەرسێکیان تا بەردەرگای دەرەوە لەگەڵم هاتن. لەوێ نەختێ وەستاین. زۆریان هەوەس بە چیمەنو مێرغوزارو گوڵەکانو ڕێچکەکانی بەینیان دەهات. خانووەکە تەنیا بەسەر ئەم دیمەنەدا دەیڕوانی.

بەم جۆرە گەڕامەوە ماڵێ. (رینی) کە ئێوارە بۆ شێو خواردن هاتەوە، باسی هیچم بۆ نەکرد. خێرا هەر بە جلی کارکردن خواردنەکەی لرف کردو خێرا چووە ژووری خۆیو جلی خۆی گۆڕی. پاش چەند خولەکێك بە جلێکی پاكو ڕێك، لە مدبەق دەرپەڕییە دەرێ. بە دەم ڕێگاوە سەلامێکی لێ کردمو گوتی:

– ئێوارە باش، دایکە!

– ئێوارە باش، کوڕم!

ئەو چووە ژوانی (ئیللیگرا)و منیش کە لە شووشتنی هیربارەکان بوومەوەو دڵنیا بووم (بابا) جێو بالینگانی باشە، چوومە ژوورەکەمو دەرگام کلیل دا. ئەمشەو تێر دەخەوم. دەشتوانم بخەوم چونکە هیچ هۆیەکم بە دەست نەماوە لە شانشین دابنیشم. ئیشێکەو کردوومە، ئەنجامەکەی هەرچی دەبێ، با بۆ بەیانی بێ!

* * *

# (١٩)

- ڕۆیشت!

ئەمڕۆ بەیانی، (ڕینی) پێش هەموو شتێ بەم خەبەرە بەرەوڕووم بووەوە. من زوو لە خەو هەستابووم و زوو لەناوجێ هاتبوومە دەرێ. دەمزانی چ شتێ چاوەڕێم دەکا. کە هاتمە نهۆمی خوارەوە، دیم لە مدبەق دانیشتووە، فنجانە قاوەیەکی خەستی بۆ خۆی لێناوە. پێمگوت:

- دەڵێی ئەمشەو نەنووستوویێ؟

چاوی لە چاوی بڕیم و گوتی:

- چۆن خەوم لێ دەکەوێ!!؟

دانیشتم و فنجانە قاوەیەکم بۆ خۆم تێ کرد:

- فەرموو چت هەیە، بیڵێ! چی لە هەگبەتدایە، هەڵیڕێژە. با بە ئاشکرا قسە بکەین!

کوڕەکەم دیمەنێکی ترسناکی هەبوو. دەموچاوی زەرد هەڵگەڕابوو. لە تووڕەییان ئاگری لە چاوان دەباری. دەموچاوی تێك ترشابوو و لێوی داغان ببوو.

- چوویتە لای دایكو باوکیو هەموو شتێکت پێگوتن!!

بە هێیمنی گوتم:

- لە ڕاستی زیاتر، هیچم پێنەگوتوون.

- نەتدەتوانی چاوەڕێ بکەی تا خۆیان شتەکە لە بارەی منەوە دەزانن!؟

دەنگی، ئاوازێکی زۆر سەختو زۆر ناخۆشی تێدا بوو. زۆرم بەلاوە زەحمەت بوو گوێ لە ئاوازی دەنگی تێکشکاوی بگرم. پێمگوت:

- وا باش بوو کە دایبابی هەر لە سەرەتاوە بە ڕاستییەکە بزانن. ئەگەر ئەو تۆی ئەوەندە خۆش بوێو بچێ بۆ دایبابی باس بکا، من هیچ قسەم نامێنێ. سوێندت بۆ دەخۆم بە ڕاستمەو بەڵێنیشت پێدەدەم.

- دەبوو بەلانی کەمەوە ئاگادارم بکەیتەوە!

بڕیارم دا بۆی دانەهێنمو لە بەرامبەریا بێهێز نەبم.

- ویستم خۆم پێبکەوم بزانم ئەوان ڕایان بە مەسەلەکە چییە. ئەگەر خۆشەویستی تۆ بۆ ئەوو خۆشەویستی ئەو بۆ تۆ، هاوسەنگ بێ، ئەوان ڕایان هەرچی هەبێ، بە هیچ ناچێ. من ئەمە دەزانم. بەڵێ، باش دەزانم.

- خۆشی دەوێم، بە ئاشکرا پێی گوتم.

- ڕەنگە خۆشەویستی ئەو بەرامبەر بە تۆ، بەلای خۆیەوە، خۆشەویستییەکی گەورە بێ. بەڵام خۆشەویستییەکە ئەوەندە گەورە نییە. نەخێر.... هەرگیز خۆشەویستی بەرامبەر بە تۆ ناگاتە ئەو ڕادەیە. بڕوام پێبکە. ئەو کچێکی بچووك بچووکە، بڕوام پێ بکە بچووکەو لۆمەی ئەوەی لێ ناکەم، چونکە وا خەڵق بووە. بەڵام تۆ گەورە گەورەی. چونکە بەم جۆرە خەلق بووی.

بە چرپە گوتی:

- ئەتو ئەو خودایە!

چاوم تێ بڕی‌و گوتم:

- سوپاسی خودا دەکەم کە باوکت لەگەڵماندا نەبوو.

- هەردووکمان، ماوەیەك چاومان بڕییە چاوی یەکتر.

- ڕۆژێ دێ لەسەر ئەم ئیشە سوپاسم دەکەی.

وامگوت بەڵام بڕیا وام نەگوتبا. ئەوەی من گوتم هەموو دایك‌و باوکێك، لەو جۆرە حاڵاتەنادا، دەیڵێن. کاتی خۆی، کە ویستم شوو بە (جیرالد) بکەم، لە دایکی خۆمم گوێ لێ بوو وای گوت کاتێ ویستی ساردم بکاتەوە‌و شوو بە (جیرالد) نەکەم. بەڵام ئێمە زۆر بە ڕاستی‌و بە گەرمی یەکترمان خۆش دەویست. بە هیچ شتێ سارد نەدەبووینەوە. من بڕوام بە خۆشەویستی خۆم هەبوو. بەو خۆشەویستییە بە گژ دایکمدا چوومەوە‌و گوتم:

- تۆ ئەگەر من‌و (جیرالد) لێك بکەی، قەت سوپاست ناکەم.

من لە سەر هەق بوویم‌و لەسەر هەق نەبوویم، سەرەڕای ئەو نامەیەش کە ئێستا لەناو چەکمەزی مێزەکەمدایە، تەنانەت ئەگەر تازە قەت چاوم بە (جیرالد) نەکەوێتەوە، هەر من ڕاست بووم‌و دایکم ڕاست نەبوو.

لە دەم‌وچاوی کوڕەکەم وردبوومەوە. چاوی دانەواند. سەرەڕای تەمەنی بچووکیشی، هەوڵیدا سەرفرازیی خۆی بەرامبەر ئەو غەمە بپارێزێ. ئینجا بە ورتە گوتی:

- تۆ بۆچی منت هێنایە ئەم دونیایە؟!

ئیتر لە پرمەی گریانی داو چووە دەرەوە.

* * *

# (٢٠)

ئەو بەیانییە، بێدەنگیی باڵی بە سەر ماڵەوەدا کێشابوو. هەر یەکسەر، کە لە خەو هەستام، زانیم (رینی) ڕۆیشتووەو جێی هێشتووین. چاوم بە ڕۆژێکی گرژو تووشدا کردەوە. لە پەنجەرەوە دیم، لە دەرەوە دەیپرووشاند. گوێم ڕاگرت، هیچ هەستو خوست نەبوو. هەموو ڕۆژێ، ئەو محەلانە، گوێم لە ترپەی پێی (رینی) دەبوو دەهاتو دەچوو. لەناو پێخەفە هاتمە دەرەوە. پەنجەرەی ژوورەکەمم داخستو نەختێ لە تەك پەنجەرەکە وەستام. لە دۆڵەکە وردبوومەوە کە لە پشت پەردەی باران بزر ببوو. بەر لەوەی بچمە ژووری (رینی)، هێزو تاقەتی خۆمم کۆکردەوە. هەوڵم دا بە بیرو خەیاڵ پەیوەندی بە (جیرالد)ەوە بکەم. بەڵام لەو ساتەدا بیرو خەیاڵم بە دەممەوە نەهاتنو (جیرالد) وەڵامی نەدامەوە. لە دەموچاوی (جیرالد) زیاتر هیچم لەبەرچاوی خۆم نەدەدی. کە ویستم وەکوو برووسکە بە بیرو خەیاڵ بۆ لای بفڕم، لە

چەندەها میل زەوی هەراوو دەریای فراوانی نێوان خۆمو خۆی زیاتر هیچم نەدی.

ڕووم کردە ژووری (ڕینی). دەرگام کردەوەو سەرنجێکم لە ژوورەوە دا. نوێنی (ڕینی) چۆڵ بوو. ژوورەکە ڕێكو پێك بوو. دڵم داخورپا. ڕۆژەکانی دی، ژوورەکەی ئاوها ڕێك نەبوو. جلەکانی لەسەر کورسی کەوتبوونو هەر لنگە پێلاوێکی لەلایەك کەوتبووو کتێبەکانی لەسەر مێز کرابوونەوە. تا بەیانی لە ماڵەوە دەرنەچووبایە ژووەکەی ڕێك نەدەخست. تەنانەت لە ڕۆژی ئاساییشو دوای چوونە دەرەوەی، ژوورەکەی وەکوو ئەمڕۆ ڕێكو پێك نەبوو. هەر ڕامکرد بۆ لای دۆڵابی جلەکانی. گوتم ئێستا بەتاڵە، بەڵام نا! جلەکانی لە شوێنی خۆیان بوون. کە چاوم بە جلەکانی کەوت ئۆخژنم لە خۆم کرد. پاشان هەستم کرد تەنیا قاتە نیلییەکەی دیار نییە.

سەرنجم کەوتە سەر کتێبی سەر مێزەکە. کتێبەکە زەرفێکی تێدابوو. تەماشام کرد، دیتم بۆ منە. دانیشتم بۆ ئەوەی بیخوێنمەوەو بزانم چی تێدایە. دانیشتم، چونکە خۆم پێ لەسەر پێ ڕانەگیرا. (ڕینی) نووسیبووی:

(دایکی ئازیزم، من چووم بۆ ئەوەی (ئیلليگرا) ببینم. دەبێ بە تەنیا لەگەڵیا دابنیشم. بزانم بۆچی هەڵوێستی گۆڕاوە... ئەگەر بە ڕاستی گۆڕابێ! هەوڵ مەدە پەیوەندیم پێوە بکەی: نە بە تەلەفۆنو نە بە نووسین. کە هاتمەوە ماڵێ، یەکتر دەبینین. (ڕینی).)

ئەمەی لەبەر ئەوە بوو چونکە یەکسەر، دوای ئەو ڕۆژەی چوومە سەردانی دایبابی (ئیلليگرا)، ماڵی (ئیلليگرا) لەوێ باریان کردو ڕۆیشتن. ئەو ماوەیە (ڕینی) زۆر بە دەگمەن قسەی لەگەڵ دەکرم.

ئێستایش کە (رینی) ڕۆیشتووە، لە چاوەڕوانی زیاتر هیچم بۆ نەماوەتەوە. خوا (بابا)م لێ نەسێنێ، لەو زیاتر کەسم نەماوە.

گەرامەوە ژوورەکەی خۆم. جلم کردە بەرو هاتمە خوارەوە بۆ مدبەق. تێشتم بۆ خۆم ئامادە کرد. ئای ژیانم لێرە چەند قورسە!! لە چ تەنیاییەکی سەختدا دەژیم!! لە ولاتی خۆمدام، لەگەڵ ئەوەشدا بە تەنیا دەژیم. لێرە هەر کەسە بۆ خۆی و لە دووری خەڵك دەژی. ئەو خەڵکە لەگەڵ یەك هەڵناکەن و بەشداری ژیانی یەکتر ناکەن. ئەم دونیا گەورەیە هەموویان لێك جودا دەکاتەوە. ماوەی نێوان من و (کنساس) لە ماوەی نێوان من و (جیرالد) کەمتر نییە، ڕەنگە دوورتریش بێ، چونکە بەش بە حاڵی (پەکین)، بە خەیاڵ و بیرەوەریی بۆی دەفڕم و لە دەریا دەپەڕمەوە.

گوێم لە ناڵە ناڵێك بوو لە نهۆمی سەرەوە دەهات. حەپەسام. زانیم دەنگی (بابا)یە. هەر ڕامکرد بۆ لایەوە. دیم لەناو جێ ڕاکشاوە چاوی لەبەر نیگەرانی کوسکەی دێ. سەیری کردم و بە ورتە ورت گوتی:

– ناتوانم لەناو جێ هەستمەوە.

– هیچ جێت دێشێ؟

– نەخێر، هیچ ئازارێکم نییە.

– بەو دەقە بە، تا دختۆرت دێنمە سەر.

بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە دختۆرەوە کرد. دیم دختۆر (بروس سبولدن) هێشتا لە ماڵەوە دەرنەچووە. بە دەنگی باریکی وەڵامی دامەوە، گوتی:

– بەڵێ؟

– (بروس)، وا بزانم (بابا) تووشی نۆرە ئازارێکی تر هاتووە!

– هەر ئێستا دەیگەمێ.

- تا تۆ دێی، چی بۆ بکەم؟

- هیچ. با لەناو جێی خۆی بمێنێتەوە، لێ مەگەڕێ بجوولێتەوە.

گەڕامەوە لای (بابا)و پێمگوت ئێستا دختۆر (بروس) دێ. ژوورەکەم هەڵبژارد. (بابا) بە هێمنی ڕاکشابوو، بە چاو تەماشای دەکردمو هیچ قسەی نەدەکرد. هەستم کرد دەموچاوی بە لای چەپەدا خوار بورە. خۆی هەستی پێکردبوو. هەوڵی دەدا پێم بڵێ ئاوهای لێ هاتووە. پێمگوت:

- گرنگ نییە. ئێستا (بروس) دێ.

نەمکردبووە عادەت شەو پەنجەرەی (بابا) بە کراوەیی جێ بێڵم. دەترسام سەرمای ببێ. پەنجەرەکەم نەختێ کردەوە بۆ ئەوەی هەواکە تازە ببێتەوەو دامخستەوە. گوێم لە ترپەی پێی دختۆر (بروس) بوو لە نهۆمی یەکەم. هەستم کرد بە سەر پلیکانە کەوتو هاتە ژوورەوە بۆ لامان.

- بەیانی باش، ئیلیزابێت!

واقم وڕما کە ئاوها بە ناوی ڕووتو بێ نازناو بانگی کردم. ئەمە یەکەم جار بوو بەم جۆرە ناوم بێنێ.

- بەیانی باش، ئەوەتا (بابا)ی داماو چاوەڕێت دەکا.

(بابا) چاوی بڕییە دختۆر. پاڕانەوەی لە چاوان دەتکا.

(بروس) لە تەك چوارپای (بابا) دانیشتو دەستی بە فەحس کردنی کرد. بە ڕاستی دختۆر بە چاکی نەخۆش فەحس دەکا، جێی ئافەرینە! من بە وردی تەماشام دەکرد. (بابا)ی فەحس دەکرد. زۆر بە متمانەوە دەستی لێرەو لەوێی لەشی (بابا) دەدا. لەبەر ڕێزی دختۆر، بە پێوە وەستابووم. دختۆر (بروس)م زۆر بە دڵە. پیاوێکە بە گۆشتو

خوێن ئەمریکییەکی ڕەسەنە! بەلامەوە سەیرە ژنی نەهێناوە. باشترین مێردە بۆ ژنێ تێی بگاو ڕێزی بگرێ. پیاوێکی بالآبەرزی ڕەقەڵەیە. وەکوو زۆربەی خەڵکی (فیرمۆنت) لە هەڵوێستی سەنگیندا سەنگینە. ناتوانی حوکم لەسەر ڕەنگی چاوی بدەی. ئایا چاوی کاڵە؟ یان نا؟ هەندێ جار خۆی بە شین دەنگێوێ! قژی ڕەشێکی تارییە. لووتی ڕاستو زارێکی هەیە توندیو خۆڕاگریی خاوەنەکەی دەگەیەنێ. کە خەندەی دێتێ، سەراپای دەموچاوی دەگۆڕێ. دەموچاوی ناسکو خەندانە. هێمنو سەنگینە. چی سیفەتی چاکی ژن حەز دەکا لە پیاودا هەبێ، لە (بروس)دا هەیە. چینی بە پرسیارن، منیش حەزم کرد پرسیاری لێ بکەم بۆچی ژنی نەهێناوە. لای چینییەکان برادەر هەرچی پرسیارێکی لە برادەری خۆی بکا، عەیب نییە. نەك هەر برادەر، هەر کەسە دەتوانێ هەر پرسیارێکی بیەوێ لەهەر کەسێکی بکا.

کە لە فەحس کردنی بووەوە، گوتی:

– شتەکە ئەوەندە جێی مەترسی نییە.

لە قسەکەی بەردەوام بوو گوتی:

– چەند جارێکی تریش ئەو نۆرە ئازارەی سەر هەڵدەداتەوە. لێگەڕێ بحەسێتەوە. با بە کەیفی خۆی بخەوێ.

(بابا) خەوی لێکەوت. جێمان هێشتو دابەزینە نهۆمی خوارێو چووینە ژووری دانیشتن. لێمپرسی:

– ناشتات کردووە؟

– نەخێر.

– منیش ناشتام نەکردووە. با بە یەکەوە ناشتا بکەین. (رینی) ڕۆیشتووەو ئێستا تەنیام.

- ڕۆیشتووە؟

- بەڵێ. هیوادارم ڕۆیشتنەکەی تەنیا بۆ چەند ڕۆژێ بێ، هەرچەندە بە تەواوی نازانم.

چیرۆکی (رینی)و (ئیلیگرا)م بۆ گێڕایەوە. (بروس) بزەیەکی بە مانای هاتێ، گوتی:

- دەگەڕێتەوە لات. هەمووما دەگەڕێینەوە لای دایکمان. ئەوە ناڵێم ئەگەر کچەکە لە تۆ بکا، ئەگەرنا پێویستی بە تۆ هەیە، دێتەوە لات.

- دڵنیام (ئیلیگرا) لە من ناکا.

خواردنی ناشتام لەسەر مێز ڕیز کرد. خواردنەکە هێلکەو توستو میوەو قاوە بوو. من لای سەرەوەی مێزەکە دانیشتمو ئەویش لە لای دەستەڕاستم. ئەوسا، ئەو پرسیارەی لە دڵمدا بوو، لێمکرد:

- (بروس)، من خۆم بە شووکردن بەختەوەر بووم. ڕوخسەت هەیە لێت بپرسم: تۆ هۆی چییە ژنت نەهێناوە؟

- زۆر سەرقاڵم!

ڕاستی دەکرد سەرقاڵ بوو. خەریك بوو هەندێ کەرەی لەسەر توستەکە دادەنا.

- هەرچەندە ئەوە ئیشی من نییە.... بەڵام....

- فەرموو، چت دەوێ بیڵێ. من هیچ نهێنیم لە ژیاندا نییە.

- ئەگەر ژنت هێنابا، ژنەکەت کاتێکی زۆری بۆ دەگێڕایتەوە.

- نەخێر... ئەویش هەقی خۆی دەوێ، دەیەوێ بایەخی پێبدەمو هەمیشە لەگەڵیا بم.

- تۆ بەو شێوەی ئێستات بەختەوەری؟

- نازانم. بەڵام پێموایە بەڵێ! قەت ئەم پرسیارەم لە خۆم نەکردووە.

جارێکی تر فنجانەکەم بۆ پڕ قاوە کردەوە. ئەگەر نەیەوێ قسە بکا، هەر پرسیارێکی لێی بکەم، قەت قسە ناکا. ئەی ئەویش خەڵکی (فیرمۆنت) نییە!! ئیتر ئەوەندە بەسسە!

ئەو ڕۆیشتو من لەگەڵ دەردو کول و کۆڤانی خۆم مامەوە. بۆ (جیرالد) دەگریام و فرمێسکم ڕانەدەوەستا. تەنیا بۆ (جیرالد)و بەس! چەند مانگ بوو نەگریابووم. ئایا گریان هیچ بە هیچ دەکا؟! ئەوەتا دەرگای ماڵی گەورەی (پەکین) هەتا هەتایە بە ڕووم داخراوە.

هەستام، ڕووم کردە نهۆمی سەرەوە بۆ ئەوەی لە ویسحەتی (بابا) دڵنیا بم. دیم خەوێکی خۆشی لێکەوتووە. لە دڵی خۆمدا گوتم: تەنانەت (بابا)ش پێویستی بە من نییە.

*   *   *

# (٢١)

... وەکوو گوتم بە تەنیا مابوومەوە! تەنیا (بابا)م لەگەڵدابوو! ئەویش لە خواردنو هەموو داواکارییەکانی وەکوو منداڵی لیٚ هاتبووەوە. لە نانو شیر، یان، لە برنجو میوە زیاتر هیچی نەدەخوارد. ئەمڕۆ، پاش ئەوەی، وەکوو هەموو ڕۆژێکی شەممە، کەمێ پێویستی ماڵەوەم کڕی، خەریك بووم بەرەو ماڵ دەبوومەوە، لە ڕێگادا مەڕێکی باشم بینی دوو بەرخی جمکی لەبەر بوو. لە دەم ڕێگا، لەناو گیای سەوز دەلەوەڕان. دیمەنەکەم زۆر پیٚ جوان بوو. ترومبێلەکەم ڕاگرتو دابەزیم بۆ ئەوەی چێژ لەو دیمەنە جوانە وەربگرم. دیم لە شوێنێکی دوورو لاچەپی ئەم دونیایەم، شوێنەکە دەتگوت لە هەموو دونیا دابڕاوە. هەوای خۆش بوو. لەسەر کەورێك دانیشتم بۆ ئەوەی چێژ لە هەتاوی گەرمی ڤێرمۆنت وەربگرم کە هەرگیز وەکوو چرقەی خۆرەتاوی چین نییە.

کە مەڕەکە چاوی بە من کەوت، ڕاچڵەکیو قەڵەمبازێکی هاویشتو لێم دوور کەوتەوە. دوو بەرخەکەشی غاریان دا گەیشتنە لایەوەو لە تەکیا وەستان. لە ترسان چرکو هۆڕ دەلەرزین. خۆیان پیٚ لەسەر پیٚ ڕانەدەگیرا. مەڕەکە چاوی بڕییە من.

– لە من مەترسن!

من لە دەست بێدەنگییەوە بە تەنگ هاتووم، نازانم چۆن ئاوا بە دەنگی بەرز قسەم کرد. تەنیایی ماڵەوەم لەمەیش سەختترە. بیرم کردەوە سەرەکەو هەردوو بەرخەکە بکڕمو بیانبەمەوە ماڵێ. لە تەنیایی سەبووریم پێ دێن.

کە لای خۆم ئەم بڕیارەم دا، هەستام بە دوای خاوەنەکەیدا گەڕام. گوتم ڕەنگە جوتیارێکی ئەو ناوە بێ. نەختێ گەڕام، خاوەنی مەڕەکەم دۆزییەوە. دیتم جوتیار نییە. یەکێکە لەو گەڕیدانەی لە ڤێرمۆنت دەژین. ئەوانە بە دەگمەن نەبێ جوتیاریی ناکەن. هەر هیچ کارو کاسبییەك ناکەن. بە نەبوونی قنیات دەکەنو پاڵ دەدەنەوە. ئەگەر دەرفەتی کاریشیان بۆ بڕەخسێ، ئەو ماندووبوونە نادەنە بەر خۆیان ئیش بکەن.

ئاخیری کابرام دۆزییەوە. ئەوەتا لە ماڵی خۆی مێزێك چاك دەکاتەوە. کە چاوی بە من کەوت قیت بووەوە. بێئەوەی ڕابوەستێ تا سەلامی لێ دەکەم، یان بەخێرهاتنم بکا، گوتی:

– ها... چییە؟

یەکسەر، بێ پێشەکیو هێنانو بردن، پێمگوت:

– ویستم بزانم ئەو مەڕە ڕەشە فرۆتەنییە، یان نا؟

– لەوانەیە.

– بە چەندی دەدەی؟

هیچ گومانم نەبوو من دەناسێو دەزانێ کێم. دەزانێ ئەو ژنە تەنیایەم کە لەو چیایەدا دەژیم، یان شتێکی لەو بابەتە چونکە

مێردەکەم لە چینەو لێمەوە دوورە، بەڵام هیچی وای لێ دەرنەکەوت کە من دەناسێ.

تەختەدارێکی بە دەستەوە بوو دەیپێوا. بە دەم پێوانی دارەکەوە، وەڵامی پرسیارەکەی دامەوە:

– نازانم، چونکە بڕیارم نەداوە بیفرۆشم.

– منیش بەش بە حاڵی خۆم نازانم نرخی چەندە. تەنیا بۆ ئەوەمە گیای دەوروبەریماڵەوە بخوا.

– بیری لێ دەکەمەوە.

– باشە، دوای نیوەڕۆ من لە ماڵەوەم.

ئەو دوای نیوەڕۆیەی دام نابوو، نەهات. پاش دوو ڕۆژ، بەیانی دەرکەوت. پەتێکی کورتو پیسی لە ملی مەڕەکە کردبوو ڕایدەکێشا. بڕیارم دابوو چەندی پێ بدەم، گوتم:

– دە دۆلارو ئەوەی تر شەرابی ئەسفەندیان. نیو سەعات زیاتر بینەو بەرەمان لەسەر بڕی شەڕابەکە کرد. ئاخیری پێك هاتین. مەڕەکە بوو بە هی من.

ئەوەتا ئێستا لەبەر چاومە. بە خۆوو بە هەر دوو بەرخەوە لەو قەدپاڵە دەلەوەڕێ. یەکەم جار تا ماوەیەك لە دار سێوەکەم دەبەستمەوە تا هۆگری شوێنەکە بوو. دوای چەند ڕۆژێك مەڕەکە پێویستی بە بەستنەوە نەما. لە ژیانی نوێی خۆی ڕاهات.

ئەم مەڕە هەستێکی دڵنیایی تازەی پێبەخشیوم. ناتوانم دەست نیشانی بکەم، یان بچمە قووڵاییەوە. هەستەکە خۆی لە خۆیەوە شتێکی بچووکە، بەڵام زۆر زۆر قووڵە. ئەو هەستەیە کە بە زەوی دایك دەمانبەستێتەوە. ئێستا منیش خاوەن شتێکم، شتێکی زیندوو کە

لێرەو لەوێ، دێو دەچێ. پێویستە توند دەست بەو هەموو پەیوەندییەوە بگرم، نەوەك هەموو پەیوەندییەکم لەگەڵ ئەم زەوییەدا دەپچڕێ، پاش ئەوەی پەیوەندییەکی زۆر گەورەم پچڕا. نا، تەواو نەپچڕاوە. هەر ئەوەندەیە خۆی لێرە نییە. لەولایە. لەو شوێنەیە کە بە خۆشەویستی لەگەڵ (جیرالد) دەژیام؟ دەبێ هەروهەر، سەر لە نوێ، لێرە، لەسەر ئەم زەوییە ڕەگ دابکوتمەوە. ئایا ئەمەم بۆ دەکرێ؟

(رینی) هێشتا پەیوەندی پێوە نەکردووم.

* * *

## (٢٢)

- من لەو کەسانە نیم کە زۆر بە توندی ئاینییان گرتووە.

ڕۆژێ لە ڕۆژان، من وام بە (جیرالد) گوت. ئێوارە بوو. گومان هەموو گیانی داگرتبووم و (جیرالد) قسەی بۆ دەکردم. گوتی:

- باشە تۆ هیچ شتی وا لە خوداکانی چین دەبینی، قەناعەتت پێ بێنن؟

- ئەی تۆ ڕات لەم بارەیەوە چییە؟

- هاتوومەتە سەر ئەوە، لە ژیاندا دوو ڕێباز پەیڕەو بکەم. ڕۆژ هەیە باوەڕم بە هیچ خودانێك نییە، ڕۆژیش هەیە باوەڕم بە هەموو خودانەکان هەیە.

- من ڕێبازی دووەم هەڵدەبژێرم. بڕوا بە هەمو خودانەکان دێنم.

ئەو ژنەی تا بناگوێ لە خۆشەویستییدا نقووم بووبێ لە بیابانی بێ شۆو بێ پەیو سنووری خۆشەویستیدا وێڵ دەبێ. من وێڵ بوویم و هیچ لە بارەی، خۆمەوە نازانم. خۆم بزر کردووە. هیچم بەلاوە گرنگ نییە ئەوە نەبێ باوەڕ بەو شتە بێنم کە (جیرالد) باوەڕی هەیەو ئەوە بپەرستم کە (جیرالد) دەیپەرستێ!! کە بۆم دەرکەوت (جیرالد) هیچ شتێ ناپەرستێ و ئەوەی بڕوای پێ هەیە لە بیرو یەقین و خواست و ئیرادەوە

هاتووە، نەك لە هەواو ئارەزوو، لەوە زیاتر بە دوای گفتوگۆی لاهووتیدا نەچووم. هەندێ جار، کە بە لادێکانی چیندا دەسووڕاینە، دەماندی جوتیارێك زۆر بە کزیو لارەملی لە دیار قسنێکی دەم ڕێگا وەستاوە. قسنەکە پەیکەری دوو خودانی نێرینەو مێینەی هاوسەری تێدابوو. جوتیارەکان تەنیا بەو جۆرە خودانەکانی خۆیان دێتە بەرچاو. قەت بە خەیاڵیاندا نایێ خودانەکەیان تاكو تەنیاو بێهاوبەش بێ. چونکە ئەمەیان بەلاوە دژی یاسای ژیانە. بەم جۆرە، دەماندی جوتیارەکە لە دیار ئەو دوو هاوسەرە پیرۆزە دەوەستاو بخووری بۆ دادەگیرساندنو لە دڵی خۆیدا دوعای دەکردو هەر بە ئومێد بوو دوعای گیرا ببێ. دیمەنەکە هەر چەندە شتێکی سادە بوو بەڵام زۆر بە مانا بوو. بە (جیرالد)م گوت:

- خۆزگە ئێمەیش بمانتوانیایە بەو بڕوایە قووڵە بپاڕێینەوەو دوعا بکەین.

- مەسەلە مەسەلەی بڕوا نییە، تەنیا مەسەلەی پاڕانەوەیەو بەس.

بڕوا لە ئاتاجو پێویستییەوە سەر هەڵدەدا، ئێمەیش لە هیچمان کەم نییەو هیچ پێویستیمان نییە.

ئەمە ڕاستە! من ئەو ڕۆژانە، خوام بە بیر دێتەوەو لێی دەترسمو لەبەری دەپاڕێمەوە کە ئیشو کارم گیروگرفتی تێدەکەوێو هەست دەکەم پێویستم پێ هەیە. هەموو شەوێ، نیگەرانی سەختم بۆ کوڕەکەم هانم دەدا بچمە ژوورەکەیو لەو ژوورە کپو بێدەنگەدا بوەستمو دەستی دوعاو پاڕانەوە لەبەر خوا پان بکەمەوە کوڕەکەم چەپاڵە بدا. ئاخۆ دوعاکەم تا چەند قبوڵ دەبێ؟ نازانم. ئایا کەس گوێ لە دوعاکەم

دەگریێ؟ نازانم. من ئەوەندەم بەسە هەست دەکەم بارێکی گرانم لەسەر شان لا کەوتووەو ئەو گرێیەی لە دڵمدا بوو، نەماوە.

ئەو ڕۆژانە، کە کوڕەکەم لەماڵەوە نەبوو، توانیم جڵەوی ئارەزووی خۆم بگرم کە هانی دەدام تەلەفۆن هەڵگرمو داوای ماڵی (ئیللیگرا) بکەم. دەمتوانی زۆر بە ئاسانی تەلەفۆن بکەمو بپرسم: ئەریێ (رینی) لەوێیە؟ ئینجا بڵێم: ئایا دەتوانم قسەی لەگەڵ بکەم؟ بەڵام شتی وام نەکردو نایکەم. نەك بۆ ئەوەی سەر بۆ خواستی ئەو دانەنەوێنم. یان بترسم نەوەك لەو کردەوەیەم نەبووریێ، بەڵکو بۆ ئەوەم بوو خۆم لە ژیانی تەنیایی ڕابێنم.

لەو کاتەدا، گوێم لیێ بوو (بابا) بانگی کردم. چووم، دیم لەسەر عەردی ژوورەکە، لەو گۆڕە کەوتووە. دیاربوو ویستبووی لەناو نوێن بێتە دەرەوەو بەرببووەوە. بەو دەقە لەو گۆڕە کەوتبوو، هیچی لە دەست نەدەهات. پێی گوتم داخۆ هیچی لیێ نەهاتووە؟! (بابا) ئێستا لەحزە بە لەحزە دەژی. تەنیا ئەو لەحزەی بەلاوە گرنگە کە تێیدا دەژی. دیارە بە ئاگاهاتووەو بڕیاری داوە لەناو جیێ بێتە دەرەوە. هەوڵی هاتنە دەرەوەی داوەو بەربۆتەوە. یارمەتیم دا بۆ ئەوەی قیتی بکەمەوە سەر پیێ، بەڵام ئەو دووری خستمەوە. هەر چەندە بیێتاقەت بیێو خۆی پیێ ڕانەگیریێ، کاتیێ کە خۆی دەشواو جلی دەگۆڕیێ، لیێ ناگەڕیێ من بەلایدا بچم. تا کەوای چینی لەبەر نەکا، بانگم ناکا بچم یارمەتی بدەمو دوگمەکانی بۆ دابخەم.

ئیتر لە ژوورەکەی هاتمە دەرەوەو چاوەڕێم کرد تا بانگی کردم ئەوسا چوومەوە ژوورەوەو یارمەتیم دا کەوای چینی لە بەر بکاو گوتی ئامادەم تیشتی دواکەوتووم بخۆم.

(بابا) ئارامو بەختەوەرە. ترسی هیچی نییەو بۆ هیچ شتێ نیگەران نییە. پێویستی بە عیبادەتو دوعاو پاڕانەوە نییە. مێشکی کەمێ ئەزیەتی خواردووە. دەزوولەیەکی زۆر بچووکی خوێنبەری کۆئەندامی خوێنی تەقیوە. توانای بیرکردنەوەی نەماوە!! توانای نیگەران بوونو بێئۆقرەیی نەماوە!! کێ دەڵێ خودانەکان ڕەحمیان نەماوە؟

* * *

# (٢٣)

ئاخیری (رینی) هاتەوە. ئاخیری جۆشی دەروونم دامرکایەوەو دڵم ئاسوودەبووەوە! هاتەوە، دوای ئەوەی ملم بۆ ڕووداوەکە داو بەبێ دەنگی بەرگەم گرت. هاتەوە، دوای ئەوەی لە دوعاو پاڕانەوە تێر بوومو چارەنووس دەستی بۆ درێژ کردم.

شەوی ڕابردوو درەنگ، نووستبووم، کە هاتەوە. من خەوم زۆر سووکە. لەگەڵ هەر چرپەو جوولەیەك بە ئاگا دێم. دەرگای مدبەقم وەکوو جاران کلیل دابوو. لەگەڵ جوولەی کرانەوەی دەرگای مدبەق بە ئاگا هاتم. لەبەر ئەوەی تەنیا (رینی) کلیلی دەرگای مدبەقی لایە، زانیم خۆیەتی دەرگای کردەوە. دوای ئەوە، چاوەڕێی دەنگی کرانەوەو داخستنەوەی سارنجۆکم کرد. دەنگەکەم هاتە بەرگوێو تەواو دڵنیابووم خۆیەتی. ئێستا چ بکەم؟ بە من بوایە لەناو نوێن دەرپەڕمو هەر ڕاکەم بۆ نهۆمی خوارێو باوەشی پێدا بکەم، بەڵام تەنیایی زۆر شتی فێر کردووم. یەکێ لەوانە ئەوەیە پێویستە بە سەبرو هەدار بمو بزانم چۆن هەنگاو داوێم. گرنگ ئەوە نییە من چم دەوێ، گرنگ ئەوەیە ئەو لێم وەربگرێ. ئەوە جارێك جێی هێشتمو ڕۆیشت، ئیتر لەمەودوا ئاسانە جارێکی تر جێم بێڵێو بڕوا. تازە فێربووە چۆن بەبێ من

هەڵبکاو لە دووریماڵەوە بژی. نا.... ناچمە خوارەوە بۆ نهۆمی یەکەم. لێیدەگەڕێم، هەر وەکوو چاوەڕێ دەکا، با وا تێبگا خەونووم. با سبەینێ هاتنەوەی بکا بە سەرسامییەك بۆ منو منیش وا پێشان دەدەم دەرکەوتنی کتوپڕی سەرسامییەکە بۆ من. (رینی) دەوری منداڵیی بەسەر چووە کە دادەنیشتینو بیروباوەڕو هەستو نەستمان ئاڵوگۆڕ دەکرد.

لەناو نوێن جوولەم نەکردو نەهاتمە دەرەوە. ڕاکشامو بەبێ دەنگی چاوم بڕییە تریفەی مانگ کە لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوورێ. گوێم لێ بوو نانی لە سەر میزی مدبەق دەخوارد. گوێم لە دەنگی دانانی قاپو ڕاکێشانی کورسی بوو. زانیم دەستی بە نان خواردن کرد. ماوەی نیو سەعاتی تەواو گوێم ڕاگرت، ئەوسا گوێم لێ بوو دەرگای مدبەقی لای پلیکانە کرایەوە کە دەچووە ژوورەکەی (رینی). دیارە زۆر برسی بووە بۆیە ئەو هەموو ماوەیە خەریکی خواردن بوو. بە چۆنیەتی کردنەوەی شێرەی ئاوی سەرشۆرك، زانیم دەیەوێ من بە ئاگا نەهێنێ. زانیم کارێکی چاکم کرد لەناو نوێن نەهاتمە دەرەوە. تا دڵنیا نەبم خەوتووە، ناچمە ژوورەکەی. ئەوسا لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر تەماشات کردبام، شوکرانەت لە چاومدا دەدی. ئەوەندە بەسسە کە هاتەوە. هەستم دەکرد، وەختە دڵم لەناو قەفەزی سینگم دەربەڕێو بفڕێ بۆ ئاسمان، سوپاسی خوا دەکەم کە ئەو چاکەیەی لەگەڵ کردم. سوپاس خودایە! هەزار جار سوپاس!

لە دڵی خۆمدا گوتم: کە هەموو شتێ هێمنو ئارام بووەوە، دەخەومەوە. بەڵام تا نەزانم بە چ حالێك هاتۆتەوە، چۆن خەوم لێ دەکەوێ؟ لەگەڵ ئەوەشدا، لە جێی خۆم ناجوولێمەوە. ئەویش ئەوەتا

لەو ژوورەی کە تەنیا ژوورێکی لەگەڵ ژووری من بەینە، لەناو نوێنی خۆی ڕاکشاوە. بەڵام هەست دەکەم لەم لەحزەیەدا زۆر زۆرم لێ دوورە. لە (جیرالد) لێمەوە نزیکتر نییە کە لە (پەکین)ە. لەمپەرێکی پتەو لە بەینی منو کوڕەکەم دروست بووە. دان پێدا دەنێم کوڕەکەم بووە بە پیاو. پێویستە چاوەڕێ بکەم بزانم خۆی دەیەوێ چیم پێ بڵێ. لەوانەیە لەمەودوا پێویستی بە دایك نەبێ. لەوانەیە منی تەنیا وەکوو هاوڕێیەکی بەساڵاچوو بوێ کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دایکی بوویم.

چاوەڕێم کرد.... کات بە هێواشی دەڕۆیشتو بە گرانی دەبزووت. ویستم بزانم لەوەتی هاتۆتەوە چەند سەعاتی پێچووە. تەماشای سەعاتی تەك چوارپاکەمم کرد دیم ئەو هەموو چاوەڕوانە قورسە لە سەعاتێكو دە دەقیقە زیاتر نییە. ئەوسا گوێم لێ بوو دەسکی دەرگای ژوورەکەم بە هێدی جوولایەوە. لەناو نوێن نەجوولامەوەو چرام دانەگیرساند. دیم لە درزی دەرگا وەستاوە، ڕۆبی سووری حەمامی لەبەرە. سووربووم بە ئاسایی قسەی لەگەڵ بکەم، وەك ئەوەی هیچ نەبووبێ.

- (رینی)، ئەوە تۆی؟
- بێجگە لە من کێ هەیە؟

ئەو جۆرە قسەیە بەبێ باکی لە گرنگترینو گەورەترین ساتەوەخت دەکرێ. جگە لەوەیش وڵامدانەوەکەی زۆر بە سادەیی و ئاسایی بوو.

- دایکە، چۆنی؟
- باشم. ئەوە تازە هاتیتەوە؟
- نەختێ خواردنم لە مدبەق خوارد.

هاتە لامەوە، لەسەر چوارپاکە دانیشت. هەردووکمان لەبەر تریفەی مانگەشەو، چاومان بڕییە چاوی یەکتر. پێمگوت:

– چرا دابگیرسێنم؟

– نەخێر، با هەر وا بێ. تەنیا ئەگەر نەتەوێ بخەوی! خۆ سەخڵەتم نەکردی؟

– با.... ڕەنگە!

وامگوت و وام پێشان دا خەوتبووم.

– گوێ مەدەرێ. بەیانی وەکوو جاران زوو لە خەو هەڵناسم. (مات) مانگاکان دەدۆشێ.

– ئایا هەموو شتێ ئاساییە؟

لێرەدا، ویستم ئاسایی بم وەك ئەوەی هیچ نەبووبێ.

– مەڕێکی ڕەشم کڕیوە، دوو بەرخی سپی لەبەرە. ئیتر لە گیا بڕینەوە دەحەسێمەوە.

وا دیاربوو هیچ نەمابوو باسی بکەین. من نابێ ڕێ بدەم چی لەناو دڵمدایە بێتە دەرەوە. ئەویش هەرچی بۆم باس بکا بە سینگێکی فراوانەوە وەری دەگرم. وەکوو وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە دڵم دەجۆشان و دەمەویست لێی بکەم. هیچ چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە لەپڕ پێی گوتم:

– دایکە لێت نەپرسیم لە کوێ بووم؟

– دەتتوانی نامەیەکم بۆ بنووسی.

– بۆم نەکرا. گرنگ نییە لە کوێ بووم. دایکە پێم ناڵێی تۆ بۆچی منت هێنایە ئەم دونیایە؟ پێشتریش ئەم پرسیارەم لێکردی.

– بەڵام چاوەڕێت نەکرد وەڵامت بدەمەوە.

ویستم بە بیری بێنمەوە ئەوسا لە چ حاڵەتێکدا بوو.

– ئێستا وا چاوەڕێ دەکەم.

دیارە ئێستا ئەوە پرسیار دەکا، نەك من!؟ هەوڵ دەدەم بە پێی توانا بە ڕاستی وەڵامی بدەمەوە:

منو باوکت بە هەموو هێزو ئارەزووی دڵ حەزمان لە یەك کرد. کە دوو مرۆڤی گەنجو ساغو پتەو ئەو جۆرە حەزەیان لە نێودا پەیدا ببێو یەکێ پیاو بێ ئەوەی تر ژن، ئەوپەڕی هیواو ئاواتیان ئەوەیە منداڵێکیان ببێ!! منداڵێك بێننە ئەم دونیایە!!

– بیرت نەکردەوە من چارەنووسم چ دەبێ؟

ئای ئەو گازاندەیەی چەند تاڵو ژار بوو، چەند ناخۆش بوو!!

– وەکوو هەقدانێك بە باوکت، وا چاکە بزانی باوکت بە ڕاستی بیری لەم جۆرە شتە دەکردەوە. بەڵام من گوێم بەو بۆچوونەی نەدەدا. پێم گوت با منداڵمان ببێ، منداڵەکەمان ئەوەندە پتەوو جوانو بڕوا بە خۆ دەبێ، دەتوانێ ڕووبەڕووی هەموو شتێك ببێتەوەو بە سەرکەوتوویی دەربیا.

چاوی لەبەرچاوم وەکوو خەڵووز وا بوو لەناو دەموچاوی زەردو بزڕکاویدا. گوتی:

– کاتێ لە چین بووم، منیان بە بێگانە دادەنا. ئەوەم کەموزۆر، بە لاوە گرنگ نەبوو. چونکە وامدەزانی نیشتمانێکی ترم هەیە. وامدەزانی نیشتمانی من ئەمریکایە.

– خەڵك لێرە تا بڵێی لەگەڵتا میهرەبانن!

کەوام گوت گەرووم ئەوەندە وشك بوو، وەخت بوو زمانم بە ئاسمانی دەممەوە بنووسێ. هەستم کرد لێوەکانم دەڵێی دوو تەختەدارن.

– من پێویستم بە سۆزو میهرەبانی نییە. پێویستم بە خۆشەویستییە.

– هەر خۆشەویستییەکی دەتەوێ هەتە: باوکت خۆشی دەوێی، من خۆشم دەوێی، ئەو خۆشەویستییەشت دەبێ کە لە ئافرەتێکی تردا بۆی دەگەڕێی.

– (ئیلليگرا)، ئیتر خۆشی ناوێم. دایبابی ئەمەیان لێ قەدەغە کردووە.

– ئایا دەکرێ کەڵەوەکێشییان بکەین؟ کاتی خۆی دایکم هەڕەشەی لێکردم باوکتم خۆش نەوێ، بەڵام من بە گوێم نەکردو هەرگیز پەشیمانیش نەبوومەوە کە سەرکێشیم لێ کرد.

ڕاستە، پەشیمان نیم لەوەی کردم، سەرەڕای ئەو نامەیەی لە نهۆمی سەرەوە، لەناو سندووقی نامە تایبەتییەکانمدایە، ئەو نامەی غەمو خەفەتی لێ دەچۆڕێتەوە سەرەڕای ئەوەیش کە باش دەزانم تازە جارێکی تر هیچ نامەم بۆ نانووسێ.

– هەموو کەس هێزی کەسێتییان وەکوو یەك نییە.

به مۆڕییەك تەماشای کردم.

– ئافرەتێ لاواز بێ مانای وا نییە خۆشەویستی لەوانیدی کەمترە.

– (ئیلليگرا) لە چ دەترسێ؟

بە هەموو توانای خۆمەوە، هەوڵم دا لێی بشارمەوە کە لە دڵەوە ڕقم لەو کچەیە.

– لە من ناترسێ. لەوەی ناو خوێنی دەمارەکانم دەترسێ. لەوە دەترسێ کە لە گیانمدا بووەو لە گیانمدایەو بە هیچ جۆرێ ناگۆڕێ.

– مەبەستت لایەنی چینییە؟

سەری لەقاند، یانی بەڵێ و دەستەکانی تێك ئاڵاند. دەستە چینییەکانی زەردو نەرم نەبوون. دەستی ئەمریکی و زبرو توند بوون. بەردەوام بووم. گوتم:

– منیش هەر وای بۆ دەچم. ئەو لایەنەی لە تۆدا خۆشم دەوێ لە هەموو لایەنێ زیاتر شانازی پێوە دەکەم چونکە باوکتم خۆش دەوێ. ئایا ئەوەیە کە هیوات دەخواست لە تۆدا نەبێ؟ ئای لەو شوورەییە!!

– تۆ تێناگەی. تۆ ئەمریکی و تەنیا خوێنی ئەمریکیت لە دەماردا دەگەڕێ و بەس.

– خوێنی ئەمریکی چی؟ خوێنی ئەمریکی چ پاکییەکی تێدایە؟ خوێنی منیش لە خوێنی یاخی و قاچاغچی شەش گەلی ئەوروپا تێکەڵە. بەرهەمی ڕەچەڵەکی کوڕێکی هەڵەشەی لۆردێکی ئینگلیزو کچێکی ئیرلەندییە. خوێنی بازرگانێکی هۆڵەندییە کە هیندییەکانی خاپاندو لە شوێنی خۆیان وەدەری نان، پالاوتەیەکی ئەڵمانی....

قسەی پێ بڕیم و سووربوو لەسەر قسەی خۆی:

– ئەمە هیچی گرنگ نییە! ئەمانە هەموویان لە ڕەگەزی سپین.

پێم باشە دژی نەوەستم. ئێستا کاتی پیلەکەو ململانە نییە.

– با بە دڵی تۆ بێ!

وام بە چاك زانی بەم جۆرە کۆتایی بەم گفتوگۆیە بێنم. گوتی:

– من دەچمە (کنساس). وەرزی هاوین، لەوێ، لە شینایی (سام) ئیش دەکەم. ئەوسا بۆ پایز، دەچمە کۆلێج...... سام یارمەتیم دەدا پارەی خوێندنەکەم دابین بکەم.

بەم جۆرە قسەی بۆ کردم، بێئەوەی بە دەم قسەکردنەوە بڵێ: (ئەگەر ڕێم بدەی!)، یان (ئەگەر پێت ناخۆش نەبێ!)، یان (ئەگەر لێرە

پێویستت بە من نەبێ!) ئەگەر پێویستیشم پێ بوایە نەفسم ڕێی نەدەدام داوای لێ بکەم بمێنێتەوە.

– بۆ ئەوە هاتیتەوە، ئەمەم پێ بڵێی؟

– بەڵێ، بۆ ئەوەی ئاگادارت بکەمەوە.

کە ئەم قسانەی دەکرد، سیمایەکی توندو سەنگینی بە دەموچاوەوە دیاربوو. ئەمە چارەنووسەو دەبێ بە سنگ فراوانییەوە وەری بگرم. نابێ هیچ نیشانەیەکی گلەو گازاندەم لێ دەربکەوێ. لێم پرسی:

– کەی سەفەر دەکەی؟

– چاوەڕێ دەکەم تا باپیرەم دەبینم.

ناڕەزاییم پێشان داو گوتم:

– دەبێ لەوە زیاتر بمێنیتەوە.

ڕەنگە کاتی ئەوە بێ باسی ژنی باپیرەی بۆ بکەم کە دەکاتە داپیرەی. ئەو جۆشەی لە دڵیدایە بێ شك هی داپیرەیەتی بۆی ماوەتەوە. ئەویش زۆری ئەزیەت خوارد چونکە هەستی دەکرد خۆشیان ناوێ. بۆی هەیە یادی داپیرەی لە من زیادتر بە کەڵکی بێ.

– (رینی)، لانی کەم ڕۆژێك بمێنەوە. هەندێ شت هەیە، دەمەوێ، بەر لەوەی بڕۆی، بۆت باس بکەم.... پێشتر بۆم باس نەکردووی.

– بە چاوە ڕەشە تۆخەکانی سەرنجێکی خێرای لێدامو گوتی:

– مادەم وات دەوێ، با وا بێ!

* * *

# (٢٤)

کوا ئەو نیشتیمانەی ببێ بە نیشتیمانی کوڕەکەم؟ کوڕەکەم وڵاتێك لە کوێ بدۆزێتەوە بە وڵاتی خۆی بزانێ؟

بەیانی، کە (بابا) لە خەو هەستا، چووینە سەرەوە بۆ لای. دیتم شەوی ڕابردوو چۆن جێم هێشتبوو بەو دەقە لەناو جێ ڕاکشابوو. تەنانەت قژی سپیشی ئەوەندە تێك نەچووبوو. چاوەکانی نیوە کرابوونەوە. ئاورینگێکی ئاڵۆزیان لێ دەبووەوە. هیچم بە لاوە ڕوون نەبوو. دەمی قسەم تێ کرد:

- باوکە، ڕۆژ باش، سەیر کە کێ هاتۆتە سەردانت؟

چاوی کردەوە، مێزەی کردین و گوتی:

- کێیە؟

- خۆت دەزانی.

- (جیرالد)ە؟

- نا.....نا..... نا...... (رینی)یە!

(رینی) نە ناسیەوە. تەنانەت نەوەی خۆیشی لە بیرکردووە. بە ورتەورت گوتی:

- ئایا پێویست بە ناسینی دەکا؟

- ئەی چۆن! پێویست بە ناسینی دەکا. ئەمە کوڕی (جیرالد)و کوڕی منە.

- کوڕی (جیرالد)؟ (جیرالد) کوڕی هەبوو؟

ئاوڕم لە کوڕەکەم دایەو گوتم:

- ببوورە (رینی). کەوتۆتە ناو ساڵانو هەموو شتێکی لە بیر چووە.

ئای خوایە ئەو غەمە چییە لە ڕووی ئەم گەنجەدا دەیبینم؟ ئەو بێزارییە چییە وەکوو پەدە بەسەریدا کشاوە؟

(رینی) وەڵامی دامەوە:

- گوێ مەدەرێ، گرنگ نییە!

بە باپیرەم گوت:

- هەوڵ دە بخەویتەوە. هەر ئێستا دەگەڕێمەوە لات.

بە کپو بێدەنگی لە ژوورەکەی چووینە دەرەوە. دڵنیا بووم (بابا)یشم لە دەست چوو. بە ناچاری جێی هێشتینو کشایەوەو لێمان دوورکەوتەوەو بە ناو قووڵایی بیابانی پیریدا شۆڕبووەوە.

ئەوسا ئارەزوویەکی زۆرم هەستا بۆ ئەوەی کوڕەکەم لە پەلەقاژەی هەڵەدا دەربێنمو پێمگوت:

- (رینی)، وەرە بچینە ژوورەکەی من. هەندێ وێنەم هەیە دەمەوێ نیشانت بدەم. پێش ئەوەی بڕۆی، دەبێ ئەو وێنانە ببینی.

بە ئارامی شوێنم کەوتو وەکوو میوان: لە ژوورەکەم، لەسەر کورسییەك دانیشتو چاوەڕێی کرد. وێنەکانم لەناو سندووقەکە

دەرهێناو گەڕام وێنەی دایکی (جیرالد)م دۆزییەوە. وێنەکەم نیشان داو گوتم:

- ئەمە ئەو خانمە چینییەیە کە (بابا) زەماوەندی لەگەڵ کرد. داپیرەتە، دایکی باوکتە! سەیر کە چەند بە جوانی خۆی پێشان دەدا!! کەسێکە مرۆڤ هەر حەز دەکا شانازی پێوە بکا. لە بنەماڵەیەکی هەرە ڕەسەنو دێرینی پەکینە. بێشك، لەوانەیە (هان یو - ڕەن)ی خاڵە گەورەت لە بیر بێ.

(رینی) وێنەکەی لێ وەرگرتو لێی وردبووەوە. لە ڕوخساری هێمنی چینی وردبووەوەو ئاخیری گوتی:

- (بابا) بۆچی زەماوەندی لەگەڵ ئەمە کرد؟

- ویستی پەیوەندی بەو وڵاتەوە پتەوتربێ کە ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردبوو. وایدەزانی بەم کارە لە دڵی خەڵکەکە نزیك دەکەوێتەوە کە خۆشی دەویستن. ویستی.... لەو وڵاتەدا، بێگانە نەبێ......

- ئێستا ئەمەی هیچ لە بیر نەماوە. تەنانەت منیش ناناسێتەوە. وا بزانم ئەو ژنەی خۆش نەویستووە!

- بۆچی وا دەڵێی؟ خۆ تۆ نازانی ئەوان پەیوەندییان چۆن بووە!

- ئەگەر ئەو ژنەی خۆشویستبا. ئێستا منی بە بیر دەهاتەوەو دەیناسیمەوە.

نەمتوانی نکووڵی لەو ڕاستییە بکەم. من خۆم هەر چەندە بکەومە ناو سالآنو بارودۆخم هەر چەندە بگۆڕێ، تا هەناسەم لەبەردا مابێ هەرگیزاو هەرگیز (جیرالد)و کوڕی (جیرالد) لە بیر ناکەم.

- بە هەر حاڵ، (بابا) چی پێ باش بووە، وای کردووە.

- ئەمە هیچ نییە. دەبێ دەماری خۆشەویستی تێدا هەبێ.....

وێنەکەی دامەوە. هەستایەوە. ئینجا داهاتەوە ماچێکی لە گۆنام کردو گوتی:

– خودا حافیز، دایکە!

دوای ئەوە یەکسەر چووە دەرەوە. ئینجا گوێم لە دەنگی ترومبێلە کۆنەکەی بوو، بە توندی لە سەری ڕێگاکە پێچی کردەوەو ڕۆیشت. دەشێ ئەم جارە دوا جار بێ و هەرگیز جارێکی تر نەیەتەوە لام. بە هەر حاڵ، نازانم! بەڵام ئەوەی ئێستا بیری لێ دەکەمەوە ئەوەیە بەو شێوە ئینگلیزییە قسەی دەکرد کە باوکی فێری کردبوو. ئینگلیزییەکی ڕەسەن و پاک و پەتی و بێ هیچ هەڵەیێك. هیچ کاریگەری ئەمریکی پێوە دیارنەبوو.

ئەمە یانی چی؟ نەمدەزانی؟

ناتوانم بڕۆم و شوێن (رینی) بکەوم. ئەگەر بشمەوێ بچم، ناتوانم (بابا) جێ بێڵم، چونکە لە من زیاتر کەسی نییە. ئەویش چارەنووسی وەکوو چارەنووسی من بەم زەوی و بەم شینایییەوە گرێ دراوە. دوور لە هەموو کەس تەنیا (مات)و ژنەکەی نەبێ کە زۆر لەمێژە لەم دۆڵەدا دەژین. وایان لێ هاتووە تەنیا زمانی ئەو خۆشەویستییە دەزانن کە ڕقی لێ هەڵدەقوڵێ. هەمیشە شەڕیانە. بە ڕۆژ چێژ لەم شەڕو ناکۆکییە وەردەگرن و گومانی تێدانییە بە شەویش حاڵیان هەر وایە. دڵنیام هەرەتی کێشەی نێوان لە شەوو لەسەر چوارپای کۆنی دوو نەفەرییاندایە! چوارپاکەیان لایەکی زۆری ژووری بچووکی نووستنی تەك دیواری باکوری مدبەقی داگیر کردووە. خودا حەفت منداڵی پێداون. بە یەکەوە پەروەردەیان کردوون و پێیانگەیاندوون. هەموو منداڵەکانیان بەرهەمی ئەم شەڕو دەمەقاڵێیەن. لەو بڕوایەدام

پێویستیان بە هیچ برادەرایەتیو هیچ ڕابواردنێك نەبووە ژیانیان بگۆڕێ... چونکە (مات) تا ڕادەی شێتاتی دڵی پیسە.... ژنەکەیشی شانازی دەکا کە مێردەکەی دڵی پیسەو کێشەی بۆ دروست دەکا. ئەگەر (مات) بە ڕێکەوت شەپقەی پیاوێك لەماڵەوە ببینێ، دونیا خراپ دەکا.... ژنەکەیشی شانازی پێوە دەکاو خۆی پێ ڕادەنێ.

- ئۆی نرخەکەی من دەیدەم.... من دەیدەم......

هەر وایدەگوتو دووبارەی دەکردەوەو لە خۆشییان دەموچاوی لۆچ لۆچی دەدرەوشایەوە. ئەمڕۆ بەیانی، ژنەکەی ئەمەی لا درکاندم، کاتێ بە ڕێگاوە بووم دەچوومە ماڵیان بۆ ئەوەی بێزاری لە خۆم دەربکەمو سەیری گوڵەکانیان بکەم کە بە جوانو ڕێكو پێکی ڕێکیان خستنوون.

بەر لەوەی وەکوو هەموو جارێ وەڵامی بدەمەوەو پێی بڵێم بەختەوەرە کە مێردەکەی خۆشی دەوێ بۆیە تا ئەو ڕادەیە دڵپیسی بەرامبەر دەکا، دیم پۆستەچی چووە لای ماڵی ئێمە. ماڵاوایم لە ژنەکە کردو دوای پۆستەچی کەوتم. لەبەر سێبەری دارکەوەتی گەورەی لای حەوشە چەند نامەیەکی دامێ هیچی وایان تێدا نەبوو بایەخێکی وای هەبێ تەنیا یەك نامە نەبێ کە لە زەرفێکی بۆری تەنکدا بوو. مۆری پۆستەی سەنگاپوورەی لەسەر بوو، بەڵام نەمزانی ناونیشانی سەر زەرفەکە بە خەتی کێ نووسراوە. دەسخەتەکەم بەلاوە نائاشنا بوو.

- ئایا ئەمە نامەی مێردەکەتە؟

پۆستەچی، کە دیتی دەمەوێ بزانم دەستخەتی ناونیشانی سەر زەرفەکە هی کێیە، ئەم پرسیارەی لێکردم. منیش وەڵامم دایەوە:

- نەخێر!

ترسام داخۆ دەبێ ئەم نامەیە چی تێدا بێ. لە پۆستەچی دوور کەوتمەوە. ڕووم کردە بەردەکەی سەر کانی. لەوێ، لە ژێر دارسێوێك دانیشتمو نامەکەم کردەوە. سەرەتای نامەکە بەم جۆرە بوو:
(خوشکی گەورەوو ئازیزم!......)
کەواتە ئەم نامەیە هی ژنەکەیە.

لەوەتی نامەی (جیرالد)م بۆ هاتووە، بە درێژایی ئەو چەند مانگە، هێشتا وەڵامی نامەکەیم نەداوەتەوە. داوای ڕەزامەندیی لێ کردووەمو وەڵامی داواکەیم نەداوەتەوە. ئەو ماوەیە، هەرچی دەمکرد، نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە. دەمزانی وەڵامەکەم دوا دەکەوێو هەستم بە تاوان دەکرد کە ئەم نهێنییە دەشارمەوە. ئێستا ناتوانم لەوە زیاتر نهێنییەکە بشارمەوە.
نامەکەی بە زمانێکی ئینگلیزی شڕو وڕ نووسی بوو. هەوڵی دابوو کەفوکوڵی دەروونی دەرببڕێ. ویست بووی قەناعەتم پێ بێنێو زۆریش سووربوو کە تا من ڕەزامەندی لەسەر نەدەمو ڕوخسەتی نەدەم، ئەو هەرگیز ناچێتە ناو ماڵی منو جێگای من ناگرێتەوە. نووسیبووی:
((تۆ ماوەیەکی زۆر لە پەکین ژیاوی، بۆیە پێم وایە زۆر شت لە بارەی ئێمەی گەلی چین دەزانی. بە هەر حاڵ، ژیان لێرە زۆر بە زەحمەت کەوتووە. گومانی تێدا نییە (ماك لیود)ی مێردی تۆش بەرەو ڕووی ئەو زەحمەتە بۆتەوە.... زۆر پێویستی بە ژنێکە ببێ بە کابانو بنەوانی، ماڵی بۆ ڕێك بخاو کاروباری بۆ پێك بێنێ... کە جاری یەکەم قسەی لەگەڵ من کرد، بۆ تۆی نووسیو داوای ڕەزامەندی لێ کردی. ڕێ بدەی بێمە ناو ماڵیو وەکوو جێگرەوەی ژنەکەی لە ماڵی بم. خۆت دەزانی ئەم شێوازە شێوازێکی باوە لە جیاتی هێنانی ژنی دووەم، یان گرتنی

دۆستێك وەکوو جاران باو بوو. بێگومان هەر کاتێ تۆ لەسەر خێران هاتیتەوە ماڵی خۆت، من بە کەیفی تۆ لەم ماڵە دەڕۆم. خوشکی بچووك چ ڕێزێکی بۆ خوشکی گەورە هەیە، من ئەو ڕێزەم بۆ تۆ هەیە. تکایە ئاگادارم بکەوە چ بکەم بۆ ئەوەی بتوانم خزمەتی مێردەکەمان بکەم. هەرچی تۆ بڵێی ئامادەم جێبەجێی بکەم بۆ ئەوەی مێردەکەمان شادو بەختەوەر بکەم چونکە بە ڕاستی ئەمە ئەرکی سەر شانی منە. تەنیا لە ڕەزامەندیی تۆم کەمەو تکا دەکەم ڕەزامەندی خۆتم بۆ ڕەوانە بکەی بۆ ئەوەی لەو ژیانە سەختو ناخۆشە ڕزگاری بکەین. ئەم نامەیەم بە نهێنی بۆ برادەرێکی سەنگاپوورە ناردو هیوادارم تۆش هەر بە ڕێی ئەوەوە وەڵامم بدەیتەوە.

خوشکی بچووکت

مای لان...))

ئەو ناونیشانەی دابووی وەڵامی بۆ پێدا بنێرمەوە دوکانێکی بازرگانی حەریر بوو. لەو بڕوایە دام برادەرە نەناسراوەکەی ژنەکە لەو دوکانەدایە. ئەو برادەرەش پەیوەندی بە چینی نوێوە هەیە کە منی لەو وڵاتە وەدەرنا.....

حەزم دەکرد بمتوانیایە بەو پەڕی ئازایەتی بۆ (جیرالد) بنووسم، بەڵام چی بۆ بنووسم؟ ئایا بۆی بنووسم ڕازیم ژنێکی تر جێگای من بگرێتەوە؟ ئایا کەس هەیە بتوانێ جێگای من بگرێتەوە؟ نەخێر، هیچ ژنێکی ئەمریکی نەبووە وەکوو من تووشی ئەم هەڵوێستە ناخۆشە ببێ!!

ئەم زەوی‌و شینایییەی لەم شوێنە دوورەی هەرێمی ڤیرمۆنت کە کەوتۆتە ناو هەردو بەردان بۆ (جیرالد) بۆتە سنوورێکی ئەبەدی‌و

(جیرالد)یش بەش بە حاڵی ئەو زەوی‌و شینایییە، نەماوە. یان بڵێین منم ئیتر ژیانم نەماوە. نازانم بۆچی دەژیم.... من، کە کەس پێویستی بە من نییەو کەس خۆشی ناوێم!! ئاخۆ کەس هەیە منی خۆش بوێ؟ نا.... ناتوانم ئەمڕۆ وەڵامی ئەم نامەیە بدەمەوە. هەست دەکەم هەموو شتێکم لە کار کەوتووە. وام لێ هاتووە دەنگم دەرنایێ قسە بکەم، ئەقڵم ئیش ناکا بیر بکەمەوە. ئیتر، تا جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ عوشرەت‌و هاودەمیی (جیرالد)، نازانم چ بکەم‌و چ بڵێم!

وا دەچمە ژوورەکەم! ئێستا لە ژوورەوەم‌و نامەکەی (جیرالد)م لە سندووقەکەم دەرهێناوە کە توند توند قەپاتم کردبوو. هەرچەندە سوێندم خواردبوو و بەڵێنم بە خۆم دابوو، جارێکی تر ئەو نامەیە دەرنەهێنم‌و تەماشای نەکەم، بەڵام ئەوەتا دەرمهێناوەو لەبەر دەمی خۆمم داناوەو سەیری دەکەم.... وشە بە وشە دەینووسمەوە. وشەکانی نامەکە پیت بە پیت دووبارە دەکەمەوەو دەیان نووسمەوە. باوەڕ ناکەم لەمەو دوا یەك وشەی لە بیر بکەم. ئەمەیە ئەو نامەیەی لە پەکینەوە بۆم هاتووە، نامەی (جیرالد):

((هاوسەری ئازیزم.....

بەر لەوەی ئەوەت بۆ بنووسم کە دەمەوێ بۆت بنووسم، با بە ئاشکرا پێت بڵێم من لە تۆ بەولاوە هیچ کەسم خۆش ناوێ. هەرچی بکەم، لە بیر نەکەی من هەر تەنیا تۆم خۆش دەوێ. ئەگەر دوای ئەم نامەیە. نامەی تری منت بۆ نەهات، بزانە من هەموو ڕۆژێ نامەیەکت بۆ لەسەر پەڕەی دڵم دەنووسم. ویستم ئەمەت پێ‌بڵێم بەر لەوەی ئەوەت بۆ بنووسم کە ناچارم بۆت بنووسم..... من ناچارم ژنێکی چینی بێنمە ناو ماڵەوە، لەبەر ئەوە نا کە پێویستم بە یەکێکە کاروباری ماڵەوەم ڕایی

بکاو جلم بۆ بشواو چاکی بکاتەوەو ئیشی تری ماڵەوەم بۆ بکا کە خۆت دەزانی من لەم بارەیەوە دەمچەفتم، بە تایبەتی دوای ئەوەی تۆ باشترین یاریدەدەرو هەڵسووڕێنەری ئەم کارانە بووی بۆ من. مەسەلەکە هەر ئەوەندە نییەو بەس، بەڵکوو دوورترە.... دەبێ من دڵسۆزیی خۆمیان بۆ بسەلمێنم، چونکە بۆم دەرکەوتووە کاربەدەستان بەوەندە رازی نابن کە سوێندیان بۆ بخۆم دڵسۆزم، دەبێ سەرەڕای ئەمە نکووڵی لە هەموو ڕابردووی خۆم بکەم..... دەبێنەفرەت لەو خوێنە ناچینییە بکەم کە لە دەمارەکانمدا دەگەڕێ، دەبێ بە کردەوە دوژمنداریی خۆم بۆ لایەنی بێگانەی خۆم بسەلمێنم.... بۆ ئەمە بڕیارم داوە ژنێکی تر بۆ خۆم هەڵبژێرم.... ناچاریشم ئاگادارت بکەمەوە چونکە ئێمە لە ماوەی پێکەوە ژیانماندا، نموونەی دوو هاوسەری پاك‌و دڵسۆزو وەفاداربووین. ئەگەر من لای خۆمەوە، دڵسۆزیی ئەم هەسنە نەبم، بێ‌شك مانای وایە ژیانی هاوبەشی خۆمانم لە بیرکردووە کە هەرگیز لە بیری ناکەم.... هەمیشە دووبارەی دەکەمەوەو بە ڕوون‌و زوڵاڵی پێت دەڵێم....

من ناتوانم جارێکی تر نامەت بۆ بنووسم. هەر هەوڵێکی ڕا جۆرە مەترسییەکی گەورەیە بۆ من‌و بۆ کوڕەکەمان. ڕەنگە تۆ وا بزانی کوڕەکەمان مادەم لای تۆیە، ژیانی ئەمینە.... نەخێر، تا من نکووڵی لەویش‌و لە تۆیش نەکەم، کوڕەکەمان هەرگیز ئەمین نییە. ئەگەر ڕۆژێ بیستتەوە من کارێکی وام کردووە، دڵنیا بە ئیشەکەم لە دڵەوە نییە، هەر ڕوو کەشە. هیوادارم خوا تەمەنم ئەوەندە درێژ بکا ببینم ئەو ڕۆژگارە سەختە کۆتایی هاتووە..... ئەگەر سەرەڕای هەموو هەوڵێ بۆ

مانو نەمردم، هەر بمرم، لە بیرت بێ هەموو ژیانو گیانم هی تۆ بووە، ئازیزەکەم

(جیرالد)......)

کەواتە چارم ناچارە دەبێ ڕازی بم. نازانم هۆی چی بوو بە درێژایی ئەو هەموو مانگە خۆم گنخاند. دەشمزانی شتەکە دەبێ هەر بکرێ، بەڵام ئێستا کە ئەم نامەیەم لەو ژنەوە بۆ هاتو زانیم ژنەکە هێشتا نەچۆتە لای (جیرالد)، دەبێ ڕەزامەندی خۆمی بۆ بنێرم. ڕەنگە وا باشتر بێ برووسکەیەکیان بۆ بنێرم، بەڵام نا.... ئەمە مەترسییەکی گەورەیە بۆ ئەوان. تەنیا وەرگرتنی برووسکەیەك لە ئەمریکاوە هاتبێ، چینییەکان سەخڵەت دەکا، با لە کۆلۆنیایەکی بەریتانیش بێ. جا وا باشە نامەیەك بنووسمو بە بەریدی هەوایی ڕەوانەی بکەم.

ئەوەتا وا نامەکە دەنووسم. سوورم هەر دەبێ نامەکە ڕوونووس بکەم بۆ ئەوەی بزانم چیم نووسیوە. ئەگەر چارەنووس کردی منو (جیرالد) جارێکی دی یەکترمان دیتەوە، با ئەم دانەیە وەکوو بەڵگەو سەرچاودیەك بێ لامان چونکە ڕاستییەکەی من ئەم نامەیە بۆ (جیرالد) دەنووسم.... بەڵێ (جیرالد)، ئەم نامەیە بۆ تۆی ئازیزو خۆشەویست دەنووسم. ئەگەر چارەنووس وایکرد یەکتر نەبینینەوەو ئەگەر ڕۆژگار زیاتر تەنگی پێهەڵچنینو نەتتوانی بێیتەوە لامانو منیش نەمتوانی بێمەوە لای تۆ، ئەوسا جێی خۆیەتی ڕۆژێ تۆمارێکت لە بارەی خۆمەوە بۆ بنێرم. چەندم حەز دەکرد، ئاخیر ڕۆژ کە بە یەکەوە بووین، پێم گوتبای تۆیش تۆمارێك لای خۆت بکەوە. بەڵام نا.... تۆماری لای تۆ ئەمین نییە. دوور نییە یەکێ ویژدانی خزمەتکارێکت بکڕێ، بەڵام

ئێرە، ئەم دۆڵە هێمن‌و ناسکەمان هیچ سیخوڕو زماندزی تێدا نییە....
بە ڕاستی، لەو باوەڕە دام.....

ئێستا نامەکە بۆ (مای لان) دەنووسم. ناوی بنەماڵەکەی خۆی نەداوە. (مای لان) ناوێکی گشتی‌و هاوبەشە لە نێوان زۆر کەس. یەك کەسی دیاری کراو ناگەیەنێ. بە هەر حاڵ، ئەمە ئەوەندە گرنگ نییە:
(خوشکی بچووك‌و ئازیزم......

نامەکەتم پێگەیشت‌و خوێندمەوە. لاریم نییە بۆ ئەو کارەی داوای ڕوخسەتت لە من کردبوو. تۆ جێگای من ناگریتەوە، چونکە هەر ژنەو جێگای خۆی لە ژیانی مێردیدا هەیە. تۆ دەتوانی بچیتە ماڵەکەی‌و بۆ خۆت بیکەیتە ئەو داڵدەیەی بۆت دەگونجێ. لێرە، لە وڵاتی ئێمە، کەس بەو مەسەلەیە نازانێ.... کەسی وا نییە لە حاڵەتی وا بگاو بۆی قووت بچێ. زۆر ڕاستە کە لە نامەکەتدا نووسیبووت تەنیایەو کەس نییە خزمەتی بکا.... تێدەگەم! بەڵام هەر چەندەی تێشت بگەم هەست دەکەم دڵم لەگەڵ ئەو مەسەلەیە تێك هەڵدەچێ. چی لە دەستت دێ تەخسیری مەکە بۆ خزمەت کردنی، چونکە خۆشم دەوێ.

(ئیلیزابێت.)

خۆم نامەکەم بردە بەریدو بە دەستی خۆم خستمە ناو سندووقەکەی ژێر پەنجەرە، بەڵام (مس میرا) – سەرۆکی نووسینگەی بەرید – چاوی لێ بوو. (مس میرا) کچێکی ناسك‌و بێپێچ‌و پەنایە. شووی نەکردووە، بۆیە مەراقی هەر شتێکە پەیوەندی بە زەماوەندەوە هەبێ، بە تایبەتی دەرهەق حاڵەتی من!

– ئەو نامەیە بۆ مێردەکەتە؟

زۆر بە شادو خەندانی ئەم پرسیارەی لێکردم. دوو گۆنای سووری کاڵو دەمێکی بچووكو دوو لێوی قەنەفلیو دوو چاوی خڕو شینی بێ برۆی هەبوو. قژی زەردو بە گلوازە بوو.

– نەخێر بۆ مێردەکەم نییە.

نامەکەی وەرگرتو ناونیشانی سەر زەرفەکەی خوێندەوەو گوتی:

– بۆ دەرەوەیە؟ بۆ چینە، وا نییە؟

– نەخێر، بۆ سەنگاپوورەیە کە کۆلۆنییەکی بەریتانییە.

– وامدەزانی بەریتانیا هیچ کۆلۆنی لەوێ نەماوە.

– هیندییان دایەوە خاوەنی خۆی، دایانەوە هیندییەکان بەڵام هونگ کۆنگو سەنگاپوورەیان لە ژێر سەرپەرشتی خۆیان هێشتەوە.

– بە ڕاست؟

– بە جۆرێ تەماشای کردم وەك ئەوەی بڕوا بە قسەکەم نەکا.

نەدەبوایە لەوە زیاتر بڵێم کە گوتم. ئەوەی پێویست بوو، جێبەجێم کردو گەڕامەوە ماڵێ. دیم (بابا) هێشتا لەناو جێ هەڵنەستاوە. ئێستا ڕۆژگاری (بابا) لە نیوەڕۆ دەست پێدەکاو لەگەڵ ڕۆژهەڵات کۆتایی دێ.... بە شلو خاوی ڕاکشاوە. نە تۆ هیچ لەو دەگەیتو نە ئەو هیچ لە تۆ دەگا. وەکوو جارەکانی دی، داوای نەکرد لەناو جێ بیهێنمە دەرەوە. جلەکانی کردە بەرو لەسەر سفرە دانیشت، چونکە بۆ خواردن نەدەهاتە نهۆمی خوارەوە. پاش خواردن، پیاڵە چایەکی خواردەوە. لەناکاو هۆشو بیری کرایەوە. ڕەنگە هاتنی (رینی)، یادەوەری بزواندبێو بیرەوەری وروژاندبێ. پرسیاری لێکردم:

– ئایا دوێنێ کەس هاتە ئەم ژوورە؟

– بەڵێ، (رینی) هات.

- (رینی)؟ .... (رینی) کێیە؟

- نەوەی خۆتە، (بابا).

لەسەری نەڕۆیشت. لە بیرکردنەوەدا نقووم بوو. دوای نیو سەعات، کە خەریك بووم ژوورەکەم ڕێك دەخست، دەستی بە قسە کرد. دەنگی زۆر ڕوون و زولاڵ بوو. گوتی:

- وام زانی (ئای لان)ە!

ویستم بە دەم پاك کردنەوەی مێزی بەردەمی، گاڵتەی لەگەڵ بکەم، وەلامم دایەوە:

- شتی وا چۆن دەبێ؟ (ئای لان) ژنەو (رینی) نەوجەوانە.

وەلامی دامەوە:

- دەتگوت پیاوە. جلی پیاوانی لەبەر بوو. شینێکی تۆخ بوو. چاکەت و پانتۆڵ بوو. وەکوو جلی پیاوان وا بوو. کە بەم جلە بینیم، لێی ترسام.

بە ڕاستی خانمێك دیمەنی وا بێ، ترسناکە. کەواتە (رینی) زۆر لە داپیرەی چینی دەکا، یانی لە (جیرالد) دەکاو (جیرالد)یش لە دایکی دەکا، بەلام لە (پەکین) دەیانگوت (جیرالد) لە باوکی دەکا. بازنەکە بەم جۆرە دەخولێتەوە. هەر لایەك دەبینێ لاکەی تر چی هەیەو هەر لایەکیش ڕەت دەکاتەوە دان بەوەدا بنێ کە نییەتی.

- (ئای لان) کوژرا.

(بابێ) وای گوت. دیار بوو دڵی لەگەڵ دەگوشرا. دیم دەموچاوی تێکچوو. ڕووی لۆچی تێکەوت و فرمێسکی لەچاو هاتە خوارێ.

- ئەوە دەمێکە!! ماوەیەکی زۆری بە سەردا چووە.

- بەلام من پێم وا نییە. من وا دەزانم ئەوپەڕی یەك دوو ساڵە شتەکە ڕووی داوە. گۆڕەکەی هێشتا تەڕە.

لە قسەکردن وەستا و لە پڕ لێی پرسیم:

- ئەریَ گۆڕەکەی لە کوێیە؟

خەریك بوو، ئێستا پاش ئەو هەموو ساڵە، بۆ ژنەکەی بگری.

- (بابا)، خۆشت دەویست؟

بەر لەوەی وەڵامم بداتەوە، نەختێ ڕاوەستا. کە دەستی بە قسە کرد، هۆشی لای خۆی بوو.

- نەمتوانی زۆر لە خۆم بکەم خۆشم بویَ. زۆرم هەوڵ دا خۆشم بویَ چونکە ئینجیل زۆر جەخت دەکاتەوە پیاو دەبێ زۆر هۆگری ژنەکەی بێ، بەڵام ڕێگای ئەو هۆگرییەت بۆ ڕوون ناکاتەوە. زانیم نەمتوانیوە خۆشم بویَ.

ویستم دڵی بدەمەوە، گوتم:

- بەڵام کوڕێکی لە تۆ بووە.

- بەڵێ، دەیزانی، زۆر باش دەیزانی دووگیانە! ئەو بەیانییەی کوڕەکە لە دایك بوو، ساتێکی ئاسایی ژیان نەبوو، سەعات (دە)ی سبەینەی ڕۆژێکی پاك‌و بێگەردی بەهار بوو. دختۆر ڕێگای دام‌و چوومە ژوورەکەی، دیم ڕاکشاوەو کوڕەکەی لەسەر باوەش خەوتووە. هەڵیدایێ گوتی:

- کوڕێکت بووە!

نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە. منداڵەکە قژی ڕەش بوو. لێی ترسام. بیرم کردەوە منداڵێکی چینیم بووە. خۆم بۆ ئەم زەبرە ئامادە نەکردبوو.

ویستم پیَبکەنم، گوتم:

- (بابا)، دایکی چینییە.... ژنەکەت چینی بوو!

بە داخ‌و کەسەرەوە سەری بادا و گوتی:

- من ئامادەی شتی وا نەبووم.

مەبەستی ئەوە بوو، بە تەما نەبوو منداڵی لەو ژنە ببێ. ئەو بۆ منداڵبوون زەماوەندی لەگەڵ دایکی (جیرالد) نەکردبوو. ئارەزووی نەدەکرد (جیرالد)ی ببێ.... (جیرالد) بەم مەسەلەیە سەخڵەت دەبوو. دەتگوت خەنجەرەو لە دەندی دەچێتە خوارێو لەسەر دڵی دەچەقێ. برینەکەی قەت سارێژ نەدەبوو. ئەو خەنجەرەو ئەو برینە قووڵە بوو لێ نەگەڕا (جیرالد) لەگەڵما بێتە ولاتەکەم. بەڵام ئەوەتا لە بەردەمم وەستاوە، زۆر بە ڕوونو ڕەوانی دەیبینمو هەستی پێدەکەمو دەستی لێ دەدەم. ئەوەتا برینەکەی لە کەسێتی (رینی)دا دەکولێتەوە کە لەگەڵ مندایە. ئای ئەم برینە برینێکی چەند قووڵو بە ئازێشە! ئای چۆن تەشەنەی کردووە! ئەم برینە، یەك یەك لە دڵی نەوەکانی دادێ دەکولێتەوەو هیوای سارێژبوونی نییە، تەنیا ئەگەر خۆشەویستی لە یەکێكو لە شوێنێکدا سەر هەڵبدا.

(بابا) دووبارە دەستی بە گریان کردەوە. بۆ ئەوەی گریانەکەی لە بیر بەرمەوە، لێم پرسی:

- (بابا)، (سام بیلن)ت لە بیرە؟

لە بۆچوونەکەم سەرکەوتم. (بابا) وازی لە گریان هێنا. بە دڕدۆنگی پرسیاری لێکردم:

- من دەیناسم؟

- تۆ لە (کنساس) لە خانووە بچووکەکەی ئەودا بووی.

- من شتی وام کردووە؟

- بەڵێ، بۆیە پێت دەڵێم چونکە (رینی) چۆتە لای ئەو. لەوێ دەژیو لە باخو لە شینایی ئەو ئیش دەکا. (سام بلین)، لە کاتی جەنگ لە چین

بوو. ولاتی چین‌و گەلی چینی خۆش دەویّ. لەویّ باشترین مامەڵەیان لەگەڵ کردبوو. هەر بۆیەش، کاتیّ تۆ لەناو شەمەندەفەر نەخۆش کەوتی‌و لەویّ دایانبەزاندی، ئەو خزمەتەی کردی. (سام بلین) بوو بە هاناتەوە هات‌و وەری گرتیتەوە. بەلام شتەکە چۆن بوو؟ ڕۆژیّ دیّ پیّدەکەوم! ئەوە بوو پاشان بوو بە برادەری تۆو ئیّستا برادەری (رینی)یە.

(بابا) ئەو شتانەی هیچ لە بیر نەمابوو، بەلام بە هەر حاڵ وازی لە گریان هیّنا. کورسییەکەم بۆ بردە بەر پەنجەرە. حەزی دەکرد لەویّ دابنیشیّ. بە هیّمنی سەیری دۆڵ‌و گردەکانی بەرامبەری بکاو تەماشای ئەو مەڕو مالاتە بکا، کە لە قەد چیا دەلەوەڕان.

– هەر ئیّستا دەگەڕیّمەوە لات.

چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی ئیشی ماڵەوە بکەم.

ئەمشەو، کاتیّ (بابا) لەناو جیّ، خۆی بۆ نووستن ئامادە دەکرد، لەپڕ (سام بلین)ی بیر کەوتەوە. زۆر شتی بیر کەوتەوە. چووم سلاوم لیّکرد. کە ویستم بیّمە دەرەوە، لە ناکاو، لە بارەی (سام بلین)ەوە دەستی بە قسە کرد:

– بەلّیّ؟

– (سام بلین) تەمەنی دوازدە ساڵە. ژنی نەهیّناوە. باوکی هەزار دۆنم زەوی هەرە چاکی هەبوو. مەڕوومالاتیان بەخیّو دەکرد. سەرەڕای ئەوە، دوکانیشیان لە (نیفادا) هەبوو. کە ژنەکەی مرد، منداڵەکەیان دوازدە سالانە بوو. ئەو منداڵە (سام بلین) بوو و لەو منداڵە پیّوە، منداڵی تریان نەبوو.

– (بابا) چۆن ئەمەت هەموو بیر کەوتەوە؟.....

گەڕامەوەو دانیشتم. گوێم لە (بابا) گرت، چیرۆکی خۆی تەواو کرد، باسی کرد: چۆن بە نەخۆشی تاداری لە شەمەندەفەر دایانبەزاندو داوایان لێکرد لە ئێستگەی شەمەندەفەر چاوەڕێ بکا. (سام بلین) هاتە ئیستکە، هەندێ شتی بۆ هاتبوو، هاتبوو وەریان بگرێ. لە باتی شتەکانی خۆی، (بابا)ی هەڵگرتو بردییەوە ماڵی خۆیو لەناو نوێنی نا.

– تووشی گرانەتا هاتبووم. نەخۆشییەکەم گران بوو. (سام بلین) بردمییە ئەو کووخەو هەر لەگەڵمدا بوو.

چیرۆکەکەی بە سەرو بەری بۆ گێڕامەوە.

شەو، کە هۆشی هاتەوە بەر، خۆیشی نەیزانی لە کوێیە. (سام بلین) لە تەنیشتی دانیشتبوو. باسی چینی بۆ کرد. باسی گوندو ریی لادێکانی بۆ کرد. باسی بولبولی بۆ کرد کە ڕۆژی خۆش لەگەڵ گەردو گوڵی بەیانی، لە چریکەی گۆرانی دەدا. پێی گوت ئەویش لە ماوەی جەنگ لە چین بووە، بەڵام باسی جەنگو نەهامەتی جەنگی بۆ نەکرد. تەنیا باسی شتی جوانو هێمنی بۆ کرد: باسی ئەو خێزانانەی شەو لەبەر دەرگای حەوشە دادەنیشن، باسی ئەو پیاوانەی زەوییان دەکێڵن، باسی ئەو ژنانەی بۆ کوڵو قەسارێ دەچنە دەم جۆگا.

(بابا) ئەو هەموو شتەی بۆ گێڕامەوە. لەپڕ حەپەساو نیگەرانی ڕایتەکاند. سەرنجی پەشۆکاو چاوی شەکەتباری تێبریم. دەموچاوی، لە بەرچاوم، وەکوو دەموچاوی منداڵێ بوو ئەوەندە ڕۆیشتبێ لە هۆرو دۆر چووبێ. ئینجا لێی پرسیم:

– ئەو وڵاتەی کاتی خۆی لێی دەژیاین لە کوێیە؟

- لە کوێ بوو، هەر لەوێیە. لەو دیو دەریاکانە. (جیرالد) ئێستایش لەوێیە.

- ئەی ئێمە بۆچی لێرەین؟

ڕاست دەکا، بۆچی لێرەین؟ وەختە دڵم شەق بەرێ. دڵم لەناو سنگم دەگوشرێ. سەرم لەسەر سنگی تێك شکاوی دانا.

- ئێستا نۆرەی تۆیە بگری.

ئەمەی گوت و لە جێی خۆی نەجوولایەوە. چۆن ڕاکشابوو هەر وا مایەوە. چاوەڕێی کرد سەرم لەسەر سنگی قیت کەمەوە، بەڵام ئەو گەرمییەم لە سنگی نەدی کە دەمەویست. تەنیا ئەوەند بوو سەبرم پێ دەهات. لە گریان وەستام. سەرم بڵند کردو پێم گوت:

- کاتی نووستنت هاتووە.

- تۆیش دەخەوی؟

- بەڵێ، منیش دەخەوم، چ زوو، چ درەنگ!

وام پێگوت و لێفەکەم لە شانی لوول داو لە ژوورەکەی چوومە دەرەوە.

* * *

# (٢٥)

...ئای لە کپیو بێدەنگیی شەو لەم دۆڵە چۆڵو هۆڵەدا!! ئای لە تەنیاییەکی چەند سەختو ناخۆشدا دەژیم!! ئەوەندەی چاو بە دەردۆری خۆمدا دەگێڕم، لە خۆمو لە تەنیایی خۆم زیاتر هیچ شتێ نابینم! وەك ئەوەی گۆشەیەکی لاچەپم لە هەسارەیەك لەو هەسارانەی پەیوەندییان بە کەسەوە نییەو کەسیش پەیوەندی بەوانەوە نییە، بۆ خۆم دابڕاندبێ. تا چاو بڕ دەکا، ئاگرێك لێرەو ئاگرێك لەوێ لەبەردەممدا دەبینم. هەر ئاگرەو هی ماڵێکە. ماڵەکە دایبابێكو دوو سێ منداڵی لە خۆگرتووە. واتە: ئەمانە یەك ژیان کۆیان دەکاتەوەو یەك ژیان دەیانگرێتە خۆی. مانای تەنیایی سەختو گران نازانن. لەو سەری ئەم دۆڵەیش، تاکە تیشکێك لەسەر دەرگای نۆڕینگەی دختۆر (بروس سبولدن) دەدرەوشێتەوە. لێرەو لەوێش، بریسکەی پچڕپچڕ لە ماڵی گەشتیارەکانی هاوینەوە دێ. ئەم ئاگرانە هەموویان.... ئەم ئاگرانە، بە هەموو جیاوازییەکیانەوە، هیچێکیان بۆ من ناسووتێ. هەندێجار چرا لە ماڵە چۆڵو هۆڵەکەم دادەگیرسێنم بۆ ئەوەی ڕێبواری

بیانی وا بزانن ماڵی منیش ئاوەدانەو پڕیەتی لە میوان. ئەگەرچی من بەشم لە شتی وادا نییە!

ئەو شەوە، کە دڵم لە تەنیایی دەگوشرا، چوومە سەلال و سندووقی نامەکانم کردەوە. چی نامەی تێدابوو هەموویم دەرهێنا و بە پێی ڕۆژی هاتنیان ڕیزم کردن. نامەکان کەم بوون. بێجگە لە دوا نامە، لە دوازدە نامە زیاتر نەبوون. یەکەم نامە، ماوەیەکی کەم دوای ڕۆیشتنمان لە (شانگهای) نووسرابوو. ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە ئایا ڕاست بوو (شانگهای)مان جێهێشت و ڕۆیشتین؟ بەڵام چارمان ناچاربوو! (ئەو) خۆی، لەبەر ئەو هۆیانەی لای کۆببووەوە، داوای لێکردم ئەوێ جێبێڵم. هێشتا بە قەد ئێستا نەدەترسا. ئەو کاتە شادو گەشبین بوو بەرامبەر نیزامی فەرمانڕەوایی نوێ کە دامەزرێنەرەکانی قسەی گەورەیان دەکردو قسەکانیان باش دەڕازاندەوە، بۆیە چاوەڕێی هیچ خراپەو زەرەرێکمان لەو گۆڕانکارییە نەدەکرد. سەرەڕای ئەوەی کە (بیلوفسکی)ی پیری ڕووسی سپی، بەڕێوبەری ئوتێلەکەمان، دەیگوت:

– ئەمانە خەڵکانێکن جێی بڕوانین!

جەنابی (بیلوفسکی) بە ئاشکرا وایدەگوت. سمێڵی ڕەشی بۆیەکراوی بادەداو وایدەگوت. جەنابی (بیلوفسکی) تەمەنی لە حەفتا ساڵی بواردبوو:

(ئەم جۆرە شۆڕشگێڕانە هەرگیز جێگەی متمانە نین..... هەرگیز لە هیچ شوێنێکی دونیادا!! لە ڕووسیایش ئاوهابوون. زۆر بەڵێنیان دا، پاشان خۆیان دەستیان بەسەر هەموو شتێ داگرت. پێشتریش لە فرەنسا هەروا بوون. پاشاو شاژنەکانیان کوشت، کەچی ڕەفتاریان لەگەڵ

خەڵكو لە بەینی خۆیانەوە، لە ڕەفتاری ئەوانە خراپتر بوو کە لە سەریان دان.)

(جیرالد) هەموو جارێ گفتوگۆی لەگەڵ دەکردو دەیگوت:

- ئێمە بە هیچ جۆرێ ناتوانین، بەو شێوە ژیانەی دوای جەنگ، لە ژیانی خۆمان بەردەوام بین. بارودۆخی خەڵك خراپە، هەڵاوسانی ئابووری تەشەنەی کردووەو هیچ هەوڵێك بۆ چاك کردنی نەدراوە.

- ڕۆژێ دێو دەزانی هیچ نەکردن لەم بارودۆخەدا لەوە باشترە کە شتێکی خراپو سەقەت جێگای بگرێتەوە.

جەنابی (بیلۆفسکی)، کاتێ وایدەگوت جۆشی دەگرتو (جیرالد) بە خەندەیەکی هێمن وەری دەگرت. بڕوای بە قسەی خۆی هەبوو خۆی لە پیلەکەی بێهوودە دوور دەخستەوە. ئەمە دەق نموونەیەکی فیزو بوغرایی چینییەکانە. من هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە کە (جیرالد) چینییە. خوێنی چینی لە دەماردایە کە خۆیان لە هەموو نەتەوەیەك بە جیا دەزانن. بڕوایان وایە ئەوان لە هەموو گەلانی دونیا ژیرترو تێگەیشتووترن. ڕەنگە ئەمە لە هەندێ لاوە ڕاست بێ.

نامەی یەکەمی (جیرالد) شادیو خۆشی لێ دەتکێ:

(هەموو شتێ ئاساییە. بۆم دەرکەوتووە تۆ بەلاش لە چین ڕۆیشتی. (رینی)، دەیتوانی بۆ خۆی، لێرە، لە (پەکین) بخوێنێ. نازانم چۆن وا بە ئاسانی ترس پشتی لێ سەندین. من لەو بڕوایەدام وڵاتەکەم ڕوو لە سەردەمێکی نوێیە.)

بەڵێ، (وڵاتەکەم)، نەك (وڵاتەکەمان)! ئێستا بۆم دەرکەوت یەکەم شت چ بوو لە منی دوور خستەوە. ئەو نیشتیمانی خۆی بۆ خۆی

هەڵبژاردبوو، یان ئەگەر پێویست بکا، بە نیشتمانی خۆی هەڵیدەبژێرێ.

لە پێنج نامەی یەکەمدا هەر بەو جۆرە بوو، هیواو ئاواتێکی زۆری هەبوو. ئینجا یەکەم سەرەداوی گومانی لێ دەرکەوت.

((هاوسەرەکەم،

وا باشترە ساڵێك، شتێکی وا، لێرە دوور بی. حکرومەتی تازە، بۆ ئەوەی ئامانجەکانی بێنێتە دی، هەموو ئاستەنگێك لەسەر ڕێی خۆی لادەبا. (لیوشین)ی بازرگانی حەریرت لە بیرە؟ لە بیرتە چەند نەرمو ناسك بوو؟ دەرکەوتووە یەکێ بووە لە خاینەکانو لەگەڵ یازدە کەسی تر، کە دوانیان ژن بوون، لەسەر پردی (مارکۆ پۆلۆ) گوللەبارانیان کردن. هەندێ کەس ژیانی لەگەڵ ئەم نیزامە نوێیەدا نییە. هەقیانە، ئەمە ڕاستییەکەو نکووڵی لێ ناکرێ. بەڵام چ دەکەی ئەوە نیزامێکە هەیەو خۆی چەسپاندووە. لەسەرمانە پێی ڕازی بینو قبووڵی بکەین. لە بەدبەختی منەوە، وەزیری پەروەردەو فێرکردن پیاوێکە خوێندەوارییەکی زۆری نییە. دەبێ من جێگای بگرمەوە.))

دوای ئەوە شتێکی نووسیبووو سڕی بوویەوە. مانای وایە ڕادەربڕین بە ڕوونو ڕەوانی پەسند نییەو گێچەڵی بە دواوەیە.

دوای ئەوە، (جیرالد) هیچ شتی وای نەنووسی بوو بایەخێکی تایبەتی هەبێ. باسی کردبوو چۆن گوڵە شانتونگ لە حەوشەی ڕۆژهەڵاتیماڵەوە پشکووتوون:

((هاوسەری ئازیزم، ئەم ساڵ، شکۆفەکردنی گوڵ دواکەوت. خۆڵبارانو زیخبارانێکی وا بوو، شتی وام نەدیوە. هەرچەندە هەوڵم دا ئاوی ناو حەوزەکەمان بە پاکی ڕابگرم، چی ماسی لە فیسقەکەدا

هەبوو، هەموو مردن. باخەوانەکە ماوەی مانگێکە بۆ سەردانی دایبابی چۆتە شارێکی تر. کەسم پێپەیدا نەبوو جێگەی بگرێتەوە. خەڵك ئیش ناکەن...))

دیسان، دوای ئەوە شتێکی نووسیوەو سڕیویەتەوە. چۆن بڕوا بکەم؟ خەڵك بۆچی حەز لە ئیش ناکەن؟ جگە لەوەیش (جیراڵد) هیچ باسی نامەکانی منی نەکردووە کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەمنووسیو حەفتەی جارێك بۆم دەنارد.

نامەی هەشتەم زۆر کورت بوو:

((هاوسەری ئازیزم، لێرە ژیانو ڕۆژگارم بە یەك شێوە دەڕوا. ئەمڕۆ خشتەی کارم ئامادە کرد. خەریکی پەیداکردنی مامۆستام بۆ شەش مانگی دادێ. بەڕێوبەری تازە گەنجێکی زیرەکە. زۆر ڕاو بۆچوونی هەیە. بەڕێوبەری کچانیش یەکێکە لە قوتابییەکانی خۆم. بە گەنجی ئاواتی زۆری هەبوو. بە (رینی) بڵێ ئەندازیاریی بخوێنێ. ئەندازیاریی لە پیشەی مامۆستایەتی باشترە..... ئەم شەو، دونیا گەرمە. هیچ بای نایێ. هاوینێکی دوورو درێژم لە پێشە، بە تەنیایی بە سەری دەبەم.))

نامەی نۆیەم نامەیەکی بێهێز بوو. هیچ شتی تێدا نەبوو جێگای بایەخ بێ.... قۆناغی یەکەم تەواو بوو. ئێستا هەست بە ماندووبوون دەکا. ئەمەم بەلاوە زۆر ئاشکرایەو چاك هەست بە حاڵەتی دەکەم. هەموو جارێ دەچووینە گەشتو گەڕان بۆ ئەوەی بێزاریی ژیانی یەکنەوا لە خۆمان بتەکێنین. دەچووینە (بیتاهیو) لە سەر دەریا، یان دەچووینە چیاکانی ئەڵماس لە کووریا. ساڵێ لە ساڵانیش گەشتەکەمان بردە (تای شان)و یەك مانگ لە ئابیدەیەکی بوورزییەکان ڕامانبوارد. نازانم داخۆ (رینی) ئەو گەشتەی لە بیرە، یان نا؟ کاهینێکی

پیری لێ بوو ببووە برادەری (رینی). بە پشیلەیەکی بچکۆڵەی حەریر فێری یاری پشیلانەی دەکرد.

سێ مانگی پێچوو تا نامەی دەیەمینم بۆ هات. ئەو نامەیە قەت عەشتەبای تێدا نەبوو. کە خوێندمەوە، گریام. ئێستایش، کە دەیخوێنمەوە، گریانم دێ. لە نامەکەوە، تێگەیشتم ئەو کەسەی خۆشم دەوێ بە ناچاری خۆی بە دەستەوە داوەو ناچارە بەرگەی شتێ بگرێ کە تێی ناگاو بۆی قووت ناچێ.

((.... بیر دەکەمەوە ئاخۆ ئیشێکی چاكو ئاقڵانەم کرد کە خۆم لە ئێوە بە پاش داو لەگەڵتان نەهاتمە ئەمریکا! تازە باس کردنی شتی وا بەسەر چوو... گریمان ئێوەم نەدیتەوە....))

دوای ئەوە هەندێ وشەی نووسی بوو و سڕی بوویەوە.

نامەی یازدەم، نامەیەکی یەك لاکەرەوە بوو:

((خۆشەویستی ئازیزم،

وا چاکە بیر لە بە یەك گەیشتنەوە نەکەینەوە...... وا باشە چۆنمان لە چارە نووسراوە بەو جۆرە بژین..... تۆ لەو سەری دونیا کە خەڵکی ئەوێیتو منیش لێرە، لەم سەرەی دونیا. با (رینی) ببێ بە هاوڵاتییەکی ئەمریکی. کەشێکی وای بۆ بڕەخسێنە خۆی بڕیار بدا کام وڵات بە نیشتمانی خۆی هەڵدەبژێرێ. ئەگەر بارودۆخ ناچاری کرد باوکی لە بیر بکا، با لە بیری بکا.....))

زەحمەت نەبوو بەم هەموو شتە، لە وردو درشتی چیرۆکەکە بگەم. تێگەیشتم ئێستا بەندییەکەو هیچی تر. ئەو شارەی تێیدا دەژی لێی بۆتە بەندیخانە. ئیتر ئازاد نییە. منیش لەبەر ئەوەی ئەوم خۆش دەوێ، لەمەودوا ئازاد نیم. تا ئەویش مابێ، هەروا دەبم. حەز دەکەم ژنێکی

تری لەگەڵدا بێ، با خۆیشم نەبم.... ئەوەندە بەسە ئەو یەکێکی لەگەڵدا بێ. مادەم وایە، بۆچی بگریم؟

لەگەڵ ئەوەشدا لە گریان بەردەوام بووم.

* * *

# (٢٦)

...ئەمڕۆ بەیانی، کە (بابا) بوورایەوە، زەندقم چوو!! وەکوو جاران لەناو جێ هاتە دەرێو تێشتێکی سووکی خوارد: ئاوی پرتەقاڵو نانو نەختێ شیری گەرم. وەکوو هەموو جارێ سوپاسی کردمو لە پڕ دیم لەسەر کورسییەکەی بەربووەوە. خێرا (مات)م نارد دختۆر (بروس سبودن) بێنێ. لە تەنیشت کورسییەکەی دانیشتم، نەدەوێرام لە شوێنی خۆی بیجوولێنم. نەمدەزانی چ بکەم. باشە ئەگەر دختۆر بۆ سەردانی ڕۆژانەی دەرچووبێو نەزانین لە کوێیە، چ بکەین؟ خودا کردی گومانەکەم ڕاست دەرنەچوو. دیم بە ڕاکردن بەڕێوە بوو بەرەو ماڵمان دەهات. بێقاپووتو بێ کڵاو، تەنیا جانتای بە دەستەوە بوو. هاتە ماڵەوەو بە قەڵەمباز بە سەر پلیکانە کەوت. بە سەنگینی لێمان بە ژوورێ کەوت. نەخۆشەکەی نەبێ، کە بۆ دیتنی هاتبوو، چاوی کەسی نەدەدی. پێم باش بوو تا خۆی قسەم لەگەڵ نەکا، قسە نەکەم. بەبێ دەنگی، وەستامو چاوەڕێی فەرمانەکانم کرد.

– کراسەکەی لەبەرکەوە!

یەکسەر کراسەکەم لەبەرکردەوە. دختۆر (بروس) زۆر بە خێرایی دەرزییەکی لە بازووی (بابا) دا. بە ئەسپایی دەرزییەکەی دەرهێناو باوەشی بە (بابا)دا کردو بڵندی کرد لەناو نوێنی خۆی دانا.

دختۆر پێی گوتم:

– شتێکی پێ دادە بۆ ئەوەی باش گەرم بێتەوە. لەوە زیاترم نییە بۆی بکەم.

بەسەر ئەم ئازارەدا زاڵ دەبێ، بەڵام مەرج نییە هەموو جارێك! بۆیە ئەگەر شتی وا دووبارە بووەوە، نابێ خۆت سەخڵەت بکەی. ئەگەر ڕۆژی تەواو بووبێ، کەس هیچی پێناکرێ. تەنانەت، ئەگەر لە کاتی ژان گرتندا من خۆیشم لە تەنیشتی بم، هیچم پێناکرێ. هەر ئەوەندەم پێدەکرێ وەکو ئەمڕۆ دەرزییەکی لێ بدەم. ئەمەش تەنیا بە جێهێنانی ئەرکی سەرشانەو هیچی تر.

– لای دەبم تا بە هۆش خۆی دێتەوە.

پێویست بە شتی وا ناکا. دەتوانی خەریکی ئیش‌وکاری خۆت بی. ئەوەندە هەیە جارجار سەرێکی لێ بدە بۆ ئەوەی لە حاڵەتی دڵنیا بی.

دختۆ جانتاکەی پێچایەوەو منیش شتێکم بە (بابا) دادا بۆ ئەوەی نوێنەکەی گەرم بێ. دونیا، لە چاو ڕۆژان، گەرم بوو، بەڵام (بابا) لەشی گەرم نەبوو. دەق وەکوو یەکێ تازە مردبێ وا بوو، بەڵام هەناسەی دەهات‌و دەچوو. کارەکەمم تەواو کرد. (بروس) تەماشای کردمو پێی گوتم:

– با بچینە خوارێ.

کەوتمە شوێنیەوە. وامزانی دەچێتە دەرەوە بەڵام لەسەر کورسی ناو هۆڵو لە تەنیشت سەعاتە گەورەکە دانیشت. بە شێوازی کورتو چڕی خۆی گوتی:

– ڕەنگە ئێستا کاتێکی لەبار بێ بۆ ئەوەی قسەی دڵی خۆمت بۆ بکەم. بەڵام ئەگەر پیاو شتێکی لە دڵدا بێو بیەوێ دەری ببڕی، باوەڕ ناکەم، کاتی لەبارو کاتی نالەبار هەبێ.... ئیلیزابێت، ئایا بە مێردی خۆتم قبووڵ دەکەی؟

یەکەم جار وامزانی گاڵتە دەکا، بەڵام کە تەماشای ناوچاوم کرد، دڵنیابووم قسەکەی ئی دڵییە. پێمگوت:

– من شووم کردووەو شوکر مێردم ماوە.

– نەمدەزانی، چونکە قەت نەمدیوە.

– ناتوانێ بێتە ئێرە چونکە لە پەکینە، لە چینە!

– کەواتە لە ڕیزی مردووانە.

– بۆ من زیندووە.

(بروس) لەسەر کورسیەکەی هەستاو دەستی دایە جانتاکەیو ڕووی کردە دەرگا. لەوێ ڕاوەستاو ئاوڕی دایەوەو سەرنجێکی لە من دا. من لەسەر پایەی یەکەم بووم. بە دوو چاوی کاڵ تەماشای کردمو گوتی:

– با وا بێ، ئیلیزابێت! بەڵام خۆت دەزانی دونیا دەوران دەورانە، نە سەری دیارەو نە بن. دونیا لەسەر یەك بار نامێنێ. بۆیە تکا دەکەم ئەم داوایەم بە کراوەیی لای خۆت بێڵەوە.

– خۆزگە ئەو داوایەت لێ نەکردبام! هەمیشە کە چاوم بە تۆ دەکەوێ (ئەو)م بیر دەکەوێتەوە، منیش ئەوم دەوێو ئەوم مەبەستە.

لەپڕ سیمای دەمو چاوی گۆڕا. دەموچاوێکی ترم لەبەردەم خۆمدا بینی. دەموچاوێ بوو شادی لێ دەباری. ئیتر لە دەرگاوە بۆی دەرچوو. منیش لە کوێ بووم، لە جێی خۆم وەستام. هەستێکی سەیرم لاپەیدا بوو. خۆشەویستی نەبوو، نا.... ئەو هەستە نەبوو بەڵام ئەو هەستە بوو کە شادیو گەرمی لە دەروونی ئافرەت دەوروژێنێ. ئەوە دووەمین پیاوە داوام لێ دەکا شووی پێبکەم. ڕاستت دەوێ، لە دڵەوە بڕوام وایە ئەمە یەکەم جارە ئەو داوایەم بە مانای دروستی خۆی لێ دەکرێ، چونکە کاتی خۆی کە (جیرالد) داوای لێکردم شووی پێبکەم. ڕاڕابوو، بڕوای بە خۆی نەبوو. لە دڵەوە هەستی دەکرد بۆی هەیە داواکەی غەدری تێدا بێ بۆ من، چونکە وەکوو خۆی گوتەنی، لە دڵەوە وای بۆ دەچوو جۆرە پیاوێکی تایبەتییە، لە دوو ڕەگەزی جیا کەوتۆتەوە، هەر یەکە لە سەرێکی ئەم دونیایەیەو لە بەینی هەردووکیان بزر بووە. هیچ ڕەگەزو سەقامگەیەك بە هی خۆی نازانێ. منیش بەرامبەر بەو ڕاڕاییەی ئەو، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ داواکەم لێ دەرهێنا.

بە هەر حاڵ ناتوانم بەرامبەر بە داوای دختۆر (بروس) هیچ بکەم. قەت بە خەیاڵمدا نەدەهات (بروس) دڵداری بکا، یان بکەوێتە داوی خۆشەویستی یەکێکی وەکوو من. دەزانم (بروس) منداڵی خۆش دەوێ. ئەمە ڕاستە. ڕووکاری سەنگینی تەنیا بەرامبەر منداڵان نەرم دەبێتەوەو بەناسکی دەردەکەوێ. ئەم پیاوە حەز لە کپیو بێدەنگیی دەکا. منیش حەز دەکەم بە تەنیا بژیم، نەك لەگەڵ ئەم جۆرە پیاوەدا. ئێستا خەریکە لە تەنیایی خۆم ڕادێم. لەسەرسامیی خۆمەوە، دەرگام بە کراوەیی جێهێشت. ڕووم کردە لای (بابا)و دیم هێشتا هەر بووراوەتەوە.

* * *

# (٢٧)

ئەمڕۆ، پۆستەچی نامەیەکی بۆ هێنام پوولی کۆماری میللی چینی لەسەر بوو. بە شانازییەوە، وەك ئەوەی خۆی چووبێتە ئەو دیو دەریاو لەبەری ڕۆژاواوە نامەکەی بۆ هێنابم، پێی گوتم:

– بێ شك نامەی مێردەکەتە.

سوپاسم کرد، بەڵام ڕاستییەکەم پێنەگوت. کە چاوم بە خەتی نووسینی ناونیشانی سەر زەرفەکە کەوت، زانیم نامەکە هی (جیرالد) نییە. هی......، نازانم چ ناوێکی لێ بنێم‌و چۆن بانگی بکەم؟ چونکە تا ئێستایش هەر من ژنی (جیرالد)م‌و حەز ناکەم وشەی دۆست بۆ ئەو ژنە بە کار بهێنم. هەرچەندە ژنەکە ئەمەی بۆ دەگونجێ. وابزانم ئێستا ژنە چینییەکانی گەڕەکەکەمان لە (پەکین)، بەو دەڵێن: ژنە چینییەکەی‌و بە من دەڵێن: ژنە ئەمریکییەکەی. بەڵام دڵم نارەحەتە، مادەم ئەو ژنە دەتوانێ نامەم بۆ بنووسێ، ئەی بۆچی (جیرالد) بۆم نانووسێ؟ چ شتێ ڕێی لێ گرتووە: دڵسۆزیی بۆ نیشتمانەکەی؟ یان ترسی نیزامەکە؟ یان دڵسۆزیی بۆ من کە ڕێ نادا نامەم بۆ بنووسێ‌و ئینجا ناچار دەبێ دان

پێدا بنێ، ڕێزی ئەشقی پیرۆزی بەینی خۆمانی نەگرتووە، کەچی خۆی بەر لە هەموو کەس دەزانێ ئەو ئەشق و خۆشەویستییەمان چۆن بوو.

زەرفەکەم پچڕاند. ئەم نامەیەی تێدابوو:

((خوشکی گەورەو خۆشەویستم،

نامەکەتم پێگەیشت. سوپاست دەکەم کە وەڵامت داومەتەوە. بە ئەرکی خۆم دەزانم دەنگ و باسی مێردەکەمانت پێبڵێم، هەر چەندە دڵنیا نیم ئەم نامەیەت پێدەگا، بەڵام ئەوەی لەسەرم بێ دەیکەم. ئەم نامەیەشم بە هەمان ڕێگای نهێنی نامەی یەکەم بۆ ناردی. ئەگەر بێ و بکەوێتە بەر دەستی یەکێکی تر، تۆ هەرگیز نایخوێنیتەوە. یەکەم خەبەر پێت ڕابگەیەنم ئەوەیە مێردەکەمان تەندروستی باشە، بەڵام هەمیشە غەمبارە، بە گفت و لفت نییە لەگەڵما. بەیانی دەچێتە سەر کارو ئێواری دێتەوە. ماڵەکەت چۆن جێهێشتبوو، وەکوو خۆیەتی. دەستم لە هیچ نەداوەو هیچم نەگۆڕیوە. بەڵام ناتوانم ماڵەکە وەکوو تۆ بە پاک و خاوێنی ڕابگرم. لەوەوە دەزانم کە (ئەو) جاروبار گلەوگازاندەم لێ دەکا. پێم گوتووە من ناتوانم وەکوو تۆ ئەو شتانە بکەم و وەکوو تۆ دڵی ڕازی بکەم. حەزی لە چ خواردنێك بێ بۆی لێ دەنێم. قەت ناوی تۆ ناهێنێ. هەرچەندە دەزانم تۆ لەناو مێشك و لەناو هەموو گیانی دایت و وەکوو نهێنییەك شادی پێدەبەخشی. شەوانی هەیوە شەو، لە حەوشە هات وچۆ دەکا، چاو لەسەر مانگ هەڵناگرێ. بە ئارامی لێی ورد دەبێتەود، ئایا هەر ئەو مانگەیە لای ئێوە هەڵدێ؟ بۆیان باس کردووم مانگ، لێرەو لەوێ، هەر ئەم مانگەیە. یانی (ئەو) چی بە مێشکدا دێ بە مانگی دەسپێرێ بۆ ئەوەی مانگیش بە تۆی بڵێ.

بەش بە حاڵی تەندروستیشی باشە. ئەوەندە هەیە خەوی کەمە! تا ئێستا هیچ منداڵی لە من نەبووە. پێم دەڵێ حەز لە شتی وا نەکەم. من نارەزایی پێشان دەدەمو پێی دەڵێم: ئەی حەزو ئارەزووی من؟! وەڵامم دەداتەوە گوایە بۆ منیش وا باشە منداڵم نەبێ، چونکە منداڵەکان دوورەگەو دوو خوێن دەردەچن. بەڵام من زۆرم مەراقە منداڵێکم ببێ. بۆ ئەمەیش دەچمە پەرستگاو لە خودانەکانی زاوزێ دەپاڕێمەوە. بە دزی دەچم، چونکە لێ ناگەڕێن بڕوامان بە خودانەکان هەبێ. هیوادارم ئاگاداری خۆت بی. ئەگەر تۆ لەماڵەوە لەگەڵمان بای، چۆڵاتی ماڵەوە نەدەماو لەوانەیش بوو ببین بە دەستە خوشك...

خوشکی بچووکت)

ئەم جارە زیاتر تەقیەی کردبوو، نامەکەی بە ناوی خۆیەوە نەنووسی بوو. زەرفەکەش پوولی سەنگاپوورەی لێ نەدرابوو، پولی (هونگ کونگ)ی لێ درابوو. ئەم نامەیە لە نامەکەی پێشوو زیاتر کاری لێ کردم. هەستم کرد نامەیەکی ناسكو شیرینە. سەیرم پێهات کە هیچ غیرەی لە دڵ نەوروژاندم. کە لە ڤێرمۆنت دەبێتە هەیوە شەو، دەچمە دەرەوەو تەماشای مانگ دەکەم. تەماشای دەکەمو دەزانم چەند سەعاتێ پێش ئەوەی بگاتە لای من، لای (ئەو) بووە. سوپاست دەکەم خوشکی بچووکم.

بەم جۆرە لە بەینی خۆمو لەناو دڵودەروونی خۆمدا دەژیام. کەس لەم دۆڵەدا نییە کە بۆی باس دەکەم، بتوانێ لە بنجو بناوانی ژیانی من بگا. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم بە هیچ چەشنێ باسی بکەم. بە ڕاستی حەز دەکەم لە بازنەی ئەم ژیانە دەربچم کە لەگەڵ (جیرالد) ژیام بۆ ناو بازنەی ژیانێکی تر کە خۆم دەستم لە دروست کردنیدا نییەو وەکوو

ئەو گەردوونە بە دەورمدا دەخولێتەوە. ئەوەتا خۆر ئاوابووەو مانگ گەیشتۆتە تاقی ئاسمان. لەگەڵ ئەوەشدا، ناتوانم خۆم لەو ژیانەم ڕزگار بکەم کە وەکوو شتێکی ڕاستەقینە هەیە، هەر وەکوو ناتوانم بە هەموو گیانم لەو دونیایەی تر بژیم کە بە ڕاستی هەیەو بە هەستو نەستەوە تێیدا دەژیم. بەم جۆرە خۆم لە بۆشاییەکدا دەبینم لە هەموو لایەکەوە دەوری داوم، نە سەری دیارەو نە بن.

ئای دەنا بمتوانیایە شەبەنگی بیرەوەری لە خۆم دوور بکەمەوە!! ئای دەنا بمتوانیایە هەموو پەیوەندییەکی لەگەڵ بپچڕێنم!! وەکوو (جیرالد). کە یەك لە دوای یەك داوی پەیوەندی نێوانمان دەپچڕێنێ. ئەوەتا بە ئاشکرا هەستی پێ دەکەم. مەسەلەکە ئەوە نییە نامەم بۆ نانووسیێ، نەخێر، مەسەلەکە زۆر لەوە دوورترو ترسناکترە. مەسەلەکە ئەوەیە هەق بە خۆی نادا بیر لە من بکاتەوە. جاران، کە لە یەك جیا دەبووینەوەو دڵنیابووین بە یەك دەگەینەوە، یان لانی کەم هیوای یەکتر دیتنەوەمان هەبوو، هەستم دەکرد بە هەموو گیانی خۆیەوە لەگەڵمایە. وەکوو ئەو کاتەی کە من لەسەر چیاکانی (زیچوان) بووم لە (چونگ کونگ)و ئەویش لەگەڵ قوتابیو مامۆستاکانیدا دەخەبتیو بەپێ بەرەو ڕۆژئاوا بە وڵاتدا دەگەڕان. بە تایبەتی کە شەو دادەهات، دوای ڕۆژئاوا لەبەر تریفەی مانگە شەودا، هەستم دەکرد بە دڵو ویژدانو هۆش لەگەڵمدابە، بە ڕۆحو خوێن تێکەڵ دەبووین. بەڵام ئێستا وا نییە. ئێستا لە شەقەی باڵ دەدەمو بە سەر دەریاو بیاباندا بۆی دەفڕم کەچی ڕۆحی سەرگەردانم بۆی ناکرێ لەسەر چڵی ڕۆحی هەڵنیشێ. وردە وردە خۆم لێ دوور دەخاتەوەو لە ژیانی من دەکشێتەوە. مانای وایە هیوای بە دیتنەوەی من نەماوە. ئەمەیە تاکە هۆی ئەو شتانەیکە لێی

دەبینم. قەت بڕوا ناکەم وازی لە خۆشەویستی من هێنابێ. شتی وا قەت نابێ! مەسەلەکە هەر ئەوەندەیە پەیوەندی دونیاییمان تەواو بووەو نەماوە. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لە بۆشایی خۆمدا دەژیم، بێڕابردوو بێ ئاینده! تەنیا لە ڕابردوودا دەژیمو ناتوانم خۆی لێ ڕزگار بکەم.

کاتێ (بروس) داوای لێکردم شووی پێبکەم، بە گوێ، گوێم لە داواکەی بوو، بەڵام بە دڵ، هەستم پێ نەکرد. گوێم لێ بوو وشەکانی لە دەروونم دەنگیان دەدایەوە بەڵام وشەی بۆش بوونو هیچ زرنگەو ئاوازیان تێدا نەبوو. تا نەچوومەوە ژووری (بابا)، نەمزانی ئەمە بۆ من چ دەگەیەنێ. هەر چەندە گوڕو تینی ژیانی ئەو کاتەی نەبوو کە لە ماڵی (پەکین)مان هەستم پێدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا، هەستم دەکرد شتێك هەیەو بە هێمنی لە دەروونمدا دەجۆشێ. ئەو هەستە لە گیانمدا دەگەڕا، وەکوو ئەو هەستە وا بوو کە مرۆڤ بەرامبەر کەلاوەی کۆشكو خامۆشیی باخچەکانی هەستی پێدەکا. هەر چەندە ئەو کەلاوەی کۆشكو ئەو باخچانە هەن بەڵام ژیانیان تێدا نییەو کەمو زۆر بەکار ناهێنرێن.

هەموو جارێ کە دەچوومە ژووری (بابا)، بە زۆری دەمدی باپیرە کەوای شینی چینی لە خۆی لوول داوەو لە تەك پەنجەرە دانیشتووەو ئەو دەستنووسو پیرۆزەیەی لە چینو ئەو هیربارە پۆرسەلینەی لە کیانجسی هێنابوومو ئەو مافوورە شینەی وەکوو ئاسمانی باکووری چین وا بوو هەمووی لە دەوروبەر بوو. ئەو شتانە بە هەر جۆرێ بێ کەوتبوونە ژووری (بابا)و هەموو لە ژوورەکەی کەلەکە ببوون. کە دەچوومە ژوورەوە، دەرگام کلیل دەدا بۆ ئەوەی لە دونیای ماڵەوەو

هەموو دونیای دەرەوە دابڕێم و هەست بکەم ئەو ژوورەم بە هەموو شتەکانی ناوییەوە بۆ خۆم لە دونیا دابڕاندووە.

– (بابا)، باشی؟

– بەڵێ، زۆر باشم.

– ئێستا هیچ لە بارەی خۆیەوە نازانی. تەنیا بە ڕۆح دەژی. جەستەی بەلاوە هیچ مانای نییە. لە دونیای خۆیدا دەژی. ئەو دونیایەی کاتی خۆی تێیدا ژیاوەو تەنیا لای خۆی هەیە. گوێم لێیە هەندێ جار، بەبێ لێکدانەوە، لە خزمەتکارەکان دەپرسێ، دەڵێ:

– بۆچی بە (ئیما)ت نەگوت جلەکانم بشوا؟......

– (بابا)، (ئیما) لێرە نییە.

– بە ڕاست؟

ناپرسێ: ئەدی لە کوێیە؟ چونکە نایەوێ گوێی لە شتێ بێ حەز ناکا گوێی لێ بێ. خۆی بێدەنگ دەکا. ئەمە باوکی (جیرالد)ە، بەو پیرییە جوانەو بەو پیرۆزییە بەرزە، بە قژی سپی سەری کە دەڵێی بەفری بریقەداری سەر ترۆپکە چیایەو بە ڕیشی چڕو سپی، لە بەردەمم دانیشتووە. هەموو شتێکی لە بیر کردووە، تەنانەت هیچی لە بارەی (رینی)ی نەوەیشی بە بیر نەماوە. بیر لە هیچ شتێ ناکاتەوە. چۆنە ئاوها دەژی. ئەم قەوارەیەش کە لە بەردەمی خۆمدا دەیبینم، پاک و ناسك دەڵێی قەوارەی منداڵە نەك هیچی تر، هیچ ئاگای لە دەوروبەری خۆی نییەو تێی ناگا. تەنیا هەست بە قەوارەی خۆی دەکاو بەس، ئەو قەوارەی هان و دنەم دەدا بۆ ئەوەی ڕۆژانی سەردەمی ژیانی (پەکین)م بیر بکەوێتەوە.

ئای لەو شارە کە هەر لە خەون دەکا! شاری خەونەو هەر کاتێ بیر لە (جیرالد) دەکەمەوە، لەو شارەدا دەیبینم. شاری ئیمپڕاتۆرە گەورەو مەزنەکانە. هەرچی لە ژیاندا هەبێ، لەوێ هەیە. کۆشکی بان شینی زێڕ کفتی مێژوویی، بە ژنو پیاوو شاو ئیمپڕاتۆرەکانییەوە دەگێڕێتەوە. تەنانەت ڕەشەوەندی خەڵکەکەش کاتێ بە جادە پانو پۆڕەکانی ئەو شارەدا دەڕۆن، خۆیان لە بیر دەکەن، شکڵی میرو پاشایان بە خۆوە دەگرن چونکە هەست دەکەن ئەو شارەی لەگەڵ باپیرە گەورەکانیان تێیدا دەژین، شاری پاشایانە. تەنانەت ئەوەی دەڕۆزەو سواڵیش دەکا، ڕاستە، دەستت لەبەر خەڵك پان دەکاتەوە، بەڵام سەری دانانەوێنێ، سەری قیت ڕادەگرێ. ناتوانم باسی هەموو شتێکی ئەو شارە بکەم. ئەوەندە گەورەو فراوانو پڕە مرۆڤ ناتوانێ باسی هەموو شتێکی بکا. ئەو شارە لە ژێر تیشکی گەشی خۆردا دەبینم، تیریژی ئەو تۆزو گەردە زەردە شەق دەکا کە ڕەشەبای بەهار هەڵیکردووە. ئەو شارە دەبینم بەهەشتێکی گەورەو فراوانە. گومەزی شینی بریقەداری زێڕ کفتی لە ژێر سێبەری درەختی سەرکەشدا دەبریسکێتەوە. ئەو شارە دەبینم بەفر خانووەکانی داپۆشیوەو جادەکانی داگرتووە. کاتێ گەورەو بچووکی بە ڕێدا دەڕۆن، وەکوو پشیلە بە پارێزەوە جێپێی خۆیان دیاری دەکەن، ئینجا هەنگاو دەنێن. هەموو شادو دڵخۆشن. ڕوومەتیان لەبەر سەرمای سەختو لە ژێر کڵاوەکانیان سوور هەڵگەڕاوە. شەو، جادەکانی ئەو شارە دەبینم، هەندێ جار جمەیان دێ لەو خەڵکەی ئاهەنگ دەگێڕنو هەندێ جار چۆڵو کپو بێدەنگن. دەبینم چرای بەردەم ماڵانیان داگیرساندوەو مۆمیان پێکردووەو خێزانەکانیان لە بەر تیشکی مۆمدا لەسەر خوانی ئێوارە کۆبوونەتەوە.

ئەی چیاکانی (فیرمۆنت)؟ چیاکانی ڤیرمۆنت تا بڵێی کپو کشو ماتن! ئەوەی مانای ژیان بێ تێیاندا نییە. کە دونیا تاریك دادێ، جەنگەڵ دەبێ بە پەردەیەکی چڕی تاریکی. هەندێجار، کاتێ ڕۆژ هەڵدێو تیشکی بەناو درەختەکاندا دەڕواو دەگاتە گیاو ڕووەکی کێوی، جوانییەکی تێدا دەبینی مانەندی نییەو هێشتا دەستی مرۆڤی پێنەگەیشتووە. زۆری پێناچێ ڕۆژئاوا دەبێو خێرا ڕووناکی خۆی دەپێچێتەوەو تاریکی چین لەسەر چین بە سەر زەویدا دێتەوە.

ئەوەتا جارێکی تر پایز هاتۆتەوە، گەڵای درەخت ڕەنگی گۆڕاوە. چ ژیانێکە لە خاکی ئەم چیایانە کە بەهاران شیلە دەخاتە دەماری دارکەوەتو پایزان لێی وەردەگرێتەوەو جوانترین ڕەنگی پێدەبەخشێ؟!! ئەم درەختانە لە ئادار چەند تەڕوپڕو بە ئاو و شیلەن، ئێستا کە پایزە ئەوەندە ڕەنگینو پڕ ڕەنگن!

دوێنێ نەختێ لەگەڵ گەنجێ وەستام، لە درەختناسیدا پسپۆڕەو حکوومەت دایمەزراندووە خزمەتی ئەم جەنگەڵە بکا، باسی کرد گوتی هێشتا نازانین هۆی چییە بەهاران شیلە بە دەماری دارکەوەتدا هەڵدەکشێ، هێشتا نازانین چ هێزێك پاڵی پێوە دەنێو سەر هەوراز هەڵی دەدا. هەر ئەوەندە دەزانین هێزێکی ئەوەندە گەورەیە ئامێرو مەکینەی پێدەگەڕێ. هێزێکی خودییە، لە دەرچوونی لە زەوییەوە بۆ ناو ڕەگی درەخت، نەهاتووە. هێزەکە لە خودی خۆیەوە پەیدا دەبێ، نەك لە ڕەگەکان. ئەگەر دارکەوەتێك لە ڕەگەوە بڕییەوە، شیلەی ناوی لە هەڵکشانی خۆی بەردەوام دەبێ بە ناو قەدی دارەکەدا. درەخت دڵی مرۆڤی نییە. درەخت ئەو ترومپەی تێدا نییە کە خوێن بۆ ناو لەشی مرۆڤ پاڵ دەدا. ئەوەی تێیدایە هێزێکی توخمی بەهێزە، هێزەکەی لە

ڕۆحی خۆیەوە وەردەگریَ. هیَزی ژیانە. زۆر بە ڕوونو ڕەوانی لە پیَکهاتەی ئەم ماددەیەدا دەردەکەویَ.

ئەوەتا ئاخیری گەلاَی درەخت دەستی بە وەرین کردووە. وردە وردە چیاکان دەردەکەونو وەکوو هیَلّ بەرز دەبنەوەو بەرەو ئاسمانی شینو ساف هەلّدەکشیَن. ئیشی باخو شینایی سالاَنەمان تەواو کردووە، تەنیا ئیشی ڕۆژانەی ئاسایی ماوە. وەکوو پەروەردەکردنی مەڕو مالاَتو پەڕەورو کۆکردنەوەی بەرهەمەکانیان. من زۆر خۆشیی لەو کارانەی ڕۆژانە وەردەگرم. مانگی ڕابردوو، بۆ دابین کردنی خواردنی زستان، سیَ مانگام فرۆشت. (مات)یش دەرگاو پەنجەرەکانی قایم کردووە بۆ گیَڕانەوەی باوو باهۆزی زستان. ئەمڕۆ، وەکوو چین، هەوای گۆڕیو خۆشی کرد بەلاَم من ناتوانم وەکوو چینییەکان بکەم کە دەچوونە ئاقارو مشتیان قیت دەکردەوەو هەڕەشەیان لە (پیرەمیَردی ئاسمانان) دەکرد. هەستم دەکرد پەیوەندییەکی وردی دۆستیَنی لە نیَوان خوداکانی چینو جوتیارەکاندا هەیە. بە پیَی ئەو پەیوەندییە، خەلّك چاوەڕیَ دەکەن خوداکان سەرپەرشتی کاروباریان بکەنو بایەخ بە ئیشو کاریان بدەن. لە وەرزی خۆیدا بارانیان بۆ بباریَننو لە ڕۆژانی دیاری کراودا تیشکی خۆریان بۆ ڕەوانە بکەن. ئەمە هیَلّی وردی پەیوەندییەکەیە کە مەرجە خودانەکان لیَی لانەدەن. پاش داچاندنی بەرهەمی زستانە، ئەگەر هەوای گەرم بیَ، گەنم زوو چووزەرە دەردەکاو ئیتر کاتیَ ڕۆژگاری ساردو سەقەم دادیَ، سەرما دەیبەستیَو دەیفەوتیَنیَ... و جوتیار بەم جۆرە خودانی خۆی دەدویَنیَ:

- تۆ، ئەی سەرۆکی دێرینی بەرز! چ پێویست دەکا لە باتی گەرما، سەرمامان بۆ بنێری؟ ئەم کارەت لە سۆنگەی چییەوەیە؟..... ئەگەر کار وا بڕوا، من هیچ قوربانیت بۆ ناکەم!.....

منیش... هەر چەندە لەوانە بووم کە گومانیان لە خودانەکان هەیە، بەڵام نازانم ئەوە بە چ لێك بدەمەوە کە دوای دوو ڕۆژ، زریانێکی تووش لە باکوورەوە هەڵیکرد؟ ئایا ئەمە بەرپەرچدانەوەی ئەو شێوە زیتەی قسەکردنە لە گەڵیان؟!!

من و (جیرالد) زۆر بەمە پێکەنین. لە ڕۆژانی هەوەڵی زەماوەندمان زۆر پێدەکەنین. فێرم کردبوو چۆن پێ‌بکەنێ. فێرم کردبوو چۆن ڕۆحی شاد بکەم. ئەو ڕۆحەی چینی لێی ڕاهاتوون. ئێستا بیر دەکەمەوە ئاخۆ دەبێ ئەو ژنە چینییە بتوانێ بیخاتە پێکەنین. ئێستا من تەنیا نامەکانی ژنەکە دەخوێنمەوە، نەك نامەکانی (ئەو). نامەکانی (ئەو) بۆ من وەکوو شتێکی کۆنی سەردەم تێپەڕیویان لێ هاتووە. ئێستا لە هەرچی بارودۆخێکدا بێ و هەرچی بە سەری هاتبێ، ئەو پیاوە نەماوە کە دەمناسی. هەوڵ دەدەم لە بەینی دێڕەکانی نامەی ژنە چینییەکەوە بزانم ئێستا چۆنە. هەر چەندە لە سێبەرو تارماییەکەی زیاتر هیچ نابینم.

* * *

# (٢٨)

ئەمشەو، كاتێ پەنجەرەكەمم كردەوە، كە بە سەر ئەو دۆڵە تەسكەدا دەڕوانێ، تەرزە دەباری. چەنگە تەرزەیەكم بۆ هات، لە دەمو چاوی دام. هەستم كرد هەوایەكی سارد خزایە ناو كراسی نووستنم. هەر ڕام كرد بۆ ناو نوێنەكەمو جاجمەكەمم لە شانم لوول دا بۆ ئەوەی بیری تەنیایی لە خۆم بتەكێنم. هەر خۆمو خۆم لەناو نوێن ڕاكشام. بیرم خستە سەر گەرمی ئەو جاجمەی لە خۆمم لوول دابوو. جاجمەكەم لە خوری مەڕەكانم دروستم كردبوو. ئەوەندەم بەس بوو خۆم بە خوری مەڕەكانی خۆم گەرم بكەمەوە. بە بەشی خۆم ڕازی بووم. بە ژیانی خۆم ڕازی بووم. بەو مانگایانەم ڕازی بووم كە شیرو كەرەو پەنیرم لێ دەخواردن، بە زەوی خۆم ڕازی بووم كە بەرووبوومەكەم دەخواردو تەماشای جوانیم دەكرد. بە شادیو بەختەوەری لە ژێر جاجمەكەم ڕاكشام. چێژم لە گەرمیو جوانیی نەخشو ڕەنگەكانی وەردەگرت. ئاخیری وام لێ هات حەسانەوەو بەختەوەریم لەم شتە كەمو بچووكانە وەردەگرت. ئەی ئەوە نییە هەر تەنیا ئەم شتە بچووكانەم بۆ ماوەتەوەو لەگەڵما بەردەوامن؟!

* * *

# (٢٩)

ئەمڕۆ، لەم کەش‌و هەوایە دا، کە بەفری سپی عەردی دۆڵەکەی داپۆشیوە‌و چیا بە ترۆپکی سپی بریقەدار بەرز هەڵکشاون، یەکەم نامەی (رینی)م بۆ هات. ئەمە تاکە نامەیەك بوو پۆستەچی خستییە ناو سندووقەکەم. ئیشی ترم نەبوو خەریکی بم. لە ناو مدبەق بووم، هەر لەوێ دانیشتم‌و زەرفەکەم هەڵپچڕی‌و دەستم بە خوێندنەوەی نامەکە کرد:

((دایکی ئازیزم،...))

بە دەست خۆم نەبوو وشەکانم ماچ کرد.... ئینجا لە خوێندنەوە بەردەوام بووم. چەند مانگێك بوو لەماڵەوە ڕۆیشتبوو، کەچی هەستم کرد بە جۆرێ بۆی نووسیوم وەك ئەوەی دوێنێ لە لام بووبێ.

باشە، ئەوە تۆ لە کوێی (رینی)؟ نامەکە لە کۆلێجێکی ڕۆژئاواوە هاتووە. (رینی) نایەوێ وەکوو باوکی بچێتە کۆلێجی (هارڤارد). ئەو دەیەوێ شتێکی تر بخوێنێ. کەواتە مەسەلەکە ئەوەیە. (سام) گوتەنی ڕێگای خۆی لە ژیاندا شەق دەکاو دەتوانێ بڕواتە پێش. نامەکەی هەندێ شتی تێدابوو بەڵام نەچووبووە ناو وردەکاری شتەکان. (رینی) بە تەقەڵاو ماندووبوون دەخوێنێ. حەز دەکا هەموو شتێ لە بارەی

سرووشتەوە بخوێنێ. لەگەڵ برادەرێکی لە ژوورێکە ناوی (جۆرج بووین)ە، ئاه! ئەو (جۆرج بووین)ش خوشکێکی هەیە. جوان نییە. بەڵام دیارە زیرەکە، ڕێك و پێکە، بالاَبەرزە!

(دایکە، ئێستایش هەر چیت بە خەیاڵدا دێ لەم بارەیە لە مێشکی خۆتی بخەرە دەرەوە. بە گشتی مەسەلەی من لەگەڵ ژنان بڕاوەتەوە.)

لێرەدا ناچاربووم لە خوێندنەوە وەستام. کوڕەکەم، لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا، ڕادەگەیەنێ کە مەسەلەی لەگەڵ ژنان بڕاوەتەوە! ئاخ، (ئیللیگرا)! زیاد لە پێویست ئەزیەتت داوە!! بەڵام ئەمە حاڵی هەموو پیاوو هەموو ژنێکە بەرامبەر خۆشەویستی یەکەمیان. کەم وا دەبێ، یەکێکیان زەرەری پێنەگا. وەکوو من و (جیرالد). هەردووکمان لە خۆشەویستی یەکەمدا نقووم بووین.

((لە چەژنی سەری ساڵ، سەرتان لێ دەدەم!))

کەواتە ئەمە یەکەمین مژدەی نامەکەیە. ئەوەندەم بەسسە! ئەوەندەم بەسسە کوڕەکەم سەرم لێ دەداو بە یەکەوە جەژن دەکەین!

بەبێ (ڕینی)، جەژن بۆ من و بۆ (بابا) جەژن نییە. (بابا) هیچی لەم جەژنە بە بیر نەماوە. منیش نەمدەتوانی بە تەنیا پێشوازی لە جەژن بکەم، بە تەنیا دابنیشم و لەبەر خۆمەوە بڵێم: (تۆ چ جەژنێکی وا بە ساردی هاتی؟!)

بەڵام ئێستا، کە نامەی (ڕینی) هات و بەڵێنی دا بۆ جەژن بێتەوە، مەسەلەکە گۆڕاو بارودۆخ هەڵگەڕایەوە. لە ئێستاوە مشووری هەموو شتێ دەخۆم بۆ جەژن. لە ئێستاوەیش بلووزێکی خوری سوور دەچنم و بەو بۆنە خۆشەوە بە دیاری پێشکەشی (ڕینی) دەکەم. جلەکانیشی بۆ چاك دەکەمەوە. ئەوە چەند مانگە کەس نەبووە بۆی چاك بکاتەوە.

هەستم کرد ماڵەکەم ژیانی هاتەوە بەرو پڕ بوو لە ڕووناکی. هەر ڕام کرد بۆ لای (بابا). دیم بێجووڵە لە تەنیشت پەنجەرە دانیشتووە. بە زمانی چینی پێیگوتم:

– ئەژنۆم ساردە!

– بەتانی لەسەر لاکەوتووەو بەربۆتەوە سەر زەوی.

وام پێشان دا، بە زمانی چینی لۆمەی دەکەم، چونکە کاتێ بە زمانی چینی قسە دەکا، زمانی ئینگلیزی لە بیر دەکا. بە ئینگلیزی دەنگوباسی نامەکەم پێگوت:

– بۆ جەژنی سەری ساڵ، (رینی) دێتە سەردانمان. گوێت لێمە؟ تێگەیشتی چم گوت؟ دەی، لە دووم بڵێوە: (رینی)، بچکۆڵەکەم!

چاوی لەبەر نەخۆشیی داوەشاوەو لەبەر پیریی شەکەتبار بووە. چاوی تێبڕیمو بە دەنگێکی لەرزان قسەکەی منی دووبارە کردەوەو گوتی: (ڕینی، نەوەکەم)!

– لە جەژنی سەری ساڵ، دێتە سەردانمان!

– لە جەژنی سەری ساڵ، دێتە سەردانمان!

ئایا کە قسەکەی دووبارە دەکردەوە، دەیزانی چ دەڵێ؟ قەیدی نییە کە (رینی) هاتەوە، بێشك لە مانای قسەکە دەگا. بەڵێ، ئەوسا دەزانێ!

ماچێکم لە تەوێڵی کردو جێم هێشت. چووم بۆ ئەوەی بزانم ژووری (رینی) چی کەمە. ئاخۆ دەبێ (مات) یارمەتیم بدا ژوورەکەی بۆ بۆیە بکەین؟ وا بزانم زەردێکی کراوە باشە!

* * *

# (٣٠)

ڕۆژ خێرا هاتو چوو. چوار ڕۆژ ماوە بۆ جەژنی سەری ساڵ. ئەم شەو، (رینی) دێتەوە. دوو نامەم لە (پەکین)ەوە بۆ هاتووە: یەکێ بە ڕێگای (مانێلا)و ئەوەتر بە ڕێگای (بانگۆك)! ئێستا ئەو خانمە چینییە هەموو سەرنجی داگرتووم. پەنا بۆ هەموو فێڵێك دەبا بۆ ئەوەی نامەم بۆ بنێرێ. هەست دەکەم لە هەموو شوێنێ برادەری هەیە. بۆیە وا دەکا تا هەموو زەرەرێك لە (جیرالد) دوور بخاتەوە.... گومانی تێدا نییە هەموو نامەکانی (جیرالد) لە ژێر چاوەدێریدان. بەڵام نامەکانی ئەو ژنە وا نین. ئەو زۆر بە ئاسانی دەتوانێ نامەکانی لە ژێر جلی بشارێتەوەو بچێتە سەردانی ماڵێك بێئەوەی مەترسی لەسەر بێ چونکە بەرشك نییە. ئاخۆ دەبێ ئەو خانمە شکڵی چۆن بێ؟ زۆر دوودڵ بووم داوای وێنەیەکی بچووکی لێ بکەم. هیچ گومانی تێدا نییە ئەگەر داوای لێ بکەم بە پێی توانا بۆم دەنێرێ. چونکە لە خۆمەوە هەست دەکەم ئەو ژنە لەو جۆرە ژنە شادو ڕووخۆشو دڵسۆزانەیە کە بایەخ بە شتی وا دەدەن. ئەم جارە باسی (جیرالد)و باسی ماڵەوەو باسی ژیانی خۆیانی

بۆ نووسیوم. کە باسی (جیرالد) دەکا، قەت ناوی ناهێنێ، بەڵام منیش‌و ئەویش دەزانین مەبەست بە (ئەو) کێیە.

- ئەمڕۆ (ئەو) تووشی باپەڕ هات. لە کاتی دەرزگوتنەوەدا لە پۆل، هەستی دەکرد زیخی لە گەروو دایە. زەنجەفیلێکی گەرمم بۆ گرتەوەو هەندێ هەنگوینم تێکرد. خواردییەوە چاکتر بوو.

بەڵێ، دەزانم (جیرالد) بە زیخی پایزو تۆزو خۆڵی ڕەشەبا تووشی کۆکە دەبوو. ئەو کۆکەیە خەوی لێ دەزڕاند. زۆر جار بیرمان دەکردەوە لەوێ بار بکەین‌و بچین لە شوێنێکی باکووری ڕۆژاوای چین‌و دوور لە بیابان، نە شارێکی سەر ڕووباری (بانجسی) نیشتەجێ بین. بەڵام کە دەهاتینە سەر جێبەجێکردنی بڕیارەکە، (جیرالد) پەشیمان دەبووەوە، حەزی نەدەکرد لە (پەکین) بڕوا، دەیگوت:

- (پەکین) بۆ من نیشتمانە. هیچ شارێ وەکوو (پەکین) گەورەو مەزن نییەو ئەگەر لێرە بڕۆم لە هیچ شوێنێکی تر هەست بەوە ناکەم کە لێرە هەستی پێ دەکەم. بچمە هەر شارێکی تر خۆم بە بێگانە دەزانم.

بەم جۆرە لە (پەکین) ماینەوەو نەڕۆیشتین.... نازانم من چۆن بیرم بۆ ئەو زەنجەفیل‌و هەنگوینە نەدەچوو؟ ئەو ژنە لە من باشتر خزمەتی دەکاو لەم بارەیەوە بۆڕم دەدا. بەڵام ئایا ئەو ژنە بە قەد من خۆشی دەوێ؟ دەزانم ئەویش پڕ بە دڵ خۆش دەوێ، بەڵام ئەو دڵی بچکۆڵەیە.... دڵی بە یەك فنجانە خۆشەویستی پڕ دەبێ‌و لە سەری دەڕژێتەوە. ئایا (جیرالد) بەوەندە دڵی دادەکەوێ؟ ڕەنگە دڵی دابکەوێ. من لە کوێ بزانم. لە نامەکەدا نووسیبووی:

- ((پایزێ، گوڵە کرازانتیوم پێگەیشتن. لای دیواری باکووری حەوشەی گەورە پشکووتوون.......))

که من لەوێ بووم، ئەو گوڵانەی لێ بوو، بەڵام من هەندێ گوڵی تریشم لای دیواری حەوشەی بچووك‌و لە تەك ژووری نووستنمان چاندبوو، کەچی ئەو هیچ باسی ئەو گوڵانەی نەکردووە.

((..... خۆی لە ئیش زۆر ماندوو دەکا. پۆلی تازە کراونەتەوەو ژمارەی قوتابیان زیادی کردووە. خۆی شەکەت دەکا. کە وەختی خەوتنیش دادێ، خەوی لێ هەڕ دەمێنێ‌و ئەگەر ناوبەناو خەوی لێ بکەوێ، لەبەر خۆیەوە قسە دەکا. تێناگەم چ دەڵێ......))

ئاخۆ کاتێ لە بەر خۆیەوە قسە دەکا، ناوی منیش دێنێ؟ ئەگەر ناویشم بێنێ، باوەڕ ناکەم ئەو ژنە پێم بڵێ. ئەگەر بیر لە شتی وا بکەمەوە، مانای وایە لە ڕادەی خۆی زیاتر ڕۆیشتووم. ئێستا (ئەو) لە منەوە دوورە. ئەگەر گریمان بە یەکیش بگەین، هەر لە دووری من دەمێنێتەوە. بیرازێکمان لە نێودایە کاری ڕۆژگارێکە من هیچ دەورم تێدا نەبووە. ئەو ڕۆژگارە، بە هەموو شتێکەوە، وەکوو بەربەست‌و لەمپەرێکی پتەو لە بەینمان قیت بۆتەوە. خۆیشی ناتوانێ ئامارەی بۆ بکا، یان باسی بکا. منیش ناتوانم پرسیاری ئەو ڕۆژگارەی لێ بکەم. ئەمەیش بە هیچ جۆرێ لەگەڵ ڕەوش‌و هۆگرایەتی بەینمان ناگونجێ کاتێ بە یەکەوە بووین‌و نەدەبوو هیچ نهێنی‌و قسەی نەکردەنیمان لە نێواندا بێ.

وام بە چاك زانی نامەکە بپێچمەوەو هەڵیبگرم چونکە ماوەم نییە بیر لەم هەموو شتانە بکەمەوە. ئەم شەو، کاتی هاتنەوەی (رینی)یە. ئەوەتا ژوورەکەیم ئامادە کردووە. دیوارەکانم بۆیە کردووەو کەل‌وپەلەکانم پاك کردۆتەوەو ڕێکم خستوون. چەرچەفی نوێنەکەم گۆڕیوە بۆ ئەوەی پاش ئەو هەموو مانگە دوورو درێژە بە ئاسوودەیی تیا بخەوێ.

ئەوەتا ژوورەکەی خەریکە لە خۆشییان بە سۆبەو گوڵەکانییەوە سەما دەکا. بۆ وا نەبێ؟ ئەی حەقی خۆی نییە بە هاتنەوەی خاوەنەکەی شادو کەیفخۆش بێ، با بۆ چەند ڕۆژێکیش بێ؟ ئەی نابینن من چەند شادو کەیفخۆشم!

شەو، بەفر دەستی بە بارین کردەوە. ڕەنگە بیر لە بەفرەخلیسکێ بکاتەوە. بۆیە کەرەستەی بەفرەخلیسکێم بۆ ئامادە کرد. کە لە ئامادە کردنی هەموو شتێ بوومەوە، دانیشتمو چاوەڕێم کرد. ئیتر کات بە گرانی دەڕۆیشت. تەماشای میلی سەعاتم دەکرد، وامدەزانی ناجوولێتەوە. ئەوسا بیرێکم بە مێشك داهات. بیرم کردەوە خۆم بە ئامادە کردنی درەختی سەری ساڵەوە خەریك بکەم، بەڵام هەر زوو وازم لەو بیرە هێنا. نەمویست لە ڕەوشتی دێرینی خۆمان لابدەم کە لە منداڵییەوە، بە پێی ڕەوشتی باوكو باپیران، ڕۆژێ پێش جەژن، بە یەکەوە دەچووینە سەر چیای پشت کێڵگەی شەکرو درەختەکەمان دەبڕییەوە.

زۆر پێویستە ڕەوشتی باوكو باپیرانمان بپارێزین. ئەو ڕەوشتانە، ئێستامان بە ڕابردوو دەبەستنەوەو دەگوازرێنەوە بۆ ئایندە! ئەگەر (جیرالد) بیتوانیایەماڵەکەی پڕ بکا لە ڕەوشتی دێرینی خێزانەکەیو کوڕەکەی بە ئەندامانی تری خێزانەکەیەوە گرێ بدا بۆ ئەوەی هەست بکا ئەویش لەناو خێزانو هۆزەکەی خۆیدا شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، لەو کەشو هەوایە گۆشەگیرە گەورە نەدەبوو کە تێدا گەورە بووە. بەڵام ڕەنگە (بابا) بە شتی وا ڕازی نەبوایە، یان ڕەنگە دایکی (جیرالد) وای بۆ چووبێ کە شووی بە بێگانەیەك کرد، هەموو پەیوەندییەکی خۆشەویستی لەگەڵ خێزانی خۆی بڕیوە. هەر ئەمەشە وای لێ کردووە

ببێ بە شۆڕشگێڕ. ئەوەی شۆڕش دەکا تەنیا مرۆڤی کلۆڵو بەدبەختە. جا من نابێ ڕێ بدەم (رینی) ئاوای لێ بێ. دەبێ وای لێ بکەم ئەم دۆڵە بە شوێنی خۆی بزانێ کە جێئارامگەی باوكو باپیرانمانە. دەبێ، بە هەر جۆرێ بێ هەست بکا، ولاتی من ولاتی ئەوەو نیشتیمانی من نیشتمانی ئەوە، ئەگەرنا لە هەر کوێ بێ، دەبێ بە شۆڕشگێڕ.

جارێکی تر دەستم بە ڕێکخستنی شتومەکەکانی کردەوە. ئەوەیە سۆزی ئاسایی دایك بەرامبەر منداڵەکەی، بە تایبەتی ئەگەر منداڵەکەی کوڕ بێ، بەلام ئەگەر کچ بێ شتەکە زۆر جیایە. ئەگەر کچ بێ، هەمیشە لای خۆمەو لە گوێوحەمدی خۆمدایە. بەم جۆرە، (رینی) هەمیشە لێمەوە دوور بووە. ئەوەتا وەکوو کەسێکی نامۆ دێتە سەردانم. ناچارم سەر لە نوێ خۆی پێبناسێنم، وەك ئەوەی پێشتر یەکترمان نەدی بێو هیوادارم زۆر بە ڕێكو پێکی ئەم دابە جێبەجێ بکەم.

بەم جۆرە، ئەو ئێوارەیە هێدی هێدی نزیك کەوتەوە کە چاوەڕێم دەکرد. خۆر لە پشت ترۆپکی چیاکانەوە ئاوا بوو. ئاسمان ڕەنگی ئاگرینی ئاسۆی سەرترۆپکە سپییە بەفر پۆشەکانی بە خۆیەوە گرت. (بابا) هەستی کردبوو جوولەیەکی نائاسایی کەوتۆتە ماڵەوە. نەیدەویست وەکوو جاران زوو بخەوێ. داوای کرد باشترین جلی چینی لەبەر بکەم. ئینجا دەست بە داروەکازەوە لەسەر کورسی تەك پەنجەرە دانیشت. ئەو دارە ئەوە نەبوو کە ڕۆژانە بە کاری دەهێنا. داردەستێکی تایبەتی بوو داوای لێ کردم بۆی بدۆزمەوەو بیدەمە دەستی. داروەکازەکە گۆمکی بە شێوەی دڕندەیەکی زەبەللاح بوو، ئاگری لە دەم دەهاتە دەرەوە. لەو دانیشتنەدا، بە قژی سپیو ڕیشی درێژی

وەکو سەرۆکێکی چینی کۆن وا بوو. تەنیا بە دیمەنی لا ڕوومەت و بە لووتی چەماوەی دەچووەوە سەر ڕەگەزی سکۆتلەندی خۆی.

منیش هەرچی بۆ خوانی ئێوارە پێویست بێ هەمووم ئامادە کردو چوومە نهۆمی خوارەوە بۆ ئەوەی لە دەرگای پێشەوەی حەوشەوە نزیک بم کە هەندێ لقەداری سەوزو هەندێ گوڵم پێوە کردبوو بۆ ئەوەی (رینی) بزانێ من لەم لایەم و بەم دەرگایەدا بێتە ژوورەوە.

ئاخیری، لە دوور گڵۆپی ترومبێلێکم دی بۆ لای ماڵمان دەهات. خۆیەتی! دیارە ترومبێلێکی لە ئێستگەی مانجستەر بە کرێ گرتووە. وادەی گەیشتنی خۆی پێنەگوتبووم، بۆیە نەچوومە دەرەوە بۆ پێشوازیی. ترومبێلەکە لەبەر دەم ماڵەوە وەستا. لەپڕ هەستم کرد سەرم دەسووڕێ، ناچاربووم سەرم خستە سەر دەرگا. گوێم لە دەنگی لێدانی ئەڵقەڕێزی سفری دەرگا بوو. ئاخۆ دەبێ، دوای ئەو هەموو چاوەڕوانییە، ئەمە (رینی) بێ!؟ دەبێ یەکێ نەبێ لەوانەی بە دەگمەن ڕێیان دەکەوێتە ئەو ناوە؟ ئاخیری، دەرگا کرایەوە. دوو پیاوی باڵابەرزم بینی لەبەر دەرگا وەستابوون: یەکێ (رینی)و ئەوەی تر (سام) بوو. یەکەم جار (سام) قسەی کرد:

– ئێوارە باش، خانمی (ماك لیود)! لەگەڵ (رینی) هاتم بۆ ئەوەی بزانم پیرەمێردی برادەرم چۆنە! ئەگەر حەز بە هاتنم نەکەی، دەتوانی دەرم بکەی!

کە نۆقەی لەگەڵ کردم ئەوەندە بە توندی دەستی ڕاگوشیم وەخت بوو زەندم لە گۆ بچێ. کە بازووی لە شانم وەرهێناو ماچێکی درێژی لە گۆنا کردم، چاوی کوسکە کوسك دەبریقایەوە. لەو ماوەیەدا من تەنیا (رینی)م دەدی، بە بەژنی کەڵەگەتی بە کپ و هێمنی بزەی دەهاتێ و

چاوەڕێی دەکرد. ئاخیری (سام) لە هەڵوێستی (رینی) گەیشت، خۆی دایە لایەك‌و گوتی:

– ببوورە، خانم!

(رینی) هاتە پێش، بە هەردوو دەستی، دەستەکانی گرتم. داهاتەوەو گۆناکەی تری ماچ کردم. ماچێکی سووك‌و خێرا! هەر ئەوەتە هەستم بە لێوی تەڕوپڕی کرد.

– ئێوارە باش، دایکە!

چاوی تێبڕیم‌و لێم وردبووەوە. منیش تێی نزبوومەوە. هیچ قسەی نەکرد. من خێرا دەستم بە قسە کردو گوتم:

– فەرموون! فەرموون! ئەمشەو، دونیا ساردە! وەرنە ژوورەوە. ژوورەوە گەرمە. (رینی)، بەیانی هەوا خۆش دەبێ، ڕۆژی بەفرەخلیسکەیە.

هاتنە ژوورەوە. (رینی) وەستاو چاوی بە دالآنەکەدا گێڕ دا، ئینجا تەماشای ژووری دانیشتنی کرد. هەموو چراکانی ماڵەوەم پێکرد بوو و مۆمم لەسەر مێزەکانی ژووری نان خواردن داگیرساندبوو. هیچم لە خۆم نەهێشتبووەوە، بەو پەڕی جوانی مێزم ڕازاندبووەوە. بە جۆرێ لەگەڵ ئەو بۆنە خۆشەدا بگونجێ.

ئینجا لە (رینی)م پرسی:

– پێت وەکوو جاران وایە؟

سەری باداو هیچ قسەی نەکرد. نەخێر، من دەزانم شتەکان وەکوو جاران نابینێ چونکە لەو ماوەیەدا خۆی گۆڕاوەو بۆچوونیشی بەرامبەر شتەکان گۆڕاوە. هەست دەکەم بەرامبەر بە من، کە دایکی خۆیم، لێم بە پارێزە. دەترسێ وەکوو جاران مامەڵەی لەگەڵ بکەم کە هێشتا منداڵ بوو..... کەچی ئێستا بۆتە پیاو. هەست دەکەم ئامادەیە نەبێتەوە بە

کوڕم ئەگەر بێت و ئەمە وا بگەیەنێ هێشتا منداڵە. ئەمەم لە سەرنجێکی خێرای بە ئازاری شاراوەیەوە بینی. لێم پرسی:

– (رینی)، حەز دەکەی بچیتە ژوورەکەی خۆت؟ بۆم ڕێك خستووی. (سام)، ژوورەکەی تۆیش تەنیا چوارپاو دەستە نوێنێکی کەمە. زۆر شادمانم بەهاتنتان.

بەڵێ، بە ڕاستی شادومان بووم بە هاتنی. یەکەم جار کە دیم لەگەڵ کوڕەکەم هاتووە، دڵم پێگوشرا، بەڵام پاشان بیرم کردەوە، زانیم بۆچی هاتووە. (رینی) ویستوویەتی لەگەڵیا بێ بۆ ئەوەی لەگەڵ من، کە دایکیم، بە تەنیا نەبێ. هەستی کردووە پێویستی بە پیاوێکە پشتی بگرێو لە منی بپارێزێ، بۆیە دەبێ منیش هێمن و لەسەر خۆ بم. ڕەزام لای ئەم پیاوە باڵابەرزو کپوهێمنە قورس نەکەم. ئیتر ئاخیری شادومان بووم بە هاتنی (سام). کە ئەو لێرە بێ، دەتوانم بە ئاسانی وەکوو دوو کەسی بیانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم.

– (رینی)، تۆ ژووری خۆت پێ دەزانی!

– (سام)، تۆیش بەڵکو بچیتە لای دەستە ڕاست...

کە ڕێگای ژوورەکەم پێشانی (سام) دا، قسەی پێبڕیم و گوتی:

– پیرەمێرد چۆنە؟!

هیوای بینینی (بابا)م بۆ خواست و وەڵامم دایەوە:

– بە بینینت شادومان دەبێ!

– لە کوێیە؟

– لێرەیە.

دەرگای ژووری باپیرەم کردەوە بۆ ئەوەی (سام) بچێتە ژوورەوە. بەڵام (رینی) ڕۆیشت چووە ژووری خۆیو دەرگای لە دوای خۆیەوە پێوەدا.

– باشە! باشە!

(سام)، ئاوها هاواری کردو داهاتەوە دەستی (بابا)ی گوشیو (بابا) بە حەپەساوی چاوی تێبڕی. (سام)، بە گەرمو گوڕیو خۆشەویستی گوتی:

– لێرە دانیشتووی، دەڵێی ئیمپراتۆرێکی چینی دێرینی. دکتۆر (ماك لیود)، چۆنی؟

کورسییەکەی ڕاکێشاو لەبەردەم (بابا) دانیشت. ئاخیری، (بابا)، بە پارێزەوە گوتی: باشم. ئینجا تەماشای منی کرد بۆ ئەوەی فریای بکەومو تێی بگەیەنم، ئەوسا چاوی بڕییە (سام)و بە هێمنی لێی پرسی:

– تۆ نەوەکەی منی؟

(سام) قاقا پێکەنیو گوتی:

– نا.... وا نییە! وا نییە! باوەڕ ناکەم (رینی) ئەوەندە گۆڕابێ. جەنابت، منت بە بیر نایێ؟ ئەی من نەبووم تۆم بردە ناو ماڵی خۆم. لە بیرت نییە؟ چۆن لە بیرت نییە؟ منو تۆ زۆر برادەر بووین!

(بابا) وردە وردە شتەکانی بیر کەوتەوە. سەری لەقاندو دوو سێ جار داردەستەکەی لە زەوی داو بە پارێزەوە گوتی:

– (سام)، ئەوە (سام)ە!

– تەواوە!

(سام) هاواری کرد. نیشانەی ئەوە بوو زۆر بە قسەی (بابا) کەیفخۆش بووە.

- چۆنی؟ زۆر باشی. تۆ جێی بایەخ و خزمەتی هەموو......

بە پەرۆشەوە بووم ئەو ژوورە جێ بێڵم و بچمە ژووری (رینی) بۆ ئەوەی کە بە تەنیا بووم باوەشی پێدا بکەم و پڕ بە دڵ بە سینگی خۆمییەوە بقرسێنم. با بۆ یەك جاریش بێ. یەك جارو بەس، لەوە زیاترم ناوێ!! بەڵام هەستم کرد (سام) تەماشام دەکا. کە گەیشتمە بەردەرگا، سام رایگرتم و گوتی:

- خانم! تکایە بە خراپی تێم مەگە. من وام پێ باشە ماوەیەك واز لە (رینی) بێنی بۆ خۆی تەنیا بێ. لە کاتێکی لەبار، کە بۆ خۆی لەبار بێ، دێتە لات.

- دەزانم، دەزانم!

دانیشتم و چاوەڕێم کرد.

ئاخیری، دەرگای ژووری (رینی) کرایەوە و (رینی) هاتە لامانەوە. جلی گۆڕی بوو. جلێکی لەبەرکردبوو پێشتر لەبەرم نەدی بوو. دیم پیاوێکی تەواوە، هەندامێکی تەواوی هەیە.... هەر چەندە هێشتا گەنجێکی نەوجەوانە، بەڵام کەسێتییەکی بەهێزی هەیە. ئایا دەتوانم ئێستا چۆنە ئاوها بیناسم؟ باشە ئەگەر ئەمەم بۆ لوا، دەبێ بە چ شێوەیەك بیناسم؟

- باپیر، چۆنی؟

دەق وەکوو نەوەیەکی چینی، ڕووی تێکردو چوو لە بەردەمیا چۆکی داداو خۆی بە سەر ئەژنۆی داداو دەستی گرت.

(بابا) چاوی بڕییە دەموچاوی (رینی). مێشکی خۆی گوشی‌و بیری کردەوە:

- تۆ (جیرالد)ی کوڕمی؟

- نەخێر، من نەوەی تۆم.

هەردووکیان تەماشای دەمو چاوی یەکتریان کرد. دەق لەو کاتەدا هەستم کرد ئەو باپیرو نەوەیە چەند بە یەك دەچن. دەموچاوی (رینی)، لە سەردەمی گەورەیی‌و پیاوەتیدا، خەریك بوو سیمای سکۆتلەندی بە خۆیەوە دەگرت‌و لە سیمای چینی دوور دەکەوتەوە.

- نەوەی، من.....

(بابا) ئەمەی دووبارە کردەوە. ئینجا داهاتەوەو نێوچەوانی (رینی) ماچ کرد. قەت پێشتر نەمدی بوو، هیچ کەسێ ماچ بکا. ئەو ماچە کاری لە (رینی) کردو هەست‌و سۆزی جۆشاند، دەستی باپیری بڵند کردو لەسەر ڕوومەتی خۆی دانا.

- بەختەوەرم بە هاتنەوە ماڵێ.

(رینی) وایگوت‌و ئاوڕی لە من دایەوە. فرمێسکی لە چاو قەتیس مابوو. بێ ئەوەی بە شادی‌و بەختەوەری شەو ببەینە سەر. ئەو دوو گەنجە بچکۆڵانە بازوویان تێك هەڵکێشاو وەکوو کورسی (بابا)یان خستە سەرو هەڵیانگرت بردیانە نهۆمی خوارەوە. ئەویش لەگەڵ ئێمە لەسەر خوانی ئێوارە دانیشت. منیش، بۆ ئەوەی دانیشتنەکە خۆشتر بکەم، هەر ڕامکرد بۆ نهۆمی سەرەوەو فستانی سووری شەوبێریم لەبەر کرد کە لەوەتی لە (جیرالد) دابڕابووم، لەبەرم نەکردبوو. ئاخر شەو، لە (شەنگهای)، کە چووین لە ئوتێلی (ئەستوور) نانمان خواردو سەمامان کردو ڕامانبوارد، ئەم فستانە سوورەم لەبەر بوو. گۆنا لەسەر گۆنا

سەمامان کردو خۆمان لە بیر کرد. شەقامە پڕ ئاپۆڕەکانی دەرەوەی ئوتێلمان لە بیر نەمابوو. بڕیارمان دا بکەوینە ناو ئەم دەریا میوانە ئەوروپییانە کە لە ئوتێل کۆببوونەوە. خۆمان ئامادە کردبوو بە ڕێگای دەریادا بڕۆین و ئەو وڵاتە جێبێڵین کە خۆشمان دەویست بەڵام نەماندەتوانی تیا بمێنینەوە. من و (جیرالد) بێئەوەی لە بەینی خۆمانەوە، باس بکەین، دەمانزانی ئەو دەمێنێتەوەو دەبێ من بڕۆم. من تەواو دڵنیام دەبێ بڕۆم.

ئەو شەوە، لەحزەیەك هاتە سەرم فستانەکە دابکەنم، بەڵام زوو ئەو بیرەم لە مێشکم دەرکرد. هەرچی هەمەو هەرچی هی منە دەبێ ببێ بە بەشێ لەم ماڵەی ناو ئەم دۆڵەو ئەم وڵاتە. ئەم وڵاتەم، کە لەوە بەولاوە هیچ وڵاتی ترم نییە. بەم جۆرە کە بەم فستانە هاتمە خوارەوە، هەردوو گەنج لەبەرم هەستان و بە سەرسامی و حەپەساوی سەیریان کردم. لە پڕ لەبەردەمیانا وەکوو ژنێ دەرکەوتم، قەت بە خەیاڵیاندا نەدەهات شتی وا ببینن. هەستم کرد دڵم سەرشار بوو لە شادی کە (رینی) بە شێوەیەکی جیا لە شێوەی دایکی بمبینێ، بەڵکو لەمەودوا ترسی لە من بشکێ. بەش بە حاڵی (سام)یش، بە لامەوە گرنگ نییە.

(رینی)م لە سەرەوەی مێز دانا، خۆیشم بەرامبەری دانیشتم. (بابا)م لە نزیکمەوە لای دەستە ڕاستم دانا بۆ ئەوەی لە خواردن یارمەتی بدەم. شۆربای ناو فەخفوورییەکان گەرم بوو. فەخفوورییەکانم لە نیویۆرك کڕی بوو، چونکە بەو فەخفوورییانە دەچوون کە لە ماڵی (پەکین)م جێم هێشتوون.

دەستمان بە خواردن کرد. دیتم (رینی)، لە پڕ زەوقی کرایەوەو هەژدە هەژدە دەستی بە قسە کرد کەچی (سام) بێ دەنگ بوو. هەستم کرد وەختە لە شەرمان بتوێتەوە.

– (سام) فێری بەفرە خلیسکێ دەکەم.

ئەوسا (رینی) بەردەوام بوو:

– ماڵی لە ناوچەیەکی تەختو لە دەشتێکی پانو ڕاستانە، دەرفەتی بۆ هەڵنەکەوتووە لە قەد چیا بەفرە خلیسکێ بکا.

– کەرەستەی بەفرە خلیسکێ لەناو کۆگایە.

(سام) وەڵامی دایەوە گوتی:

– من نازانم لە چیا بێمە خوارەوە. شتی وا ئاسان نییە، ورەیەکی بەرزی دەوێ، من ورەی ئەم جۆرە کارەم نییە.

(رینی) وەڵامی دایەوە.

– تۆ ورەی هەموو شتێکت هەیە. ورەی لەوە زیاترت ناوێ کە ئەو ڕۆژە دیم بە فڕۆکە بچووکەکەت بە تیژی لە ئاسمان هاتیتە خوارەوە. تۆ ئەوەندەت بەسە بۆ ئەوەی لە ترۆپکی (ئەڤەریست)ەوە بە خلیسکانە بێیتە خوارێ.

– ئاخر خۆ من ئەو فڕۆکە لە پێ ناکەم!

زۆر بە ئیشتیا خواردنیان دەخوارد. وەکوو برسییەکی تامەزرۆ کەوتبوونە سەر خواردن. منیش بە دڵخۆشیو شادومانی سەیرم دەکردن. بەختەوەر بووم کە منیش میوانم هەیەو خواردنم لەگەڵ دەخۆن. پاش ئەوەی ئەو ماوە دوورو درێژە، ئەو هەموو شەوو ڕۆژە، هەر بە تەنیا لەسەر سفرە دادەنیشتم.

ئینجا (رینی) بزەیەکی بۆ کردمو گوتی:

- نەمدەزانی کابانێکی وا چاکی و خواردنی وا خۆش لێ دەنێی!
- ئەمە بۆنەیەکی تایبەتییە، زۆر پێوە ماندووبووم.

دوای ئەوەی (رینی) شەرمو پارێزی نەماو گەڕایەوە سەر سروشتی خۆی. یەك دوو کون قایشی پشتی شل کردەوەو هەوڵی دا من نەیبیینم وا دەکا، ئەوسا ڕایگەیاند:

- وابزانم هەموو ڕۆژێ شێوی وا چاکم دەست ناکەوێ بیخۆم.

(رینی) ڕەوشتی بەرزەو ئەو ڕەوشتبەرزییەی لەگەڵ ژیانیدایە. ئەو ڕەوشتەی لە بە ئەدەبترین و ڕەوشتبەرزترین مرۆڤی دونیا وەرگرتووە. هەر چەندە، دوای ڕۆیشتنی لە چین، هەوڵی دەدا وشك و برینگ بێ، بەڵام ئەو ڕەوشتەی لە ناخیدا بوو سەری هەڵدەدایەوەو بە سەریدا زاڵ دەبوو. هەمیشە وریاو بە پارێز بوو لە من.

کە لە خواردن بووینەوە، گوێمان لێ بوو لە دەرگەی حەوشە درا. لە سەر مێز کشاینەوە. لێ نەگەڕام بۆ پاك کردنەوەی مێزو شووشتنی هێربارەکان یارمەتیم بدەن. (سام) دەست پێشکەری کرد یارمەتیم بدا، پێمگوت پێویست ناکا پاشان وەختم زۆرە بۆ هێربار شووشتن. دووبارە، بە دووقۆڵی (بابا)یان هەڵگرت و لە ژووری دانیشتن لە تەنیشت سۆبا، لەسەر کورسییەك دایاننا. منیش لە بەرامبەریان دانیشتم (رینی)و (سام) قەنەفەی ساتان پۆشی زەردیان هەڵگرت و لەبەر سۆبە دایاننا. لەو کاتەدا بوو کە تەقەی دەرگا هات. (رینی) ڕووی تێ کردم و گوتی:

- بە تەمای کەس بێ؟!
- نەخێر. داخۆ ئەم میوانە کێ بێ بەم درەنگەی شەو!؟

(رینی) چوو دەرگای کردەوە. دیمان (بروس سبولدن) بوو، وەستابوو چەپکە گوڵێکی سووری بە دەستەوە بوو لە کاغەزی سلوڤان پێچرابوو. (رینی) چاوی تێبڕی. هەردووکیان باش یەکتریان دەناسی، بەڵام دەتگوت قەت یەکتریان نەدیوەو یەکتر ناناسن.

پاش ئەوەی هەردووکیان ماوەیەك ئاوها وەستانو چاویان بڕییە یەکتر، (رینی) گوتی:

– ئێمە کەسمان نەخۆش نییە!

هاوارم کرد:

– (رینی)، لە ڕێی خوا واز بێنە...

هەر ڕام کرد بۆ بەر دەرگاو چەپکە گوڵەکەم لە (بروس) وەرگرت.

– فەرموو! لێرە، لەبەر ئاگری سۆبە دانیشتووین!

هاتە ژوورەوە. (رینی)، بەبێ دەنگی تەماشای دەکردو متەقی لێوە نەدەهات. چەپکە گوڵەکەم لەناو ئینجانەیەکی کۆن دانا، لەوەتی منداڵ بووم، لە شوێنی خۆی لەسەر مێزەکە بوو. تا هاتمەوە کۆڕەکە، دیم (بابا) بە ئارامی خەوتووە. لە (بروس)م پرسی:

– پێویست دەکا بیبەینەوە ژووری خۆی؟!

– دیارە لەم دانیشتنەی ئارخەیانە. باوەڕ ناکەم لەوە ئارخەیانتر بێ.

ئیتر دانیشتین. (رینی)، بەبێ دەنگی، لە بەینی دوو پیاوەکە دانیشت. هەستم کرد جاروبار بە دزی سەرنجێکی لێ دەدام. هەموو گیانم شادیو بەختەوەری بوو. لەمێژ بوو هەستم بە شتی وا نەکردبوو. پاش نەختێ، هەموو دەستمان بە قسە کرد. (بروس) حەزی لە شەراب نەبوو، هەستا هەندێ قاوەی بۆ خۆی لێ نا. (رینی) شووشە شەرابێکی لەماڵەوە هەبوو، هێنایو لەگەڵ (سام) بەشی کرد، کەچی من هیچم

نەخواردەوە. هەر یەکە گەڕاینەوە سەر کورسی خۆمان‌و دەستمان بە قسە کردەوە. قسە بە دەورەیەکی سێ ئەڵقەیی لە بەینی من‌و دوو پیاوەکە دەسووڕایەوە، کەچی (رینی) بێدەنگ بوو. گوێی دابووە قسەکانی ئێمە. لەم شەوبێرییەدا، ئەوەم بە مێشکدا دەهات کە بە ڕاستی ئەم وڵاتە وڵاتی منە. جێگای سروشتی من ئێرەیە. لێرە لە دایك بووم‌و بەو خاکە بەسراومەتەوە. ئەگەر لەو گۆشەگیرییە دەربچم، بۆی هەیە (پەکین)و ئینجا (جیرالد) لە بیر بکەم. ماوەیەکی زۆر بوو نەمدەزانی پێکەنین چییە، بەڵام ئەو شەوە، هەر پێدەکەنیم‌و پێدەکەنیم. بەو سێ پیاوە پێدەکەنیم. هەر یەکە هەوڵی دەدا بە شێوازی تایبەتی خۆی سەرنجی من بۆ خۆی ڕابکێشێ. ئەمە (سام)ە لە زبری‌و پیاوەتیدا وەکوو خەڵکی ڕۆژئاوا وایە. ئەوەیش (بروس)ە، وریاو زیتە. سێیەمیش (رینی)یە، دوور لە زۆرانبازی، لە بەینی ئەو دووانە، وەستاوە، تەماشا دەکاو بیر دەکاتەوە. قسە قسەی ڕاکێشا، هەموو مەبەستیان ئەوە بوو، من گوێم لە قسەکان بێ، زیاتر قسەکەیان بۆ من بوو، تا بۆ بەرامبەرەکەیان. هەر یەکە لە دوو زۆرانبازەکە چی لە توانایدا هەبوو، لەبەردەمی مندا هەڵی دەڕشت.

(سام) بەم جۆرە ڕای خۆی لە بارەی (شۆڕش)ەوە دەربڕی، گوتی:

- شۆڕش شتێکی حەتمییە. پێشکەوتن بەوە نابێ وەکوو چەقچەقۆك سەر کز بکەین‌و خۆمان بە زەوییەوە بنووسێنین، بەڵکو بەوە دەبێ وەکوو مار بۆی دەربچین‌و بگۆڕێین‌و کاژی بەرمان فڕێ بدەین‌و بە شێوەیەکی تازە بێینە دەرەوە.

سەرم سوڕما کە دیم قسە دەکا بێئەوەی زاراوەی زبری خەڵکی ڕۆژئاوا لە قسە بە کار بێنێ. ئەو شێوەزارە لە ژێر شێوەزاری نوێی

کابرادا بزر ببوو. هەستم کرد ئەم کابرایەم وەکوو ڕاستەقینەی خۆی نەناسیوە. (بروس)یش بە هێواشی، بەلام بە توندی قومی لە پایپەکەی دەداو دووکەڵی بەئەڵقەی بازنەیی لە لووتی باریکی دەهێنایەوە، گوتی:

– هیچ شۆڕشێك لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نەگەیشتۆتە کۆتایی ڕێگا، ئاخیری لە ئاژاوەو بازەڵی خۆیدا نووچی داوەو دەوسی لە ناو ململانەی کاربەدەستە خراپە کاندا بزر بووە.

سام بە سووربوونو پێداگرتنەوە وەلامی دایەوە:

– تۆ ناتوانی لێپرسینەوەی ئەم ڕووداوانە بخەیتە ئەستۆی شۆڕش. شیانو ئَریمانە سنووری خۆی هەیەو تەقینەوەش شتێکی حەتمییەو هەر دەبێ ڕوو بدا. بۆ نموونە چین وەربگرە.

لەگەڵ دوا بڕگەی قسەکەیدا، تەماشای منی کرد. هەستم کرد بای ئاسیا، لە ژووری گەرمو پەنجەرە داخراوەکەمدا هەڵی کرد. هەستم کرد ئەو بایە دووبارە بەرەو دەریا هەڵمدەگرێ. خۆم توند کردو ڕازی نەبووم ملی بۆ کەچ بکەم. گوتم:

– با باسی چین نەکەین. بە هیچ جۆرێ لێی نەدوێین.

وام گوت بۆ ئەوەی ڕێگای گەڕانەوە سەر ئەو بابەتەیان لێ بگرم. (رینی) ئاگری سۆبەی بە کووڵەوژ تێك دەدا. لەپڕ کووڵەوژەکەی لە دەست بەربووەوە سەر زەویو ئاوڕی لە من دایەوەو چاوی بڕییە چاوم. هەستم بە هەڵەی خۆم کرد کە باسی هەموو شتێکم بۆ نەکردبوو.

لەوە بە دواوە، دانیشتنەکە گەرموگوڕی تێدا نەماو چیدی گوێم نەدایە گفتوگۆی بەینی دوو پیاوەکە. کەچی ئەوان، لە مشتومڕی خۆیان بەردەوام بوونو چاویان هەر لای من بوو. وەك ئەوەی بیانەوێ بە چاو سەرنجی من ڕابکێشن، بەلام من نەمدەتوانی گوێیان لێ بگرم....

من بیرم لەوە دەکردەوە بە چ شێوەیەك قسە لەگەڵ (رینی) بکەمو باسی باوکی بۆ بکەم؟

*   *   *

# (٣١)

که شەوبێری تەواو بوو، بە دەنگی بەرز بە (رینی)م گوت و ویستم شادو ئاسایی بێ:

- (رینی)، وەرە بچینە ژووری من. تا ئێستا دەرفەتمان نەبووە بە تەنیا دابنیشین و قسە بکەین. با سۆبە داگیرسێنین و نەختێ بە یەکەوە دابنیشین.

تا بەر دەرگای حەوشە، (بروس)مان بە رێ کردو لای پلیکانە هیوای شەوێکی هێمن و خۆشمان بۆ سام خواست. کە (بروس)م بە رێ کرد، هەستم کرد ماوەیەکی زیاتر لە چاك و چۆنی دەستی گرتم بەلام من هەر ئەوەندەم توانی زۆر بە هێمنی پێم گوت: (سوپاس بۆ چەپکە گوڵە سوورەکەت!)

- گوڵ تۆم بیر دەخاتەوە، یان تۆ گوڵم بیر دەخەیتەوە.

بە دەنگێکی نزم وای گوت. چاوەڕێی قسەی وام لێ نەدەکرد. نەمتوانی وەڵامی ئەم قسەیەی بدەمەوە ئەگەر بە بزەیەکی دەستکردیش بێ. من بە شتێکی گەورەترو خەتەرترەوە خەریك بووم. هەستم بە لێدانی دڵی خۆم دەکرد لەناو قەفەسی سینگم. بیرم دەکرەوە چۆن

باشترین ڕێگە بدۆزمەوە بتوانم هەموو شتێ بە ئاشکرا بۆ (ڕینی) باس بکەم‌و شتێکی وا نەکەم ڕقی لە باوکی ببێتەوە!

بە (ڕینی)م گوت:

– دانیشە، (ڕینی)!

ئینجا لە سەر کورسی بەرگ قەدیفە سوور دانیشتم. ئەو کورسییە کاتی خۆی هی داپیرەم بوو. ئەویش داری سۆبەی داگیرساندو گەرمایی ئاگرەکە بە ژوورەوەدا بڵاوبووەوە. ئینجا هات لەسەر کورسی بەرامبەر من دانیشت. ئەوسا دەستم بە قسە کردو گوتم:

– من هەرگیز تۆم بەو جۆرە نەدیوە.

بە ڕاستیش هەرگیز بەم جۆرەم نەدی بوو. دەم‌وچاوی، سیماو خڕێتی منداڵانەی پێوە نەمابوو. ئێسکی گۆنای پان‌و پتەو بوو. وامدەزانی ئەمە پیاوێکی بێگانەیە لە بەرامبەرم دانیشتووەو لە ئەسپانیاوە، لە ئیتاڵیاوە، لە بەرازیلەوە، لە باکوری هیندەوە هاتووە. لەگەڵ ئەوەشدا، کوڕی تاقانەی خۆمە. پێم گوت:

– پێم بڵێ، لە کۆلێجەکەتدا، چ شتێکت لە هەموو شتێ بەلاوە خۆشتر بوو.

– ژمارە، ژمارەو مۆسیقا.

کاتی خۆی کە باسی چیرۆکی ژیانی خۆم بۆ (ڕینی) کرد، لە بیرم نەبوو پێی بڵێم من کاتی خۆی حەزم لە مۆسیقا دەکرد. ڕەنگە ئەمە باشترین شت بێ لە منەوە بۆی ماوەتەوە. من بە گەنجی، ڕۆژێ چەند سەعات لە هۆڵی خوارەوە لەبەردەم پیانۆ دادەنیشتم. ئەمە لەسەردەمی گەنجێتیم بوو، کە هێشتا لە وڵات نەڕۆیشتبووم. پاشان کە هاتمەوە وڵات‌و ماڵی خۆم، جارێکی تر نەگەڕامەوە سەر پیانۆ لێدان. ئەو کاتە

لەسەر لێواری ئەو هەڵدێرە دەژیام کە من و (جیراڵد)ی لێك دابڕاندبوو، ئیتر نەمدەتوانی جارێکی تر گوێ لە مۆسیقا بگرم. بەڵام ئەمە لەمپەر نەبوو لە ڕێگای (ڕینی) کە هەر کاتێ بیەوێ مۆسیقا لێبدا.

– هەماهەنگییەکە لە جێی خۆیەتی، (ڕینی).... کونفوشیوس لای وایە ئەم هەماهەنگییە شتێکی پێویستە بۆ مرۆڤو شارستانێتی. مرۆڤ بەرزە، مرۆڤی باڵادەست دەبێ هەموو شتێ لەبارەی ژمارەو مۆسیقاوە بزانێ.

– ئەمانە، بە ڕاستی هەردووکیان بە یەکەوە لکاون، لە بارەی نرخاندن و لە داتاشینەوە وەکوو یەك وان.

زانیم ئەقڵیشی وەکوو جەستەی گەشەی کردووە. زیاتر ترسام. ئینجا لێم پرسی:

– ئایا بە تەمای لە ژیانتا پشت بە مۆسیقا ببەستی؟

– من دەمەوێ ببم بە زانا. زانست ڕاستیو ئەنجامگیری بە یەکەوە دەبەستێتەوە.

– باوکت ئەمەی زۆر بە لاوە خۆش دەبێ.

(ڕینی) هیچ وەڵامی ئەم قسەی نەدامەوە. هەموو جارێ کە باسی باوکی دێ خۆی کڕ دەکا، ئیجا لێم پرسی:

– ئەی خوشکی جورج بووین؟

مەبەستم ئەوە بوو تیخ تیخەی بدەمو بە قسەی بێنم، بەڵام دیار بوو سوودی نەبوو. چونکە من، کەمو زۆر، خوشکی (جورج بووین)م بە لاوە گرنگ نەبوو.

(ڕینی) ئەو ماندووبوونەوەی نەدایە بەر خۆی تەماشام بکا. هەر چاوی بڕیبووە ئاگری سۆبا، گوتی:

– خوشکی (جورج بووین) چییە؟

- ئایا کچێکی جوانە؟

- وا نییە لە ڕادەبەدەر جوان بێ، بەڵام جوانە!

- سیسە، یان ڕەش ئەسمەرە؟ کورتە، یان باڵابەرزە؟

- سیس‌و باڵابەرزو هێمنە.

- لە من ناکا....

ئاوڕی لێدامەوەو سەرنجێکی خێرای لێدام. لە مێشکی خۆیدا، منی لەگەڵ وێنەی کچەکە بەراورد کرد. دووبارە چاوی بڕییەوە ئاگرەکەو گوتی:

- نەخێر.

- زۆرت بە دڵە، (رینی)؟

- نازانم. ناشمەوێ بزانم. چونکە نامەوێ جارێکی تر تووشی شکست ببم.

- کاتێکی زۆرت لەبەر دەمدایە.

- بەڵێ.

دووبارە بێدەنگیی باڵی بەسەردا کێشاین. بڕیارم دا سستی نەنوێنم‌و پاشەکشە نەکەم.

- (رینی)، دەمەوێ باسی باوکتت بۆ بکەم.

ئەوسا سەری بڵند کردو بێ دەستی خۆی هەستی لێ ڕاگرتم.

- نامەی بۆ ناردووی؟

- بەم زووانە نا.... نامەکەی ئەم دواییە هی ئەو نەبوو. بەڵام ئەو کاتی خۆی نامەیەکی بۆ ناردووم. نامەکە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

- ئەی بۆچی کە نامەکەت بۆ هات، پێت نەگوتم؟

– ئاخر ئەو کاتە تۆ بچووك بووی، لە ناوەڕۆکەکەی نەدەگەیشتی. ئەگەر نامەکەم پیشان دابای، سەرزەنشتت دەکرد.

– چی کردووە؟

– نەختێ بوەستە. هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەکەمەوە.

ئیتر دەستم پێکرد هەموو شتێکم، لە سەرەتاوە تا کۆتایی، بۆ گێڕایەوە. بۆم باس کرد چۆن یەکترمان ناسیو چۆن یەکترمان خۆشویست، بەڵام باسی یەکەم شەوم بۆ نەکرد کە بە یەکەوە بووین. ئەمە شتێکی تایبەتییە تەنیا بە خۆمو بە (جیرالد). بیرەوەرییەکە لە ئازیزترین شوێنی دڵمان دەیپارێزین. ئینجا باسی ئەو ڕۆژانەم بۆ کرد کە لە (پەکین) بووین، باسی ئەو ساڵانەم بۆ کرد کە خۆشەویستیمان تێدا گەشەی کردو چەسپا. ئەو خۆشەویستییەی لە دۆڵی (ڤیرمۆنت)ەوە چەکەرەی کردو لە ژیانێکی زۆر پاكو بێگەردو ڕێكو تەبا گەشەی کردو گوڕی سەندو ڕەگی داکوتا.

– (رینی)، ئەم جۆرە خۆشەویستییەو ئەم جۆرە زەماوەندە، زۆر نییە. کاتی خۆی دایکم پێی گوتم ئەگەر شوو بە (جیرالد) بکەم، خێر لە خۆم نابینم. بەڵام بۆچوونەکەی هەڵەبوو. من بەختەوەر بووم کە شووم بە (جیرالد) کردو ئەویش بەختەوەر بوو کە منی هێنا. ڕەگەزی جیاو نەژادی لە یەك دوور کاری لە تەبایيو بەختەوەریمان نەکرد. بگرە، ڕاستیت دەوێ، ئەو جیاوازییە خۆشەویستییەکەی توندو پتەو کردین. لە بیرمە هەندێجار لەم بارەیەوە قسەم لەگەڵ باوکت دەکردو لە بیرمە باوکت دەیگوت زەماوەندەکەمان زەماوەندێکی تەواوە!! هەردووکمان هەستمان دەکرد پاراستنی ئەو خۆشەویستییە تەنیا لەسەر شانی

خۆمانە، لە بەر ئەوەی باوکو باپیرانمان دانیان بەم جۆرە خۆشەویستییە نەدەنا. (رینی) خێرا هەڵیدایێ و گوتی:

– ئەوە دەتەوێ باسی چیم بۆ بکەی؟

– دەمەوێ بۆت باس بکەم ئەوەی لە بەینی منو باوکت ڕووی داوە، ئەنجامی هەڵەیەکی من، یان هەڵەیەکی باوکت نەبووە. ئەگەر دونیا دابەشی دوو بلۆك نەبوایە، ئێمە ئێستا بە بەختەوەری لە ماڵی خۆمان دەژیاین لە (پەکین).

– باشە چ شتێ ڕێگای لێ گرتن؟

– خۆت دەزانی. خۆت هۆکەی زۆر باش دەزانی. پێویست ناکا لە من بپرسی. هۆکەی منم. چونکە من ئەمریکیمو باوکیشت نیمچە ئەمریکییە. ئەو دابەش کردنەی دونیا بوو ئێمەی لێك دابڕاند. ڕێك وەکوو ئەوەی شەپۆلی بەرز شاڵاو بۆ کەنار دێنێو هەرچی تیا بێ ڕایدەماڵێ.

– دەیتوانی چین جێبێڵێ؟

– نا، نەیدەتوانی.

– بۆچی نەیدەتوانی؟

لە گرژبوونی دەموچاوی تێگەیشتم لە باوکی توورەیە.

– من بەرگری لە بۆچوونی (ئەو) دەکەم چونکە خۆی لە کنمان نییە باسی خۆی بکا. سەرەڕای ئەمەیش، تۆ ئەگەر دەتەوێ گلەیی لە یەکێ بکەی، برۆ گلەیی لە باپیرت بکە کە چوو داپیرەی چینی تۆی هێنا بێئەوەی یەکتریان خۆش بوێ. یەکەم گوناه ئەو کارە بوو ئەو کردی.

ئەوسا هەستام چووم وێنەی داپیرەیم هێناو بۆم باس کرد. باسی چیرۆکی (هان ئای – لان)م بۆ کرد وەکوو ڕووداوێك لە ڕووداوەکانی وڵاتەکەی‌و بگرە لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەی تیا دەژین.

– ئەو ژنە کە دەیزانی مێردەکەی خۆشی ناوێ، لە باتی ئەوەی ژیانی خۆی دەقەبەر مێردەکەی بکا، پێشکەش بە نیشتیمانەکەی کردو ژیانی خۆی کردە قوربانی بیروباوەڕەکەی‌و پێی وا بوو ئەمە ئەرکی خۆیەتی بەرامبەر بە نیشتیمانەکەی. بەرهەمی تاڵی ئەم هەڵوێستەی بۆ کوڕەکەی مایەوە – کە (جیرالد)ی باوکتە، (رینی)....) ئێستا ئەوەتا تۆیش بەم دەردەوە دەتلێیتەوە.

– ئایا باپیرەمی خۆش دەویست؟

– من دڵنیام خۆشی دەویست، چونکە ئەگەر خۆشی نەویستایە ئەو ڕێگایەی نەدەگرتە بەر کە بۆم باس کردی. نەیدەویست خۆشی بوێ، بەڵام بە دەست خۆی نەبوو خۆشی دەویست‌و باپیرەت ئەو خۆشەویستییەی ڕەت کردەوەو بایەخی پێ نەدا. لەم دونیایەدا هیچ شتێ لەوە ناخۆشتر نییە خۆشەویستیت ڕەت بکرێتەوە.

(ڕینی) زۆر بە سەختی‌و دڕندەیی وەڵامی دامەوە:

– باوکیشم ئاوها بەم جۆرە بوو تۆی جێ هێشت.

نکووڵیم لە شتەکە کردو بە هەموو دڵەوە بەر بەرچم دایەوە:

– باوکت منی جێنەهێشتووە. مادەم ئێمە یەکترمان خۆش دەوێ، ناتوانێ جێم بێڵێ. ئێستایش خۆشەویستیمان لە دڵدا دەجۆشێ‌و ئاگری سینگمان دادەمرکێنێتەوە.

لەو ساتەدا، (رینی) بە ژنێکی تری جگە لە دایکی خۆی لە من گەیشت. دیتی ژنێکم شەیدای خۆشەویستی مێردەکەمم. بەڵام

نەیتوانی، هیچ وەڵامم بداتەوە. تا ئەوسا هیچ ژنێکی نەدی بوو بە ئاگری خۆشەویستی بسووتێ.

چاوی لە سەر لابردم.

– ئێستا کاتی ئەوەیە نامەکەت نیشان بدەم.

چووم‌ە لای سندووقە داخراوەکە، کردمەوەو نامەکەم لێ دەرهێنا کە بە مۆم مۆر کرابووو نامە دەستی. نامەکەی کردەوەو خوێندییەوە. گەڕامەوە سەر کورسی خۆم‌و دانیشتم چاوەڕێم کرد. کە نامەکەی تەواو کرد، دیتم دووبارە خوێندییەوە. هەستم کرد بیر لە وشە بە وشەی دەکاتەوە. کە لێ بووەوە، لەناو زەرفەکەی نایەوەو لەسەر مێزی تەنیشت خۆی دانا و گوتی:

– سوپاس، دایکە!

پێم گوتی:

– ڕەزامەندیم بۆ ژنە چینییەکە ناردو پێم گوت من لە هەموو شتێ دەگەم‌و دەمەوێ (ئەو) لەماڵی خۆی ئارخەیان بێ.... ئەو نامانەشت نیشان دەدەم کە ژنەکە بۆی ناردووم.

نامەکانی (مای – لان)م دایێ. هەمووی خوێندەوە بێ ئەوەی هیچ هەستێکی دڵی لە دەم‌وچاوی ڕەنگ بداتەوە. کە لە خوێندنەوەی نامەکان بووەوە، دانییەوە من‌و گوتی:

– ئەمە پەیوەندی بە منەوە نییە. تێشناگەم هۆی چییە ڕێی داوە ئەو ژنە بچێتە ماڵەکەیەوە.

کە وای گوت دەنگی ئەوەندە وشک‌و زبر بوو، نەمتوانی بەرگەی بگرم، پێم گوت:

– ئێمە نازانین ئەو لەوێ بە ڕاستی لە چ هەلوێستێکدایەو ئاخۆ تا چ ڕادەیەك ناچار کراوە شتی وا بکا مادەم لە (پەکین) بژی، نەك لە شوێنی تر.

– ئاخ! بەلام من هەر لە سەر ڕای خۆمم، دەپرسم: مادەم ئێمەی خۆش دەوێ، ئەیا هۆی چییە لە چین ماوەتەوە؟ تا وەلامەکەم بۆ دەرنەکەوێ، من هەر لەسەر ئەم پرسیارەی خۆم دەبم.

– تۆ باوکی خۆت تا ئەو ڕادەیە خۆش ناوێ بتوانی لە هەلس وکەوتەکانی ببووری.

– ڕەنگە لەوەدا هەقی تۆ بێ!

ئینجا لەپڕ لەسەر کورسییەکەی هەستاو ڕووی کردە پەنجەرەو لەوێ وەستاو چاوی بڕییە تاریکایی شەو. ئەوسا ئاوڕی لێ دامەوەو گوتی:

– دایکە، منیش بە لای خۆمەوە قسەیەکم هەی دەمەوێ پێت بلێم. ئایا دەزانی مەسەلەی (ئیلیگرا) خەریك بوو وام لێ بکا بگەڕێمەوە (پەکین)؟ بیرم کردەوە، مادەم بە هۆی داپیرەی چینییمەوە وام بە سەر هات و ڕەت کرامەوە، وا باشترە بگەڕێمەوە بۆ چین. بەلام تازە هەرگیزاو هەرگیز ناچمەوە ئەو ولاتە. لێرە لای تۆ دەمێنمەوە. ئەم ولاتە نیشتیمانمەو لەوە زیاتر هیچ نیشتیمانی ترم نییەو نابێ.

– ئاخ (رینی)!! (رینی)، وا زوو بڕیار مەدە! و ئەم تۆمەتە مەدە پال باوکت!

– من بەو بڕیارەی داومە مەبەستم ئەو نییە. من بۆ خاتری تۆ ئەم بڕیارەم داوە.....

وای گوت و داهاتەوە ماچێکی لێ کردم و چووە دەرەوە.

وازم لیّ هیّنا بڕواو بە دوایدا نەچووم. من لە هەموو کەس باشتر کوڕی خۆم دەناسم. ئەم بڕیارەی زادەی ئەو ساڵە نەبوو. بە ڕاستی، ئازاری دەخواردو حەیرمابوو لەم دوو وڵاتە کامیان هەڵبژێریّ: ئایا وڵاتی باوکی هەڵبژێریّ؟ یان وڵاتی دایکی؟ ئاخ (جیرالد) لیّم ببوورە! لە خوا دەپاڕێمەوە مندالّی ترت پیّببەخشیّ. پڕبە دلّ ئەو دوعایەت بۆ دەکەم. ڕاستە من کوڕە تاقانەکەمانم لیّ سەندووی. بەلاّم چارم ناچار بوو. (ڕینی) خۆی، بە پیّی مافی چارەنووسی خۆی، ئەم بڕیارەی داوە. لەمەدا لە من کەمتر نییە کە بڕیارم دا لەگەڵ تۆ بێمە (پەکین)، لە تۆیش کەمتر نییە کە بڕیارت دا لەویّ بمێنیتەوەو لەگەڵ ئێمە نەیەی. بەڵیّ ئەمە نیشتیمانی ئێمەیەو دوا دالّدەمانە لە دۆڵی (ڤیرمونت)، لەناو ئەم چیایانەر لە ماڵی باوكو باپیرانم.

لەسەر کورسی خۆمو لەبەر ئاگرەکە دانیشتبووم کە وردە وردە کزبووو دامردەوە. هەستم کرد مۆتەکەیەکی قورسم لەسەر سینگ لاکەوت. ئیتر لە نیشتمانەکەمدا تەنیا نیم. کوڕەکەیشم لێرە، لە نیشتمانی خۆی، لەگەل منایەو ڕۆژێ دێ هەست بە بەختەوەری دەکەمو شادیو خۆشیم بۆ دەگەڕێتەوە.

* * *

# (٣٢)

لەگەڵ هەموو ئەو ڕووداوانەیش، هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتووە هەموو پەیوەندییەك لەگەڵ (جیرالد) ببڕم. لەو شەوە خۆشەوە کە جەژنی سەری ساڵ ڕامانبوارد تا ئێستا چەند مانگێکی پێ چووە. ساڵی خوێندن لە تەواوبووندایە. لەو ماوەیەدا، (سام) دوو جار هاتۆتە سەردانم. هانی دەدام داوای جیابوونەوە لە (جیرالد) بکەم. ئەمڕۆ، بە فڕۆکە لە نیۆیۆرکەوە هات، خۆی گوتەنی بۆ ئەوەی تەنیا یەك سەعات لێرە بمێنێتەوە.

ئێستاش ئەوە خەریکە شەو دادێ و نازانم ئەمڕۆ چۆن کۆتایی دێ. برووسکەیەکمان بۆ (رینی) کردووە بۆ ئەوەی بە هۆی ئەم ڕووداوەوە، بێتەوە. ڕووداوەکە ئەمڕۆ بەیانی ڕووی دا. کاتێ (سام) سەبری نەمابوو، بە تووڕەیی قسەی لەگەڵ دەکردم.

– تۆ دەبێ داوای جیابوونەوە لەو پیاوەی (پەکین) بکەی........ تازە مێردی تۆ نییە، ئیلیزابێت!

– بە هەر حاڵ، من قەت داوای جیابوونەوە لە (جیرالد) ناکەم. ڕاستت دەوێ هیچ هۆیەکم بە دەستەوە نییە داوای شتی وای لێ بکەم. ئەو منی خۆش دەوێ.

- ڕاستە، ئەگەر جێهێشتن بە خۆشەویستی بزانی.
- ئەو منی جێنەهێشتووە.
- ئەگەر ئەمە جێهێشتن نەبێ، ئەدی چی ناو دەنێی؟

بێ گومان، (سام) هەموو چیرۆکەکە نازانێ. ئەوەی دەیڵێ هەمووی لە مەزەندەو تەخمینەوە هاتووە. هیچ باسێکی منو (جیرالد)ی بۆ نەکراوە. ویستم مەسەلەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە، بێئەوەی بنجو بناوانی بۆ ئاشکرا بکەم.

- (جیرالد) منی جێ نەهێشتووە. منیش ئەوم جێ نەهێشتووە. مێژوو لە یەکی دابڕاندووین. مێژوو بە ڕووداوی ئێستاو ڕابردوویەوە.

سام بە جەختو پێداگرتنەوە وەڵامی دامەوە:

- باوکی ئەمریکییە. ئەگەر بیویستایە، دەیتوانی لەگەڵ ئێوە بێتەوە ئێرە، بێنەوە نیشتیمانی خۆی.
- بەڵام خۆت دەزانی ئێرە نیشتمانی خۆی نییە!
- ئەی خوایە، خۆ پیاوێکی ساویلکە نییە! دەیتوانی چی دەیەوێ بۆ خۆی بڕیای لەسەر بدا. چۆن لە (پەکین) ئیشێکی لە زانکۆیەك دۆزییەوە، دەیتوانی ئاوهاش لێرە ئیشێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە.
- نیشتمان شتێکە پەیوەندی بە دڵەوە هەیەو تایبەتە بە ڕۆح! ئەگەر بهاتایەتە ئێرە ڕۆحی دەڕۆیشتو دڵی نەدەما.
- تۆ ئێستایش لەسەر خۆشەویستی خۆت ماوی بەرامبەر بەو....

(سام) وای گوتو سەرنجێکی توندی لێدام، نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە....

ئینجا هاواری کرد:

- تێناگەی؟! من دەمەوێ زەماوەندت لەگەڵ بکەم.

- ئۆی..... نا.... (سام)..... نا ....... نا!

- با...... با.......

هەردووکمان بەرامبەر یەکتر وەستابووین، هەناسەمان ڕاگرتبوو. چاوی تێبڕیبووم.... لەپڕ داهاتەوە سەرم، پاڵم پێوەنا و لە خۆمم دوور خستەوە.

- وا مەکە....

- رقت لە من دەبێتەوە؟

- نا... ئەمە رق نییە.

دەق لەو کاتەدا، گوێمان لێ بوو (بابا) لە ژووری سەرەوە بەربووەوە. گوێمان لێ بوو یەکەم جار داردەستێك بە زەوی کەوت و ئینجا جەستەیەك بەربووەوە سەر عەردی ژوورەکەو ناڵەیەکی کزو ناخۆش هات. بە بازدان بە سەر پلیکانە کەوتم و (سام) بە دوومدا هات. گەیشتینە ژووری (بابا)، دیمان لەسەر زەوی ڕاکشاوە. ئاخۆ دەبێ گوێی لێمان بووبێ و گفتوگۆی نێوان من و (سام)ی بیستبێ؟ نەماندەزانی گوێی لە چییەو گوێی لە چ نییە. کە قسەمان لەگەڵ دەکرد، دەنگمان بەرز دەکردەوە. لەوانەیە بە نیازی هاتنە نهۆمی خوارەوە لەسەر کورسییەکەی هەستا بێ. هەر چەندە لە شەوبێرییەکەی سەری ساڵەوە، لە ژووری خۆی نەچووبووە دەرەوە. دیمان لەسەر عەردی ژوورەوە ڕاکشابوو. سەری بە بەردی ئاگردان کەوتبوو و گیانی سپاردبوو.

# (٣٣)

جەنازەی (بابا)مان ناشتو هاتینەوە. (بروس سبولدن) ڕۆیشت بەڵام (سام) لەگەڵ ئەو نەڕۆیشت. خۆی دایە پاشو مایەوە. لە باتی من سەرپەرشتی کاروباری جەنازەکەو خێرو تازیەی لە ئەستۆ گرت. ئەگەر بمتوانیایە خۆڵەمێشی جەنازەی (بابا)م بۆ (پەکین)و بۆ (جیرالد) دەنارد. ڕاستە، شتی وا دەبوو. ئەمەیان بۆ زۆر کەس کرد بوو کە ڕۆژگار لە نیشتمانو کەسو کاری خۆیان دابڕاندبوونو لێرە مردبوون. بەڵام ئەوان زۆر دڵیان بە نیشتمانی خۆیانەوە بوو! لە هەموو شوێنێکی دونیا خۆشتریان دەویست! کەچی لە نیشتمانی خۆیان سوڕ گوم کرابوون.... بەڵام من کە بیر لەم شتانە دەکەمەوە، بیرم دەکەوێتەوە (بابا) بە کەیفی دڵی خۆیو بەو پەڕی ئارەزووی خۆی (پەکین)ی جێهێشتو خۆڵەمێشی جەنازەکەی ڕێ نادا لەوێ بینێژن، چونکە ئەو سەر بە چینی کۆن بوو.... چینی کۆنفۆشیۆسو ئیمپراتۆرەکان....

بۆیە بە (رینی)م گوت:

– با جەنازەی (بابا) لێرە، لای خۆمان بنێژین.

وەڵامی دایەوە:

- باشە، با لای خۆمان بێ.....

(رینی) کاتێکی وا گەیشت بە ناشتنی جەنازەکە ڕاگەیشت. بە تەنیا نەهاتبوو. کچێکی سیسی باڵابەرزی هێمنو ئارامی لەگەڵ هاتبوو، هەموو هەڵس‌وکەوتێکی ناسكو نازدار بوو. بە منی ناساندو گوتی:

- ئەمە (ماری بووین)ە.

سەیر کە... پێشتر ناوی تۆم نەبیستبوو.

لەپڕ هەستم کرد حەز دەکەم ماچی بکەم. داهاتمەوە سەری‌و گۆنای نەرمو لووسم ماچ کرد.

- کە تۆ دەبینم وا هەست دەکەم بە ڕاستی (ماری)ت.

بە بزەیەکەوە گوتی:

- منیش ماریای خاس‌و جوانم.

کەواتە (رینی) بەختەوەرە چونکە بە دەگمەن وا دەبێ کچێ ئەم دوو سیفەتەی تێدا بێ. ئەمانە دوو عاشقن‌و حەز لێك دەکەن. ئەمەم زۆر بە لاوە ئاشکرایە. من لە هەموو کەس باشتر لە شتی وا دەزانم. کە لە مەسەلەکە دڵنیا بووم، هەستم بە دڵخۆشی کرد. ئینجا دەستی هەردووکیانم گرتو بە پلیکانەدا چووینە سەلال بۆ ئەو ژوورەی (بابا) لێ ڕاکشا بوو و کەوای شینی چینی لە خۆی لوول دابوو.

کە چووینە ژوورەوە، (ماری) بە تەنیا چووە پێش‌و ڕاوەستاو لێی وردبووەوە.

- چەند جوانە!....

ئینجا ئاوڕی لە (رینی) دایەوەو بە چرپە گوتی:

- تۆ پێت نەگوتم ئەوەندە نازدارە!....

پێمگوت:

- بە ڕاستی ئەدگارێکی جوانی هەیە. ئێستا لەو کاتە جوانترە کە زیندوو بوو.

- خۆزگە گوێم لە قسەی بوایە!

ئینجا چووە لای (رینی)و دەستی گرتو لەسەر ڕوومەتی خۆی دانا. ڕێك لەو کاتەدا خۆشەویستی (ماریا)م وەکو کچی خۆم کەوتە دڵ.

دوای نیوەڕۆ، چەند دراوسێیەکی کەم لەگەڵمان هاتنە داوێنی چیا بۆ ژێر دارسنۆبەرەکەی پشت ماڵانو لەوێ (بابا)مان بە خاك سپارد. بەیانییەکەی (مات)، لە گۆڕهەڵکەندندا، یارمەتی داینو ژنەکەیشی، کە لەسەر قەبرستان هاتینەوە، لە ئامادەکردنی کولیچەو بابۆڵەو چاو قاوە یارمەتی داین. ڕۆژێکی کپو هێمن بوو. ئاسمان ساف بوو. قەشە هەندێ پارچەی لە ئینجیل خوێندەوە. من پێم گوتبوو ئەوانە بخوێنێتەوە چونکە (بابا) کاتی خۆی بۆی باس کردبووم ئەو پارچانە لە هەندێ پەندو ئامۆژگاری ئاسیاوە نزیکنو لەوانەیە هەندێ قسەی نەستەقی کۆنفۆسیۆش بن، چونکە (بابا) گوتەنی: ماقووڵ نییە مەسیح هەمان شت بڵێ کە پێشتر کونفۆسیۆشو بوودا گوتوویانە. ئەوەیش هەیە دەڵێن مەسیح لە سەردەمی گەنجێتیدا لە نیپال بووە.

کە گوێم لێ دەبوو (بابا) وای دەگوت، زۆر بایەخم بە قسەکانی نەدەدا چونکە دەمزانی ئەو لە ناخی دڵەوە بڕوای وایە مرۆڤ لە ڕۆژهەڵات چەکەرەی کردووەو داناییش هەر لەوێوە دەستی پێکردووە. بەڵام ئەمڕۆ، کە گوێم دایە قسەکانی قەشەکە، هەستم بە کاریگەری قسەکانو مانای قسەکانی کرد وەکوو جۆرە میهرەبانییەك وەکوو

هەوای هێمنی دەوروبەرمان، بە هێمنی لە دەمارەکانی لەشم دەگەڕان. ئەو مەسیحییانەی لەگەڵ ئێمە لەسەر جەنازەکە وەستابوون هیچ گومانیان لە ئەسڵی ماناکان نەبوو کە تەنیا من‌و (بابا) دەمانزانی‌و نهێنییەکەمان بە کەس نەدەگوت. ئەو دەنگەی دەهاتە بەر گوێمان دەنگی مەسیح بوو کە خەڵك لە (ڤیرمۆنت) بە خودانی دەزانن، بەڵام وشەکان وشەی خودانی تری زۆر لەوە کۆنتر بوون. هەستم کرد ئەو نهێنییە سینگم دەگوشێ بەڵام نەمویست بۆیان باس بکەم. بڕیارم دا منیش لەگەڵ خۆمدا بیبەمە ناو گۆڕ.

کە ڕێ‌و ڕەسمەکە تەواو بوو، هاتینەوە ماڵێ. لە کاتی ناشتنی (بابا)دا، هیچ نەگریاین. نە من‌و نە (ڕینی). جا بۆ بگرین؟ مردن دوایی تەمەنێکی دوورو درێژ هی ئەوە نییە مرۆڤ غەمی لێ بخوا، یان بۆی بگری. لەگەڵ میوانە تازیکەرەکان چووینە ژووری دانیشتن. نانمان خواردو بە ئارامی کەوتینە قسە لە بارەی ژیانی دۆڵەکەمان‌و ئاوو هەواو دواکەوتنی وەرزی هاوین‌و بەروبوومی ئەو ساڵەی خەڵکەکەو درێژبوونەوەی وەرزی زستان‌و کورتی وەرزی بەهار. پاش ماوەیەکی کەم هەموو ڕۆیشتن. هەر کەسە چووەوە دوای ئیش‌و کاری خۆی. (بروس) نەختێ خۆی وەپاش دا. پێیگوتم پێویستە پاش ئەو هەموو ماندووبوونە پشوو بدەم‌و بحەسێمەوەو جەختی کرد کە لەبەر ماندوێتی ڕەنگ‌و ڕووم زەرد هەڵگەڕاوەو.... ئینجا پێی گوتم:

- نابێ جلی ماتەم لەبەر بکەی!

- نەخێر... بۆ خاتری (بابا)، نا!

- بۆ خاتری هیچ کەسێ نابێ لەبەری بکەی.....

نەمتوانی چیم لە دڵدا دەجۆشاو چیم بە خەیاڵدا دەهات بۆی باس بکەم.

ئەو ڕەمزی ڕابردووەی لە گەڵمدا دەژیا، لەگەڵ (بابا)دا ناشتمان. (بابا) ئەڵقەی پێوەندی بوو، بەو ساڵانەی دەبەستمەوە کە ڕۆیشتن‌و نەمان. بەو شارەیان گرێ دەدام کە خۆشم دەویست‌و ئاشقی بووم، بەو ماڵەیان شەتەك دەدام کە بە ماڵ‌و حاڵی خۆمم دەزانی. کە دەمدی (بروس) بایەخم پێ‌دەدا، هەستم بە حەسانەوە دەکرد. کە بزەیەکم بۆ کرد، دیم ئاگری گرت بۆ ئەوەی ماچێکم لێ بکا، بەڵام من ئامادە نەبووم ئەو ئارەزووەی بێنمە دی کە لە چاوی کاڵ‌و لە ڕووی سەنگینی (ڤیرمۆنتی)دا دەمدی. ناتوانم ڕێ بدەم لێوی پیاوێکی تر بە لێوم بکەوێ.... نا.... هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە.

بەم جۆرە، ئەو ڕۆژە تەواو بوو و (سام)یش ڕۆیشت. وا بزانم چاوی دابووە (بروس) کە نەختێ لەگەڵ من وەستا. لە هۆڵەکە، لە نزیك ئێمە وەستابوو. پاشان گوێی لە ترپەی پێی بوو چووە ژووری دانیشتن. دوای ئەوە یەکسەر ڕۆیشت‌و گوتی دەبێ بۆ بەیانی بگەمەوە نیۆیۆرك، هەندێ ئیشی گرنگم هەیە. چاوی تێ بڕیم‌و توند دەستی گوشیم‌و گوتی:

– پێویستت بە هەر شتێ بوو، لە خزمەتتدام.

لەپڕو بێ پێشەکی، داهاتەوەو ماچێکی لە دەمم کرد. ڕاچڵەکیم‌و کشامەوە دواوە، لە زگ بوو بەربمەوە. گوێم لێ بوو بە ورتە ورت گوتی:

– ڕات لێ نەبوو وام کرد؟

– نەخێر... من ڕاستیم پێ‌گوتی.

– مادەم وایە، جارێکی تر شتی وا دووبارە ناکەمەوە.

ڕۆیشت. داخم خوارد کە هەستی ئازار دام. من نامەوێ هیچ کەس ئاوها کتوپڕ ماچم بکا بێئەوەی خۆم بۆ ئامادە کردبێ. سەردەمی گەنجێتی بە سەرچووە. ماچیش، بەش بەحاڵی ژنێ تەواو پێگەیشتبێ، یان هەموو شتێ دەگەیەنێ.... یان هەر هیچ ناگەیەنێ.

ئەمە هەمووی ئەو ڕۆژە ڕووی دا کە جەنازەی (بابا)مان ناشت. سوپاسی خوام کرد کە ئەو ڕۆژە، بە هەموو شتێکەوە کۆتایی هات.

بۆ ئێوارێ، منو (رینی)و ماری، لە شانشین دانیشتین. من بیرم لە دانیشتنەکەمان دەکردەوە. بەیانی ئەم دووانەش دەڕۆنو بە تەنیا جێم دێڵن. ئەوانیش نیگەرانی خۆیان دەربڕی کە من بە تەنیا دەمێنمەوەو پێیان خۆش نییە بە تەنیا جێم بێڵن. دڵنیام کرد کە من گوێم لە شتی وا نییە، ئەگەرچی لە دڵی خۆمدا باوەڕم نەدەکرد بتوانم لەو ماڵە کۆنو گەورەیەدا بە تەنیا بژیم. هیچ دراوسێیەکی نزیکم نەبوو. شەو، کە دونیا تاریك دادەهات، جەنگەڵ دەبوو بە شتێکی زۆر ترسناك. ئەو ڕەونەقو جوانییەی نەدەما کە تیشکی درەوشاوەی خۆر پێی دەبەخشی. چیای بەرزیش بە تاریکی لایەکی ئاسمانی لێ دادەپۆشیمو شوێنەکەی تاریکتر دەکرد. (رینی) پێی گوتم:

– وای دەنا کۆلێجم تەواو کردباو (ماری)م بهێنایەو هەموومان بە یەکەوە لێرە بژیابایین!!

ئەمە یەکەم جار بوو باسی ژن هێنانی لە لای من دەکرد. وەڵامم دایەوە:

– ئەگەر ئێوە زەماوەند بکەن، ئەوەندە بەختەوەر دەبم باکم بە هیچ شتێ نابێ.

چونکە ئەو ماوە کەمەی (ماری)م بینی، زانیم باشترین ژنە بتوانم بۆ (رینی) کورمی بێنم...... (ماری) گوتی:

- هیچ گومانی تێدا نییە، ئێمە زەماوەند دەکەین.

(رینی) گوتی:

- مەسەلە مەسەلەی وەختە. مەسەلەکە ئەوەیە کەی زەماوەندەکە دەکەین؟

پێمگوتن:

- بۆچی کاتی زەماوەندتان دەکەن بە جێی پرسیار. مادەم گەیشتوونەتە یەك، بۆ خۆتان زەماوەند بکەن.

لێرەدا، (ئیللگیرا)م بیرکەوتەوەو گوتم:

- ئەگەر ماڵی (ماری) بیانوو نەهێننەوەو دوای نەخەن. ماری، دوور نییە ماڵەوەتان بچووکیی تەمەنت بکەن بە بیانوو.

(ماری) وەڵامی دامەوەو گوتی:

- ماڵەوەمان کێیە؟ تەنیا (جۆرج)ی برام هەیە کە جمکین.... دایكو باوکمان مردوون‌و ئێمە لە منداڵییەوە لای داپیرەمان بووین. پاشان ئەویش عەمری خوای کرد.

بە ڕاستی جێی سەرنجە مرۆڤ لایەنی بێهێزی خۆی دەست نیشان بکاو بزانێ لایەنی خراپی چییە. من، کە بیستم ئەو سێ کەسە بێتاوانە ئێستا لەناو گۆڕ ڕاکشاون، هەستم بە دڵنیایی کرد لە پێناوی

بەرژەوەندی کوڕەکەم. لە خۆم تەریق بوومەوە کە نەوێرام چی لە سنگمدایە دەری ببڕم‌و ڕایبگەیەنم بەو قسەیە شادو دڵخۆش بووم. ئاخیری پێم گوتن:

– مادەم وایە، هەر کەی پێتان خۆش بوو، بۆ خۆتان زەماوەند بکەن. دەشتوانن لێرە، لەم ماڵە مارەیی ببڕن‌و زەماوەند بکەن. منیش لەگەڵ باوکی (رینی) لێرە مارەیمان بڕی‌و زەماوەندمان کرد. بە مەوە زۆر شادو بەختەوەر دەبم. کە ئێوە زەماوەند بکەن‌و دڵم دابکەوێ، ئیتر ئەگەر بە تەنیاش بم بە لامەوە گرنگ نییە.

– سوپاس، دایکە!

(رینی)، کاتێ وای گوت لەسەر تەختە درێژەکەی شانشین ڕاکشابوو. لێرەدا هەستایەوە، چووە لای (ماری). (ماری) دانیشتبوو. لەبەردەم (ماری) ڕاوەستاو دەستی گرت‌و گوتی:

– لە هەژدەی کانوونی دووەمدا، زەماوەند دەکەین، ئەو ڕۆژە تەمەنم دەبێ بە بیست ساڵ.

– باشە....

(ماری) سەری هەڵبڕی‌و تەماشای منی کردو بزەیەکی هاتێ.

(رینی) لە بەرامبەر (ماری) وەستابوو، تریفەی مانگ لە قژی سیسی (ماری)و لە دەم‌و چاوی (رینی) دەدا. لەو ساتەدا لێیان وردبوومەوەو وام بە خەیاڵدا هات جوانترین ژن‌و مێردی دونیا دەبینم. دڵم بۆ

(جیرالد) هەلا هەلا بوو کە نەیتوانی چێژ لەم دیمەنە جوان‌و جاویدانە وەربگرێ. کاتی خۆی، کە بیرم لێ دەکردەوە، دەمتوانی بە ڕۆح پەیوەندی پێوە بکەم، بەڵام ماوەیەکە شتی وام بۆ ناکرێ. لەو ساتەدا، جارێکی تریش هەوڵم دا، چی لە توانامدا بوو کردم، هەموو ورەو ئیرادەو زەینم چڕ کردەوە سەر ئەو پیاوەی لە دوور، لە (پەکین) دەژی. بە خەیاڵ وام دانا ئێستا لەم ساتەدا، لە حەوشەی تەنیشت ژووری نووستن دانیشتووە، وەکوو ئەو کاتەی من هێشتا لەوێ بووم. لە مانگی ئایار لەوێ دادەنیشتین‌و چاوی خۆمان بە جوانیی گوڵە جوانەکانی ئەو مانگە زاخاو دەدایەوە کە لە بۆن‌و تەڕو پڕیدا نموونەیان لێرە نییە.

هەوڵم دا پەیوەندی ڕۆحی پێوە بکەم بۆ ئەوەی لەگەڵ من سەیری ئەو پیاوە کۆک‌و جوانە بکا کە کوڕەکەمانەو سەیری ئەو کچە نەرم‌و حەلیم‌و هێمنە بکا کە کوڕەکەمان وەکوو هاوسەری ژیانی بۆ خۆی هەڵیبژاردووە.... بەڵام نەمتوانی پەیوەندی پێوە بکەم. بەربەستێك کەوتبووە سەر ڕێی ئەقڵ‌و دڵم نەمدەزانی چییەو نەمدەتوانی لێی تێبپەڕم‌و لێی دەرباز ببم.

- لە هەژدەی کانوونی دووەمی دادێ ئەم ماڵەتان بۆ ئامادە کراوەو لە خزمەتتاندایە....

ئەم بەڵێنەم بە (ڕینی)و (ماری) دا.

کاتێ، پاش سەعاتێك لە شانشین بە تەنیا جێم هێشتن‌و چوومە سەلال بۆ ناوجێ، هەستم کرد ئەو ماڵە هیچ دەوس‌و نیشانەی (بابا)ی پێوە نییە، تەنانەت تارمایشی نەماوە.... بگرە سەراپای ئەو ماڵە دەڵێی هیچ پیرەمێردی هەر بەلادا تێنەپەڕیوە. وەك ئەوە وایە جەنازەی هیچ مردوویەکی لێ نەچووبێتە دەرەوە. هەر دەڵێی ئەو گۆڕەی ژێر دار سنۆبەر هەر لێ نەدراوەو هەر نەبووە. ئایا ئەمە لەبەر ئەوەیە چونکە (بابا)ی ڕاستەقینە لای ئێمە نەبوو؟ ئایا ئەوەی لای ئێمە بوو تەنیا کەلەو پارچەی ئەو پیاوە سیاسەتمەدارو زانایە بوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دکتۆر (ماك لیود) بوو؟ ....کە کاری تەواو بوو، وەك ئەوەیە هەر نەبووبێ!! هەر وەختە وام لێ بێ بڵێم (جیرالد) خۆیشی ڕۆیشت‌و نەما، یان هەرگیز لێرە نەبووە.... تاکە نیشانەیەکی لێرە مابێ، (رینی) کوڕمە!

* * *

# (٣٤)

من زۆر دوورم له مرۆڤی ئایینپەروەر. من زیاتر بە زەوی بەستراوەمەتەوە. جارێکیان (جیرالد) پێی گوتم گوایە من زۆر ڕووتەنکم... ئەوە ڕاستەو هیچ قسەی لەسەر نییە. کاتێ کە سەرقاڵی ئیشی ڕۆژانەی ئاسایی ناو ماڵو باخچەم، بۆی هەیە بە باسی شتی ترو هەندێ هەڵسوکەوتی سەیری وا کە لە مرۆڤ دەردەچێ، خۆم لە گێژاوی ئیشی ڕۆژانە دوور بخەمەوە. من خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی گەورە نیم ئەگەر چی بە پلەی نایاب لە کۆلێج دەرچووم. خۆم لە هەموو کەس زیاتر سەرم لەوە سووڕمابوو چونکە لە هەموو کەس باشتر دەمزانی من شایەنی ئەو شەرەفە زانستییە نیم.... هەروەکوو خەونداریش نیمو تا ئێستایش هیچ خەونێکم نەدیوە بە ڕاست گەڕابێ.... بۆیە وا دەڵێمو جەختی لەسەر دەکەمەوە، چونکە سوێندتان لە سەرم نییە، سوێندتان بۆ دەخۆم شەوی ڕابردوو، ڕێك لە سەعات دوو و چارەکێك، لێرە، لە ژووری نووستنی خۆم، (جیرالد)م بینی. گومانیشی تێدا نییە من لەم ماڵەدا بە تەنیا دەژیم، لە ڕۆژی دوای جەنازەی (بابا)وە، کە (رینی)و (ماری) ڕۆیشتنەوە، ئەوە پێنج حەفتەیە من بە تەنیا دەژیم. ئەوە نەبێ

جاروبار هەندێ خەڵکی دۆڵەکەمان سەردانێکی کورتیان کردووم‌و سبەینان زوو (مات) دەهات تا درەنگ دەمایەوە، خانمی (مات)یش دەرفەتی ئامادەکردنی خواردنی مێردەکەی دەقۆزتەوە بۆ ئەوەی بێ لە ئەحواڵم بپرسێ‌و خۆی گوتەنی ئەوەی دەکردە بیانوو بۆ ئەوەی بێتە ماڵمان..... هەوڵی دەدا ماوەیەکی زۆر لە لام بمێنێتەوەو لەبارەی دەنگ‌و باس‌و کارە سەمەرکانی مێردی چەنەی بۆ لێ دەدام. خانمی (مات) ژنێکی نەخوێندەوارە، قەت هیچی نەخوێندووە. پیاوو ژیان دوو ئاوقووفن، لێك جیا نابنەوەو ناگۆڕێن. ژن ئەگەر بیەوێ بمێنێ‌و بژی، دەبێ خۆیان لەگەڵ بگونجێنێ...

هەندێ جار قەشەیش سەری لێ دەدام... خانمی (مونر)ی بەڕێوبەری تاکە قوتابخانەکەی دۆڵەکەیشمان جاروبار لای دەدایە کنم‌و نەختێ لەلام دەمایەوە. (بروس سبولدن)یش دوو جار بە سەری کردمەوەو هەر ئەوەندە دەمایەوە لە ئەحواڵی دەپرسیم‌و چاك‌و چۆنی لەگەڵ دەکردم.

- ئایا بەختەوەری؟

دوێنێ بۆ یەکەمین جار ئەم قسەیەی لەگەڵ کردم... ئەو کاتە خەریکی باخچە بووم. وەڵامم دایەوە:

- نازانم بەختەوەرم، یان بەختەوەر نیم. ئێستا لە ماوەی ئارام بوونەوەو بووژانەوەدا دەژیم.

- ئەو ماوەیە زۆر دەخایەنێ؟

- لەوانەیە زۆر نەخایەنێ. ڕەنگە ماوەی گواستنەوە بێ لە نێوان ڕابردووو ئایندەدا.... نازانم... تەنیا ئەوەندە هەیە دەزانم بەو دۆخە دڵخۆشم.

- ئایا هەست بە تەنیایی ناکەی؟

- چۆن هەست بە تەنیایی دەکەم کە چاوەڕێ دەکەم لە مانگی کانوونی دووەمدا، ئاهەنگی زەماوەند لە مالّم بکرێ؟....

دوێنێ، ڕۆژێکی نائاسایی نەبوو لە ژیانمدا. هەموو ئیش‌و کاری مالّەوەم کرد کە ئەوەندە زۆر نەبوو. ئەو مالّەی یەك کەسی تێدابێ، ئیشی زۆری تێدا نییە. ڕێك خستنی نوێنیش کاتێکی زۆری ناوێ، من لەوانە نیم شەو زۆر جوولە جوول دەکەن‌و کەلەکان دەگۆڕن.... (جیرالد) پێی دەگوتم: تۆ، کە دەخەوی، ئەوەی بتبینێ، وا دەزانێ بووکە شووشەیە خەوتووە. لەگەلّ ئەوەشدا، خەوم سووك بوو، زوو بە خەبەر دەهاتم.

شەو، وەکوو هەموو جارێ بە خەبەر هاتم بۆ ئەوەی بزانم شەو چ وەختە. ڕاهاتبووم، لە یەك کات بە خەبەر دەهاتم، بگرە لە هەمان خوولەك. کاتێ کە بە ئاگا هاتم، سەعات دووو چارەکێکی دوای نیوە شەو بوو. لەوەتی لە (جیرالد) دوورکەوتبوومەوە، چرام دادەگیرساندو دەستم دەدایە کتێبێك‌و دەمخوێندەوە، هەرچی بوایە. بەم دواییە حەزم لە چیرۆك‌و شیعر نەبوو. کاتێ (رینی) ڕۆیشت‌و ژوورەکەیم هەلّبژارد، لەناو کتێبەکانی گەڕام، کتێبێکی بچووکم دۆزییەوە لە ناونیشانەکەیەوە زانیم باسێکی کورتی تیۆری ڕێژەیی ئەنشتاینە بۆ خوێنەری ئاسایی ئامادەکراوە. بردمە ژووری خۆم‌و خوێندمەوە. هەر چەندە گوایە ئاسانیش بوو، بەلاّم بۆ من زەحمەت‌و ئالّۆز بوو. دیارە من ئاستم لە خوێنەری ئاساییش نزمترە. ئەرکێکی زۆرم بە خوێندنەوەی کتێبەکە کێشا: پیت پیت وشەو ڕستەکانم خوێندەوە بۆ ئەوەی بەلّکو لە مانایان بگەم.

من وا دەڵێم بۆ ئەوەی بیسەلمێنم من زۆر لەوە دوور بووم کە مرۆڤێکی دیندارو ڕۆحانی، یان خەیاڵ پڵاو بم. من لەو کەسانە بووم کە خاوەنی ئەقڵێکی سافو کاران‌و زەینێکی تیژیان هەیە. حەز دەکەم جەخت لەسەر ئەمە بکەمەوە.

پاش ئەوەی بۆ چوارەم جار کتێبەکەم خوێندەوەو لە پەیوەندی سەرەکی نێوان ماددەو جوولە گەیشتم. بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد: (ئۆی!). لێرەدا، چارم ناچارە زۆر بە شەرمەوە دان پێدا بنێم وام لێ هاتبوو هەندێ جار کە شەو دادەهات‌و ماڵەوە کش‌و مات دەبوو، لەبەر خۆمەوە قسەم دەکرد:

- ئۆی!... ئەمە شتێکی سەیرە... شتێکی بەرزە... توخمی ماددە دەگۆڕێ‌و دەبێ بە جوولە ... ئێستا تێگەیشتم.

شەوا دی بوو کە ئەمەم زانی‌و تێی گەیشتم... دوای ئەوە یەکسەر هەستێکی سەیرم بەسەردا هات، هەستی حەسانەوەو ئارام بوونەوە. دیم بە ئەقڵ‌و بە لەش لە دۆخێکی خاوبوونەوەی تەواو دام‌و بە سەردا خەوم لێ کەوت. ڕۆژی پاشی، درەنگ بە ئاگاهاتم. تیشکی خۆر گەیشتە ژوورەکەمەوە، ئەوسا بە خەبەر هاتم. خێرا لە خەو ڕابووم‌و دەستم بە ئیش‌و کاری ماڵەوە کرد. خانمی (مات) تا درەنگ لە لام مایەوە. شەو داهات هێشتا ئیش‌وکاری ماڵەوەم تەواو نەکردبوو. ڕاهاتبووم هەموو ڕۆژێ بەرنامەی ئیش کردنم بۆ خۆم دادەنا بۆ ئەوەی ژیانم مانایەکی هەبێ. مادەم بە تەنیا دەژیم، پێویستە هەموو ڕۆژێ بەرنامەیەك بۆ خۆم دابنێم کە ئەو ڕۆژە چ بکەم. کە شەو دادەهات، دەمتوانی بڵێم ئەو بەرنامەی بۆ ئەمڕۆ دامنابوو، هەمووم جێبەجێ

کردووە. ڕۆژ کۆدەبێتەوەو دەبێ بە ساڵ، ساڵ کۆدەبێتەوە دەبێ بە ژیان.

واتە دوێ شەو ماندوو بوومو لە خۆم ڕازی نەبووم چونکە ئیشی ڕۆژانەی خۆم تەواو نەکردبوو. بڕیارم دا بێ ئەوەی کتێبێك بکەمەوە و شتێ بخوێنمەوە، یەکسەر بخەوم. کاتێ وەکوو جاران، سەعات دوو و چارەکێك بە خەبەر هاتم، مێشکم زۆر ساف بوو. ئەمە وای لێ کردم بە پێی ئەوەی پێشتر تێی گەیشتبووم، دووبارە کتێبەکە بخوێنمەوە. هەر هێندە کتێبەکەم کردەوە، هەستم کرد لە ژوورەکەمدا، تەنیا نیم. هیچ نەترسام، بەڵام سەرم زۆر سوڕما، چونکە سەرم لەسەر کتێبەکە هەڵگرتو (جیرالد)م بینی. (جیرالد)م بینی لەناو دەرگای کلیلدراوی ژوورەوە وەستابوو. غەمبارو لاواز بوو. کەوتبووە ناو ساڵانەوە. ڕدێنی کورتو قژی سەریشی زۆر زۆر کورت بوو. جلی چینی تایبەتی قوتابیانی لەبەربوو کە لە قوماشی ڕەش دروست دەکراو چاکەتە ڕیزە قۆپچەیەکی دوورو درێژی تا بن گەردنی لێ درابوو. دەموچاوی بە هەموو سیماوە بە ڕوونو زوڵاڵی دیار بوو. بۆم گرژییەوە، دوو چاوی ڕەشی دەبریسکایەوەو ئاورینگیان دەهاویشت. وام بە خەیاڵدا هات، دەست بۆ لای من درێژ دەکا. لەناو نوێن دەرپەڕیمو هاوارم کرد:

– (جیرالد)، (جیرالد)، ئاخ، ئازیز گیان!....

ئازارێکی قووڵم لە دەموچاویدا دی، ڕاوەستام. ئەمە لە ماوەیەکی زۆر کەم زیاتری نەخایەند. ڕام کرد بۆ لایەوە بۆ ئەوەی بیگرمە باوەش، بەڵام تا من چووم، ئەو ڕۆیشتبوو، نەمابوو. دیم لە کوێ وەستابوو، چووم لەوێ ڕاوەستام. هەر تەنیا خۆم بوومو بەس. پێی خاوسم لەسەر عەردی ژوورەکە سارد سارد بوو. هاتمەوە ناو نوێنەکەم. لە ترسان

چرك‌و هۆڕ دەلەرزیم. هیچ گومانی تێدا نییە، بە ڕاستی (جیرالد)م بینی، ئێستا چۆنە ئاوها دیم. شتی وا ناشێ خەون بێ ..... نا.... نا.....خەیاڵی یادەوەریش نییە. چونکە ئەگەر خەون‌و خەیاڵ بوایە بە شێوەی ئەو کاتە دەمدی کە لێك دابڕاین. دەم‌و چاوی وەکوو ئەو کاتە دەبوو کە لە بەندەری (شەنگهای) وەستابوو، ماڵاوایی لێ دەکردین.

ئێستا ڕدێنی بەرداوەتەوە. قژی سەری کورتە. جلێکی لەبەرە کاتی خۆی ڕقی لێ دەبووەوەو لێی خۆش نەدەهات، خۆی گوتەنی وەکوو جلی زیندانیان وا بوو. نە زەوقی تێدابوو نە ژیان. ڕەنگی تارو ڕەش بوو. ئەو ساتە بەو شێوەو بەو جۆرە دیم، پێشتر بەو شێوەو بەو جۆرەم نەدیبوو. کەواتە ئەوەی دیم خەون نەبوو. ماددە بوو دیم، بە وێنەو شکڵ ببوو بە جووڵە.

دوای ئەوە، ئەستەم بوو خەوم لێ بکەوێتەوە. جلم کردە بەرو هاتمە نهۆمی خوارەوەو تا گزنگی بەیانی داو تا تیرێژی زەردی خۆر، لە پشت چیاکانەوە، لە ئاسۆ دەرکەوت، من لەو ماڵە هەر هات‌وچۆم کرد.

من هیچ لە بارەی خەونەوە نازانم‌و نازانم یانی چی. ئایا یانی ژیان، یان مردن؟ نازانم ئەمە بە چ لێك بدەمەوە. بۆچی دوا جار سەرنجێکی پڕ ژان‌و کەسەری لێدام. چۆن بزانم؟

* * *

# (٣٥)

سەرم سوڕماوە چۆن لە دیتنی (جیرالد) نەترسام، بەڵام دڵی پڕ غەم‌و کەسەر کردم. (جیرالد)، بە هەر شێوەو وێنەیەك لەبەر چاوم دەربکەوێ، من قەت لێی ناترسم. بەڵام ئەو ڕووداوە، ئەو شتانەی بە بیر هێنامەوە کە لە هەقایەتان گوێم لێ دەبوو و پێکەنینم پێ‌دەهات. ئەو ه‌قایەتانە باسیان دەکرد مردوو خۆیان پیشانی خۆشەویستەکانیان دەدەن. هەرگیز بڕوام بەو ڕۆح‌و تارماییانە نەبووەو ئێستایش بڕوام پێ نین. لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەوەی دیم جۆرە چاوهەڵخەڵەتێنەیەك بووە. ئەمە چالاکی ئەقڵی ناوەوەم بووەو ئەقڵی هۆشیاری پێ تەفرە داوم. کە لەگەڵ خەڵکیش قسەم دەکرد بێ دەستی خۆم دەچوومە سەر بابەتی ئەو کەسانەی لێمانەوە دوورن‌و لەپڕ لەو کەسانە دەردەکەون کە بیریان لێ دەکەنەوە. بەڵام لەم هەموو قسانەدا هیچ جار بۆ کەسم باس نەکرد من (جیرالد)م بینوە. ئەوەتا خانمی (مات)یش بڕوای بەو شتانە هەیە کە من بڕوام پێ‌هەن. باس دەکا سێ جار دایکی خۆی دیوە. دایکی لە ئێرلەندە ژیاوەو هەر لەوێش مردووە.

– سێ جار دیومە، خوای لێ خۆش بێ! ئەم هەموو جارانەیش دوای مردنی بوو.

داوام لێکرد چی دیوە بە وردی بۆم بگێڕێتەوە.

– دایکمم بینی چۆکی دادابوو، دوعای دەکرد. دیتم هەر دوو دەستی بەرز کردبووەوە، قژی بە سەر پشتیدا شۆڕببووەوە. بە دەم دوعاکردنەوە، دەگریا. فستانەکەی لەبەر بوو، بەبێ دەسرۆك بوو. تەنیا ڕۆژانی یەك شەممە، دەسرۆکی لەسەر دەنا. ڕۆژێ دیم ئەو دەسرۆکەی لەسەر بوو، زانیم ئەو ڕۆژە ڕۆژی یەك شەممەیە. پاشان زانیم ئەو ڕۆژە، لەگەڵ ڕۆژی وەفاتی باوکم یەکی دەگرتەوە. هەروەها زانیم دایکم دیبووی باوکم بە هەقی خۆی چۆتە دۆزەخ بەڵام دایکم ژنێکی بە ڕوحم بوو، بەرگەی ئەلحەدی پێنەدەگیراو دەگریا، خوا عافووی کا!

دوای نیوەڕۆ، چوومە کتێبخانەیەکی بچکۆڵەی نزیکترین شار لە ئێمەوە. سەرپەرشتیکاری کتێبخانەکە سەری سووڕما کە دیتی پێنج شەش کتێبم لە بارەی خەون‌و شتی واوە داوا کرد. لە خۆم تەریق بوومەوە ئەم کتێبانە دەخوێنمەوە، چونکە من هەر ئەو کتێبانەم دەخوێندەوە کە گومانیان لە هەموو شتێ پەیدا دەکرد. هەرگیز باوەڕم بەو دیوی ئەم سروشتە نەبوو کە لە بەردەمی خۆمدا دەیبینم. ئەنیشتاین بوو بڕوای لەقاندم.

وەکوو ئەوەی دەڵێ ئەگەر پارچە دارێکی گەورە، کە بە هەموو مانایەکەوە ماددەیە، لەبەر چاوی من ببێ بە یەك تۆپەڵ چالاکی‌و ئەو چالاکییە ببێ بە بڵێسەو گەرماو خۆڵەمێش، ئایا ناکرێ، جەستەیەکی کەیلی ژیان‌و ئەقڵێکی ژیرو ڕۆحێکی قووڵ بگۆڕێ‌و لە مادەیەکی تردا ببێ بە وێنەیەکی وەکوو خۆی؟ ئەوەی هانی دام بۆ ئەمە هەقایەتی پڕو

پیرەژنانو تارمایی مردووان نەبوو کە ئێستایش لام وایە شتی وا زۆر لە ڕاستییەوە دوورە. نەخێر... ئەوەی هانی دام، ڕای ئەو زانا پیرە بوو کە دەبێ ڕێزی بیروڕاکانی بگرین، چونکە دونیا هەموو ڕێزی دەگرێو ستایشی دەکا. ئیتر هەموو بیرو خەیاڵم لە سەر یەك پرسیار کۆببووەوەو بە دوای وەڵامێکدا دەگەڕام: ئایا (جیرالد) ئێستابش ماوەوو زیندووەو زەقەی چاوی دێ؟ یان مردووەو چۆتەوە هەقان؟

* * *

# (٣٦)

ئەمڕۆ زۆر بە ئاسانی و لە هەمان کاتدا زۆر بە سەختی وەڵامی پرسیارەکەمم دەست کەوت، ئیتر پێویستم بە گەڕان و لێکۆڵینەوە نەما. نامەیەکم لە (مای - لان)ەوە بۆ هات. ئەم جارە لە (کەلکەتا)وە ڕەوانە کرابوو. خەبەری مردنی (جیرالد)ی بۆ ڕەوانە کردبووم. ئەمە مانای ئەوە نییە ژنەکە لە (کەلکەتا)یە، نەخێر هێشتا لە (پەکین)و لە ماڵەکەی جارانە چاوەڕێی لە دایك بوونی نۆبەرەکەی دەکا. چاوەڕێی منداڵێکی (جیرالد) دەکا. بە شێوازی تایبەتی خۆی، توانیویەتی ئەم نامەیە بە نهێنی بگەیەنێتە هیند. لەوانەیە، بە هۆی دبلۆماسییەکی هیندی برادەری (جیرالد) بێ.

نامەکە نامەیەکی کورت بوو. بە خێرا و لەزو بەز نوسرابوو. هەندێ پەڵەی پێوە بوو، وا بزانم جێگای دڵۆپە فرمێسك بوون. لێرەدا، نامەکە وشە بە وشە دووبارە ناکەمەوە، چونکە دەمەوێ لە بیری بکەم. هەر بە ڕاستیش نامەکە دەسووتێنم. لە نامەکەدا، زۆر بە سادەیی بۆی نووسیبووم کاتێ (جیرالد) دەیەویست لە (پەکین) ڕابکا دایانە بەر

گوللە. گوایە ئەویش نەیدەزانی نیازی ڕاکردنی هەیە. لەم بارەیەوە نووسیبووی:

((وا بزانم بە پەرۆشەوە بوو بۆ بینینی تۆ. باوەڕ کەم هیوای وا بوو بە هەر جۆرێ بێ لەگەڵ هیندییەکان بچێتە هیند. گومانی تێدا نییە لە ژێر چاوەدێرییدا بوو چونکە هیچ بڕوایان پێ نەدەکرد. نازانم ئاخۆ خزمەتکاری بوون زمانیان لێدابوو، یان؟...))

ئینجا نووسیبووی:

((قەت باسی هیچی لە لای من نەکردبوو. وا بزانم مەبەستی ئەوە بوو تووشی گازاندەم نەکا. دووبارەی دەکەمەوە، من نەمدەزانی شتی وا دەکا. لە دەرەوە، لەبەر دەرگای حەوشە، لە پشتەوە لە (جیرالد)یان دا. نەیتوانی پێ لەبەر پێ بنێ. دوای نیوەڕۆ بوو. بە ڕۆژی رووناک لێیان دا. وای پێشاندابوو دەچێتەوە زانکۆ بۆ دەرزگوتنەوە. دەرگا کرابووەوەو دەرگەوان لەبەر دەرگا بوو. دیتی کابرایەك لەو لاوە هات ئەو جلە پیسەی لەبەر بوو. کە لە (جیرالد) نزیك کەوتەوە، دەبانچەی لێ هەڵکێشاو زۆر لە نزیکەوە تەقەی لێکردو بزر بوو. دەرگەوانەکە نەیوێرا هاوار بکا. (جیرالد)ی هەڵگرتو لە باوەشی کردو هێنایەوە حەوشەی سەرەکیو لە سەر عەردی بەردڕێژی حەوشە داینا و دەرگای داخست. بە دزی، لە حەوشەی بچووکی لای ژووری نووستن، ناشتمان.

دوای نیوەڕۆ، بە ڕۆژی ڕووناك، لە پەکین دەکاتە دەوری سەعات دوو و چارەکێکی دوای نیوە شەو لای خۆمان. ئایا شتی وا باوەڕ دەکرێ؟ من نازانمو لەمەودوایش هەرگیز نازانم. ئێستا هەر ئەوەندە دەزانم ئەوەی خۆشم دەویست لە سەر دونیادا نەماوەو لەم دونیایەدا

تەمەنم هەر چەندە درێژ بێ، تازە جارێکی تر چاوم بە بە چاوی ناکەوێتەوە.

*   *   *

# (٣٧)

ئەو ڕۆژە، لەسەر پرۆگرامی رۆژانەی ژیانم نەڕۆیشتم. پێویست ناکا وەڵامی نامەکە بدەمەوە، بۆیە فەوتاندم. کە دڵم هێور بووەوەو توانیم شتێ بنووسم، نامەیەك بۆ (رینی) کوڕم دەنووسم‌و خەبەری مردنی باوکی پێدەگەیەنم. بە ڕاستیش بۆم نووسی:

( دیارە بڕیاری دابوو بێتە لامانەوە. ژنە چینییەکەی ڕای وایە. ویستی لە دووری ئێمە بژی، بەڵام بەرگەی نەگرت‌و خۆی پێ نەگیرا. لە کۆتاییدا، خۆشەویستی بەسەر نیشتمان‌و بە سەر مێژوودا زاڵ بوو. ئەمەیش جێگای دڵخۆشییە بۆ ئێمە. ڕاستە پێی نەکرا خۆی بێتەوە، بەڵام پەیامی مەرگی خۆی بۆ ناردین‌و ئەوەندەمان بەسسە! تۆیش ئەوەندە بزانی بەسسە بۆ ئەوەی لێی ببووری. (رینی)، تکات لێ دەکەم گەردنی ئازا کە! ئەگەر گەردنی ئازا بکەی، ژیانم زۆر ئاسوودەو بەختەوەر دەکەی.)

لێرەدا، لە نووسین وەستام. دوو دڵ بووم بە (رینی) بڵێم من لە چرکەساتی دوای مردنی (جیرالد)، زۆر بە ڕوونی (جیرالد)م بینی‌و هەر هێندە ڕۆحی لە جەستە جوودا بووەوە، هاتە ماڵەوە بۆ لام، تا بۆ یەك چرکەسات خۆیم نیشان دا بۆ ئەوەی هەتا هەتایە لە بیری نەکەم؟! ئاخیری، بڕیارم دا شتی وای بۆ باس نەکەم. ئەو باوەڕ بە شتی وا ناکا

کە من ئەم شەوە دیومە. ئیتر نەمویست بڕوای خۆم بخەمە ژێر تاقیکردنەوە. شتێ نەبوو ناچارم بکا شتی وا بکەم. چاوەڕێ دەکەم تا کاتێ دێ هەموو شتێکم بۆ دەردەکەوێ.

(رینی) وەڵامێکی کورت و یەك لاکەرەوەی دامەوە:

((گەردەنی خۆش و ئازا بێ. بە ئارەزووی خۆم و لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێ، گەردەنی ئازا دەکەم. کە گەردەنیشی ئازا دەکەم بۆ خاتری خۆمە. ئەگەر تۆ بە مەوە بەختەوەر بی، زۆر باشتریش!. خەبەرەکەم بە (ماری)یش گەیاند.))

* * *

## (٣٨)

دوای ئەوەی ئەو هەموو شتەم نووسی، پێویستم بەوە نییە یەك دێڕی تر بنووسم. ئەوەی دەبوو بیڵێم، گوتم. خەریکە بەهار تەواو دەبێ و دەکەوینە سەر هاوین. خۆم بە ئیش و کاری ڕۆژانەوە خەریك دەکەم کە لە هەمووی گرنگتر ئامادەکارییە بۆ زەماوەندی (رینی). ئەم شەو، شەوی پێش زەماوەندە. هەست دەکەم کتێبەکەم، ئەگەر تەواوکردنی چیرۆکی ئەم زەماوەندەی تێدا نەبێ، تەواو نابێ. ڕاستییەکەی، ئەم چیرۆکە پێش چەند ساڵێکی دوورو درێژو لە ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆدا ڕووی دا، کاتێ من کچێکی بزۆزو ڕووخۆش و دڵ پڕ شادی بووم، هەموو گیانم گەنجێتی و ئەشق و ئەوین بوو. بە یەك سەرنج، دڵم نیشتە سەر گەنجێکی ڕێك و پێك. بە هیواو ئاواتی دڵی خۆمم زانی. ڕاستت دەوێ کە یەکەم جار چاوم بە (جیرالد) کەوت وەکو پیاوێکی قۆز لە بەردەمیا شاگەشکە بووم، دوای ئەوە کەوتمە داوی خۆشەویستی و لەگەڵیا بەردەوام بووم.

ئەمڕۆ ئێوارێ، کاتێ من و (ماری) لە مدبەق بووین هەندێ ئامانمان دەشووشت و (رینی) لەشانشین دانیشتبوو پاپی دەکێشا چونکە ئەو ڕۆژانە دەیەویست وەکو پیاوان هەڵس وکەوت بکا، بە (ماری)م گوت:

- ماری گیان! هیوادارم (رینی) مێردێکی باش بێ بۆ تۆو خۆشی بوێی. باوکی (رینی) باشترین مێردو باشترین عاشق بوو بە من. هیوادارم ئەو بەهرەیەی لە باوکی بۆ مابێتەوە، هەرچەندە زۆر لێی دڵنیا نیم.

(ماری) خەندەیەکی ناسکی کەوتە سەر لێوو گوتی:

- دایکە، من دڵنیام (رینی) ئەو بەهرەو خەسیەتانەی لە باوکی بۆ ماوەتەوە.

ئەمە یەکەم جار بوو بە (دایکە!) بانگی کردم. ئەمە زۆر کاری تێکردم. لێی وردبوومەوە. نیشانەی وروژانم بە هەموو گیانەوە دیاربوو. پێکەنی، هاتە لامەوەو باوەشی پێدا کردمو ماچێکی لە هەنیەم کرد. لە من بالاّبەرزتر بوو. کە ڕووم کەوتە سەر سینگی بۆنێکی خۆشم بۆ هاتو هەناوم فێنك بووەوەو دڵم بەرامبەر کوڕەکەم داکەوت.

* * *

## (٣٩)

بەیانی ڕۆژی زەماوەندەکە بەیانییەکی خۆش‌و ئارام بوو. ئەمڕۆ یەکێکە لە ڕۆژە فێنك‌و خۆشەکانی مانگی کانوونی دووەم. سبەینێ زوو، (جۆرج بووین) بە ماشینە بچووکە بۆرەکەی هات. ئەمە یەکەم جار بوو دەمدی. گەنجێکی سیسی بالآبەرز بوو. وەکوو (ماری) هێمن‌و لەسەرخۆ بوو. لە ماشینەکەی دابەزی‌و هاتە ژوورەوە، جانتا بە دەست‌و بێ ترس‌و دوو دڵی، وەك ئەوەی ئێرەی دیبێ‌و ئاشنای بێ. لەگەڵ یەکەم سەرنجدا، دڵم پێ‌کرایەوە. سلآوی لە (رینی)و خوشکی کرد، ئینجا زۆر دڵسۆزانە دەمی قسەی کردە من‌و گوتی:

- من باش تۆ دەناسم. کە یەکەم جار (رینی)م ناسی، ویستم بتبینم.
- جانتاکەت دانێ، وەرە پێکەوە تێشت بخۆین.
- لێرە، لە مدبەق دەستم دەشۆم.

شێوەی دەست شووشتنم زۆر بە لاوە جوان بوو، زۆر بە وردی وەکوو نەشتەرگەرێ دەستی دەشووشت. (رینی) بۆی باس کردم (جورج) زانایەکی ئەتۆمییە. نەختێ لێی دەترسام. وام دەزنی وەکوو هەموو زاناکانی ئەم زەمانە، گەنجێکی بچووکی زیرەکی سەرسەختە، دوورە لە دڵسۆزی‌و خۆشەویستی، کەچی دیم گەنجێکی بچووکی

ناسكو بە سۆزی میهرەبانەو برادەرێكی دڵسۆزی كوڕەكەمە. خۆیو خوشكی دونیای دواڕۆژی كوڕەكەی منن كە ئەو كچەی بە هاوسەری خۆی هەڵبژاردووەو چاكیشی كرد ئەوەی هەڵبژارد.

(جۆرج) لە هەموو ئیشێكیماڵەوە بۆ ئاهەنگی زەماوەند یارمەتی داین. زۆر چالاكو ئیشكەر بوو. زۆر دڵخۆش بووم كە دەمدی ئەوەندە بە تەنگ (رینی)و (ماری)یەوەیەو هەستم دەكرد لە هەموو بیرو بۆچوونێكەوە ئەوەندە ڕێكو لە یەكەوە نزیكن.

(ڕینی)و (ماری) پێیانگوتم نایانەوێ ئاهەنگی مارەبڕینەكەیان گەورە بكەن. دەوری سەعات چواری دوای نیوەڕۆ، پاش گەشتێكی ناو جەنگەڵ، هاتنەوە ماڵێو هەر كەسە چووە ژووری خۆیو جلی خۆیان گۆڕی. خانمی (مات)و دوو سێ دراوسێی تر لە مدبەق بوون، لە ئامادەكردنی شەربەت یارمەتییان دەداین. ڕووی تێكردمو پێی گوتم:

– هەستە بڕۆ جلت لەبەر كە!

چارەكە سەعاتێكی زیاتر ناوێ!

– كەواتە بزانە بووك پێویستی بە چییە.

چوومە سەلال، جلی خۆم گۆڕی. ئینجا ڕووم كردە ژووری (ماری)و لە دەرگام دا. ڕوخسەتی چوونە ژوورەوەی دام. جلی كردبووەبەرو لە خۆخەملاندن ببووەوەو لە تەك پەنجەرە وەستابوو، تەماشای چیاكانی (ڤیرمۆنت)ی دەكرد. كراسی بووكێنی شتێكی سادە بوو، لە ئۆرگاندی سپی دروست كرابوو. جێجێیە نەخشێكی كەمی لێ كرابوو. گوتی خۆم دروستم كردووە. دیم تەواو لە خۆی دەهات. زریزەیەكی زێڕی لە مل بوو. چوارچێوەیەكی بچووكی پێوە بوو وێنەی (ڕینی) تێگیرابوو.

خوندی وردە وردە هاتن. قەشەیش هاتو لە ژووری دانیشتن دانیشت. چەپکێکم لە گوڵە هەرە جوانو هەرە بەنرخەکانم بۆ (ماری) چنی بوو. پێم گوت:

- چەپکە گوڵی تایبەتی تۆ لە نهۆمی یەکەمە، بچم بۆت بێنم؟!

- زەحمەت نەبێ، بەڵێ، دایکە!

یەکسەر چوومە دەرەوە. گوێم لێ بوو (ڕینی) لە ژووری خۆی هاتە دەرەوە. کە چەپکە گوڵەکەم هێناو هاتمەوە، دیم (رینی) لە بەردەم (ماری) وەستابوو، دەستەکانی لەناو دەستی خۆی گرتبوو. لەپڕ، هەستم کرد هەموو غەمم ڕۆیشتو هەموو خەفەتم ڕەوییەوە. هەستم کرد کوڕەکەم بە جۆرێ تەماشای بووکی بەردەمی دەکرد، وەکوو ئەوە وابوو کە کاتێ خۆی باوکی تەماشای منی دەکرد.

هەموو شتێکمان بە ساکاریو هێمنی ڕێك خست. خەڵکی دۆڵەکەمان لە ژووری دانیشتن کۆبوونەوە. لە بیست کەس زیاتر نەبوون. چونکە گەشتیارەکانمان داوەت نەکردبوون. کە هەموو هاتن، (رینی) دەستی (ماری) گرتو چوونە لای قەشەو لە بەردەمیا وەستان. قەشە لەسەر کورسی هەستایەوەو دەستی دایە کتێبە بچووکەکەیو ئەو چەند وشە کەمەی خوێندەوە کە هەتا هەتایە وەکوو ژنو مێرد بە یەکی بەستنەوە. ڕێو ڕەسمەکە تەواو بوو. میوانەکان دەورەیان لە بووكو زاوا دا. من خۆم دایە لایەكو لە خۆشییان گریام. (بروس سبولدن) پەرداخە شەربەتێكو هەندێ میوەی بۆ هێنامو گوتی:

- گیانە خۆت بە مانەوە سەخڵەت کە.

لای من مایەوەو نەڕۆیشت.

بووك‌و زاوا بە هێواشی کشانەوەو چوون بۆ ئەوەی جلیان بگۆڕن‌و خۆیان بۆ سەفەر ئامادە بکەن. پاش نەختێ، هاتنەوەو ماڵاواییان لە میوانەکان کردو چوونە دەرەوە بۆ لای ترومبێل‌و لەوێ چاوەڕێیان کردم.

لەوێ کوڕەکەم هەردوو بازووی تێوەرینام‌و ماچی کردم. لەهەمان کاتدا، (ماری) باوەشی بە هەردوکماندا کرد. بەم جۆرە بووك‌و زاوا ڕۆیشتن. میوانەکان مانەوە بۆ ئەوەی تەنیاییم بڕەوێننەوە، ئینجا ئەوانیش یەك لە دوای یەك ڕۆیشتن. دوا کەس (جۆرج بووین) بوو کە حەزی کرد بمێنێتەوە لە ئیشەکان یارمەتی خانمی (مات) بدا. کە ویستی بڕوا، ماچێکی لە گۆنام کردو گوتی:

– خوداحافیز!

– خوداحافیز، (جۆرج)ی ئازیز!

ئینجا گوتی:

– حەز دەکەم یەکتر ببینین.

– هەوڵ دەدەم.

ئەوسا لە پڕو بێ هیچ پێشەکییەك گوتی:

– مادەم بووی بە دایکی (ماری)، ڕێ دەدەی منیش پێت بڵێم دایکە!

– بەوپەڕی شادی!

– تەنیا ئەگەر لەوە بچووکتر بی کە دایکی سێ کەسی گەورە بیت.

– قسەی پووچ!

پێکەنی‌و خۆی هەڵدایە ناو ترومبێلەکەی. پێی پێوەناو تۆزو غوباری لە دوای خۆیەوە هەستاند.

کەس نەمایەوە تەنیا (بروس) نەبێ کە ئێوارەکەی لای من بردە سەر... لە (رینی)یەوە بە مردنی باوکی (رینی) زانی بوو.... ئینجا پێی گوتم چی کردووە.

– چۆن قسەی وا دەکەی؟

خۆزگەم دەخواست ئەوەی پێی گوتم، پێی نەگوتبام.

ئینجا پێی گوتم (رینی) پێی گوتووە باوکی لە چین مردووەو تازە ئێوە بە یەکجاری لێرە دەمێننەوەو ئەویش ناتوانێ شوێنی کارکردنی خۆی جێبێڵێ و بێ لێرە لەگەڵ تۆدا بژی..... (بروس)یش ڕای لەگەڵ ئەودا بووە چونکە پیاو کاری لە کوێ بێ، دەبێ بچێتە ئەوێ. ئینجا گوتی (رینی) بە ئاشکراو بێ پێچ و پەنای پێی گوتم:

– تۆ کارت لێرەیە، دەبێ ببێ بە برادەری دایکم.

گوایە ئەویش وەڵامی داوەتەوە، گوتوویەتی:

– منیش ئەوەم دەوێ. ئەگەر ئەو ڕازی بێ ئامادەم لەوەیش زیاتر بم.

کە وای گوتی بە بیرم هاتەوە، (رینی) تەماشای دوڕ چاوی کردم و پێی گوتم:

– دایکە، زۆرم پێ خۆشە ئەگەر بۆ خۆت شوو بە (بروس) بکەی.

– ئاخ (رینی) نا...... نا........... نا داوای شتی وام لێ مەکە!

– داوای شتی وام لێ نەکردووی. هەر ئەوەندە بوو گوتم ئەگەر شتی وا ببێ من زۆرم پێ خۆشە!

هیچ لەسەر قسەکەی نەڕۆیشتم. ڕەنگە هەتاهەتایە هەر وا بم. نازانم... هێشتا کاتی نەهاتووە.... بەڵام بارودۆخەکە بۆ من هەر وا دەبێ.

هەرچۆنێ بێ، پێم خۆش بوو کە (بروس) لای من مایەوەو ئەو ئێوارەیەی لەگەڵ من بردە سەر. بە مەوە تەنیاییم نەختێ لەسەر سووك بوو کە بە ڕۆیشتنی میوانەکان لێی تووند کردبووم. من لەسەر لاتەختە درێژەکە ڕاکشابوومو ئەویش لە تەنیشتم دانیشتبوو پایپی دەکێشاو زۆر کەم قسەی دەکرد. ئەو کشو ماتییەم زۆر پێخۆش بوو. وەخت بوو باسی هەموو شتێکی (جیرالد)و باسی خانووەکەی (پەکین)مان و باسی هەموو بەسەرهاتەکانی خۆمی بۆ بکەم. لەگەڵ هۆنەی بای بەینی دارسنۆبەرەکانو لەبەر تیشکی دیمەنی چیاکان، کە ببوون بە تارماییو لەتاریکی شەودا دەدرەوشانەوە، بیرم لەم هەموو شتانە کردەوە. ئینجا بیرم لە (رینی) کردەوە، چۆن چووە دەرەوە بۆ ناوئەو دونیایە... بە خەیاڵ، چوومە لای (مای - لان) کە لەوانەیە ئێستاو دەق ئەمڕۆ، بووبێ بە دایك بەڵام کە ئەو هەموو شتانەم بیر کەوتەوە، بڕیارم دا بێدەنگ بم. بێ دەنگی هەمیشە لە قسەکردن باشترە. کە (بروس) هەستا بۆ ئەوەی ماڵاواییم لێ بکا، ژیانو ئەشقو ئەوینم نهێنییەك بوو لە دڵمداو لە سنگی خۆم شاردبوومەوە.

- سوپاس، (بروس) گیان... لێرە بە دواوە تۆ باشترین برادەری منی.

دەستی گرتم.... ماوەیەك هەر گرتیو بەری نەدا.

- با وا بێ.... بەڵام تا ماوەیەکی زۆر، بەمە لێت ڕازی نابم.

ئینجا دەستی بڵند کردمو لەسەر ڕووی خۆی دانا. هەستم کرد پێستەیەکی نەرمو ساردی هەیە. ئەمەم لێ بە ناپەسند نەگرت. بە لامەوە سەیر بوو کە بەمەوە تەنگاو نەبووم. لەوەندە زیاتری نەگوت. ملی ڕێی خۆی گرتو ڕۆیشت. ئەوسا هەستم کرد زۆر کەشەنگم.... چوومە سەرەوە بۆ ژووری نووستنی خۆم.

## (٤٠)

چەرخی زەمانە سوورا. ڕۆژ هاتو ڕۆژ چوو. ئەوەتا ئێستا چاوەڕێی هاتنەوەی (رینی) و (ماری) دەکەم بۆ بەسەر بردنی پشووی هاوین. لەو ماوەیەدا، نامەیەکی ترم لە (پەکین)ەوە، لە (مای – لان)ەوە بۆ هات:

((بە ئەرکی خۆمی دەزانم ئاگادارت بکەمەوە کە کوڕێکم لە (جیرالد) بووە. زۆر بەو دەچێ. پێستەی سپییە، قژی ڕەشو جوانە، تۆکمەو خەپەتۆلەیە! دایکم دەڵێ کەڵەگەت دەردەچێ. زۆر بەختەوەرم کە منداڵێکی وام هەیە. منو دایکم، ژیانی خۆمان تەرخان دەکەین، بۆ ئەوەی بۆ خاتری باوکیو بۆ خاتری تۆ، زۆر بە چاکی پەروەردەی بکەینو پێی بگەیەنین.....))

بۆ خاتری من؟ کوڕی وێ چ پەیوەندی بە منەوە هەیە؟ من چ هەقێکم بە سەرەوە هەیە؟ نەمتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە سەیرە بدەمەوە، ئینجا لە پڕ بیرم کەوتەوە، ئەم منداڵە زڕ برای (ڕینی)یە. بۆی

هەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان، لەگەڵ (رینی) یەکتر ببینن. ئایا چەند پێك دەچن؟و ئایا چەند لێك جیاوازن؟

شێوازو سروشتی ژیان زۆر قووڵو نامۆیە، ناتوانین تێی بگەینو پەی بە کرۆکی ببەین. لە گەرمەی شەڕو ئۆغرمی گراندا، لەناو ڕقو قینی تەوژمی شەڕدا، خۆشەویستی ئیشی خۆی دەکاو هەموومان بە بەندیواریی خوێن بە یەکەوە دەبەستێتەوە. چ نکووڵی بکەینو چ دانی پێدا بنێین، ئەو ئیشی خۆی دەکاو لە کاری خۆی بەردەوام دەبێ.

* * *

# (٤١)

(بابا)، ئەم هەموو شتە لە تۆوە دەستی پێکرد.... خۆت باش دەزانی..... دەزانی کاتێ لە خۆشەویستی ئەو کچە ئەمریکییە شکستت خواردو کچەکە ڕازی نەبوو لەگەڵت بێتە (پەکین)، گاڵتەت بە خۆشەویستی کردو دانت پێدا نەنا، چووی ژنێکت هێنا خۆشت نەدەویست، بەڵام ئەو تۆی خۆش دەویست‌و کوڕێکی لە تۆ بوو. من لە ژیانی خۆمدا لەو کوڕەی تۆ ڕاست هاتم‌و ئەشقی بووم، ئەشقێکی نزیك لە پەرستن. لەگەڵ ئەو کوڕەتا چوومە (پەکین)و وڵاتی کوڕەکەتم کرد بە وڵاتی خۆم! بەڵام وڵاتەکەی بە دەری نام‌و بە تەنیا گەڕامەوە نیشتمانی خۆم. ڕۆژگار لە خۆشەویستەکەمی دابڕاندم کە هەتا هەتایە خۆشم دەوێ.....

تۆیش ئەوەتا دوو نەوەت لێ وەپاش کەوتووە. هەر یەکە لە نیوە گۆیەکی زەوی تەواو جیاواز لە نیوە گۆکەی تری زەوی دەژی. هەردووکیان نەوەی تۆن‌و هەردووکیان لە پشتی تۆ بووین. لەبەرئەوەی

هەردووکیان نەوەی تۆن، ئەوانیش برای یەکترن‌و ڕۆڵەی دێ هەردووکیان بەم ڕاستییە دەزانن.

(بابا)، لەم بارەیەوە چ دەڵێی؟ لەم بارەیەوە چ دەڵێی باپیری بەساڵاچوو؟ تۆ، کە بە تەنیا لە قەدپاڵی چیاو لە ژێر ئەو دار سنۆبەرە گەورەیە ڕاکشاوی؟

* * *

تەواو

بەحرکە

٢٠١٢/١٠/٨